# کورد و

# ناوچە کوردنشینەکان

## لە کتێبی (معجم البلدان) ی یاقوت حەمەوی



تالا محمد دەشتی

التفسیر

# کوردو ناوچە کورد نشینەکان
# لە کتێبی (معجم البلدان) ی
# یاقوت حەمەوی

تـــارا مـحـــمد دەشـتی



# کوردو ناوچە کورد نشینەکان
# لە کتێبی (معجم البلدان) ی یاقوت حەمەوی


| | |
|---|---|
| نوسینـــــــــــی | تارا محمد دەشتی |
| بلاوکردنـــــــەوەی | نوسینگەی تەفسیر بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر |
| خـــــــــە ت | نەوزاد کۆیی |
| نەخشەســـــــازی | أمین مخلص |
| نــۆرە و ســاڵی چــاپ: | یەکەم ١٤٣٦ك - ٢٠١٥ز |
| تـــــــیراژ: | ١٥٠٠ دانە |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی (٣٣٤) ساڵی ٢٠١٤ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر تونێلی شیرین پالاس
Mob: +964 750 460 51 22
Tel: +964 750 818 08 66
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com

# نـــــاوەرۆك

# پێشەکی

پەرەسەندنی ڕەوتی زانستی لە هەر بوارێکدا پەیوەستە بە ڕۆلی ئەو کارەکتەرانەی کە ئیشیان لەناو کردووە، واتە زانست لەبەرەو پێشەوە چوونیدا، بە بەرهەم و هەوڵدانی زاناکان و کاری بەردەوامیان لەم بوارەدا بەندە، هەڵبەت مێژوو یەکێکە لەو زانستە گرنگانەی کە کار لەناو ڕابردوو دەکات و هەوڵی ساغ کردنەوەی ئەو ڕابردووە دەدات، بەشێوەی هەڵکۆڵینێکی زانستیانە، هەروەها زانستێکە پشت بە ئارکۆلۆژیای مەعریفە دەبەستێ بۆ ئەوەی تەواوی ڕابردووەکان بەهەموو گرفت و کارەساتەکان بخاتە بەردەستی خوێنەر، هەربۆیەش ئەمڕۆکە بۆتە پێداویستیەکی سەرەکی بناغەی زۆر لە زانستەکانی تر لە بواری گۆڕینەوە یاخود سود لە یەك وەرگرتن.

ئەوەی یارمەتی دەدات و پشتگیریی دەکات، لەبەیەك گرێدانی سەردەمەکان و بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی، ئەو بەرهەم و نوسراوانەیە کە ڕۆچوونەتە ناو زەمینەی مێژوو کار لەناو کایەکانی ڕابردوو دەکەن، یەکێ لەو بەرهەمانەی کە من کردوومە بەباسی سەرەکی نامەکەم و هەندێ لایەنی مێژوویی و مۆرك و ڕەسەنایەتی کورد پیشان دەدات، کتێبی (معجم البلدان)ی گەریدەو وڵاتناسی یاقوت حەمویە، کە بەشێوەیەکی بەربڵاو و فراوان مێژووی شار و وڵاتانی چەند نەتەوەیەك پیشان دەدات، کوردیش یەکێکە لەو نەتەوانەی خاوەنی شارو ناوچەی تایبەت بەخۆیەتی . زانیاریەکانی، لەو گەڕان و گەشتانەی کەخاوەنی بەرهەم پێی هەڵساوە سەرچاوەی گرتووە، جگە لەکۆکردنەوەو سود وەرگرتن لەزانیاری سەرچاوەی جۆراو جۆری هەموو ئەمانە وەکو کۆلەگەیەکی پڕ

لەزانستی کردۆتە بەرهەمێکی بەنرخ و لێکۆلە رەوەکان و مێژوونووسان تاوەکو ئیستاش پشتیان پێ بەستووە.

ئەو لێتوێژینەوەی کەوا لەم نامەیە دا کاری تێداکراوە لەبارەی ناوەرۆکی ئەم بەرهەمەیە، پێویستی بەئاشکرا کردنی کۆمەڵێك لایەن هەیە بۆ بەدەرخستنی بەهرەی یاقوت لەنوسینی کتێبی (معجم البلدان) وتێڕامان و شیکردنەوەیان بۆ دەکەین، بەتایبەتی لەباسی ئەو ناوچانەی دەچنە قالبی لێکۆڵینەوەی مێژووی کورد و ناوچە کوردنشینەکان، ئەگەرچی زانیاریەکانی ئەم کتێبە لە جێگای لابەلاو نامەی ماستەرو دکتۆرا و لێکۆلینەوەکان سودی لێوەرگیراوە، بەلاّم هەریەکە لەچوارچێوەی بابەتی خۆیەوە تێروانینی بۆکردووە و بەکاری هێناوە.

لێرەدا ئامانجی من لەباسەکە شیکردنەوەی ئەم بەرهەمەیەو بەراوردکردنی لەگەڵ کەرەستەی زانستی جۆراو جۆری تر، کە هەندێ جار وەکو ڕەخنەیەك لەم بەرهەمە دەکەوێتە بەرچاو، ئەمەش نەك بۆکەمکردنەوەی بەهاکەی، بەڵکو بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە کتێبەکە، هەروەها کار لەسەر ڕۆلی پاکنووسکردنەوەی یاقوت دەکەین، کەلەکاتی وەرگرتنی زانیاری سەرچاوەکانی پێش خۆی چۆن بووەو بەراوردکردنی لەگەڵ بەرهەمەکانی هاوچەرخی خۆی، کە پەیوەستن بە مێژووی کوردو کوردستان.وە دەرگا والاّدەکەین بۆ ئەو توێژەرانەی کە بەتەنها لەیەك بوار ی بۆ نمونە ئابووری یاخود کۆمەلایەتی وزانستی ئەم کتێبە لێتوێژینەوەی لەسەر بکات، چونکە لێرەدا زانیاری ئەم کتێبەم بەشێوەیەکی گشتگیری وەرگرتووە.

وەك ئاشکراشە لەکاتی لێتوێژینەوە لەهەر بوارو بارێکدا لێکۆلەر تووشی ئاستەنگ و گرفت دەبی، یەکێك لەو گرفتانەی لەم توێژینەوە دا ڕووبەڕوومان بووەتەوە ئەوەیە کەخاوەن بەرهەم ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوەی بەکار هێناوە، هەڵبەتە بۆ ئەم توێژینەوەیەش پێویستیمان بەهەمان سەرچاوە دەبێت بۆ سەلماندنی ڕاستیی زانستی کتێبەکە، کەچی هەموویان بەردەست نەکەوتوون، یاخود کاتێ ویستمان ئەو سەرچاوانەی کە لە دوای چەرخی یاقوت نوسراون بۆ بەراوردکردن بەکاربهێنین، نەمانتوانیوە لە هەندێ باسدا بیانخەینەڕوو، لەبەر ئەوەی لەخودی ئەو سەرچاوانە بەرهەمەکەی یاقوت واتە

(معجم البلدان) یان کردۆتە هەوێن بۆ نوسین. وەیەکێك لەو ئاستەنگە هەرە گرینگانەی کەروو بەروومان بۆتەوە، سنوری ناوچە کوردنشینەکان بە نادیاری ماوەتـەوە، تەنانـەت هەندێ ناوچە هەن بیروبۆچونی جیاواز هەیە لەمەر کوردیەتی شـوێنەکان.جگە لەمـەش یاقوتیش تەنها لەهەندێ ناوچەی دیاری کراو، شوێنی کوردی بەدیار خستووە، بەجۆرێك لەپاشکۆی ئەم لێکۆلینەوە دەبینرێت.

وە بۆ ئەوەی بتوانین بەتەواوی بچـینە بـنج وبنـەوانی هەربابـەتێك یـاخود ئامـانجی سەرەکی خۆمان لە هەر بابەتێکدا بپـێکین دەبـێ لەبـەرای هـەموو شـتێك میتـۆدێکی دیاریکراومان هەبێت، بۆیە لەم لێکۆلینەوەیە لەسەر هەمان ئەو میتۆدە رۆیشتوین، کە یاقوت لە نوسینی کتێبەکەی گرتوویەتیە بەر، ناوەرۆکەکەشی لە چوار بەش و دەرئەنجام پێك دێت .

بەشی یەکەم: باس لە(( ژیان وبەرهەمەکانی یاقوت و میتۆدی لە کتێبی (معجم البلدان)دا ))بە جۆرێك پێکدێت لە دوو تەوەر : یەکەمیان باس لـە نـاو و رەچـەڵەك و نازناوو شوێنی لە دایك بوون و چۆنیەتی پێگەیشتن و گەشتەکانی یاقوت دەکات، وە رۆڵی ناوبراو لە بواری بازرگانی و دواتر تیشك خراوەتەوە سەر دوا سەرنجی بۆ ژیان، هـەروەها بەکورتی باس لەو بەرهەمانە کراوە کە لەبەردەستدا بوون وناوی ئەو بەرهەمانەش هێنراوە کەبەردەسـت نەکـەوتوون. تـەوەری دووەم: ئاوردانەویـە لـە رێبـازو نوسـین و شـێواز و شیکردنەوەی کتێبەکە بەگشتی، کە چەند خاڵێك لە خۆ دەگرێت، وەك هۆکـاری دانـانی کتێبەکە و هەڵسەنگاندنی پێشەکیەکەی و شـێوەی دارشـتنی و میتـۆد لـە گێرانـەوەی بابەتەکان دا، بە جۆرێك توانای بـەهرەیی شـیکردنەوەی زمانـەوانی بۆنـاوی وشـەکان، بەدەرخستنی چۆنیەتی میتۆدی لـە باسـی بابـەتی جـوگرافی و مێـژووی و کـارگێری و ناوهێنانی زاناکان و لەگەڵ گێرانەوەی بابەتە ئەفسانەییەکانی کتێبەکە و ئەو سەرچاوانەی کە لە پێشەکیەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، لەگەڵ بەدیارخستنی کورتەیـەك لـە ژیـانی خاوەنی سەرچاوەکە، هەروەها باس لەبۆچوونی خۆی سەبارەت بەناوچەکان دەکەین وچۆن ئەو زانستە زارەکیانەی لەچین و توێژەکان وەرگرتووە، لەگەڵ ئەو بەرهەمانەی بۆ ناوچـە کورد و کوردنشینەکان سودی لێ وەرگیراوە .

بەشی دووەمیش تایبەتە بە کورد و ناوچەکوردنشینەکان بە چەشنێ : باس لە ((جوگرافیای هەرێمە کوردنشینەکان ))کراوە، کە لە چوار تەوەر پێك هاتووە : یەکەمیان هەڵکەوتنی شوێنی کورد لە حەوت هەرێمە ئاوەدانەکەی زەویە دەستنیشانکراوەکان، کە لە هەرێمی چوارەم و بەشێك لە هەرێمی پێنجەم دایە . تەوەری دووەم لە دەروازەیەك کە گرنگترین هەرێمە کوردنشینەکان خراونەتەڕوو، لەباسی دەروازەکەشدا ئاماژە بەوەکراوە کە چۆن ئەو هەرێمانە بەگرنگترین هەرێمە کوردنشینەکان دادەنرێن، پاشان باسی هەریەك لە هەرێمەکان بە جیا جیا کراوە، بەتایبەتی لە ڕوانگەی یاقوتەوە، کە بە شیکردنەوەی ناوەکەی دەست پێدەکات، لەگەڵ دیاریکردنی جوگرافیاو چۆنیەتی دانانی سنوور بۆ ئەم ناوچانە، بە پشت بەستن بە ئەو زانیاریانەی لەسەرچاوەکاندا هاتوون، بۆ پڕکردنەوەی تێبینەکانی ناوبراو. تەوەری سێیەمیش تایبەتە بە شوێنی کورد لە هەندێ وڵات و هەرێمی تردا، وەکو فارس و خۆراسان و کرمان و وڵاتی شام و میسر بەوشێوەیەی کە خاوەنی بەرهەم باسیان لێوەدەکات. تەوەری چوارەمیش باس لە سروشتی جوگرافیای ناوچە کورد و کوردنشینەکان دەکات، هەر لە بەرزی و نزمی زەوی و چیاکان بێت یان پێکهاتەی تر وەکو ڕووبار و سەرچاوە ئاویەکان سەرژمێری کراوە، هەر لەم تەوەرەیەدا ئاماژە بە ئاوو هەوای ناوچە کوردنشینەکان و سەرچاوە ئابووریەکان کراوە.

لە بەشی سێیەمدا (( شارو ئاوایی ووواڵەتە تەلارسازیەکانی ناوچە کوردنشینەکان لەکتێبی(معجم البلدان) دا)) تیشك خراوەتە سەر، بەجۆرێك لە دوو تەوەر پێکدێت : یەکەمیان باس لە شارە کوردنشینەکان ودەوروبەرەکانی دەکات، پشت بەو کارنامە ماستەر و دکتۆرایانە بەستراوە، کە سنوری شارە کوردنشیەنەکانیان دیاری کردووە، لەبەر ئەوەی یاقوت زۆر شاری بەکوردی دانەناوە، ئەمەش لەپاشکۆی لێکۆلینەوەکە بەدیار دەکەوێت، بەتایبەتی لە هێلکاری نەخشەکان .بەڵام سەبارەت بە دەوروبەرەکانی کە مەبەست لەو ناوچەو دێ و ئاوایی کورەو ڕوستاق و ناوەندانەیە، یە کە ڕاستەوخۆ دەکەونە چ شارێك ئەمەش لە خشتەیەك ڕوون دەبێتەوە. تەوەرەی دووەمی باس لە پێکهاتەی ئەو

شارو ناوچانە کراوە، بەجۆرێك سیماکانی تەلارسازی، کە قەلاّ و قوڵغ و شورەو کاروانسەراکان و مزگەوت پیشان دەدەن.

بەشی چوارەم : ((باری کۆمەلاّیەتی و زانستی و رامیاری ناوچەکوردنشینەکان)) روون کراوەتەوە لە سێ تەوەردا بەرجەستەی کراوە: یەکەمیان تایبەتە بە باری کۆمەلاّیەتی کۆمەڵگاکە، ئەمیش هۆزو تیرە کوردیەکان لە خۆ دەگرێت، کە چۆن ناویان هاتووە، هەروەها باس لە بیرو باوەر وئاینەکانی ناوچەکانی ئەم نەتەوەیە کراوە . تەوەری دووەمیش لەبارەی کولتوری و رۆشنبیری ناوچەکانە، لە بەدیارخستنی ئەو زاناو خاوەن بەرهەمانەیە کە لە بواری چالاکی زانستیەوە کاریان کردووە و بنەچەیان گەرِاندراوەتەوە سەرناوچە کوردنشینەکان، بەلاّم لەبەر زۆری ژمارەیان لە هەر هەرێمێك چەند نمونەیەك خراونەتە بەرچاو. لەتەوەری سێیەم دا بارودۆخی سیاسی ناوچەکە روون دەبێتەوە، ئەمیش لە چۆنیەتی بەرێوەچوونی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لە هەرێمە کوردنشینەکان و بە جۆرێك لە چ سەردەمێك و کێ پێ ی هەڵساوەو سەرکردایەتی کردووە، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی لەکاتی فتوحات دا هاتۆتە کایەوە، هەروەها هەندێ لە میرو سەرکردەو دەسەلاّتی کوردی کە لە کتێبی (معجم البلدان)دا ناویان هاتووە، وە لە سەرچاوەکانی تر رۆڵی بەرچاویان بەدیارخراوە، ئینجا ئایا بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکان لەسەردەمی یاقوت چۆن بووە ؟ کاتێ ئەتابەك و خوارزمیەکان و تەتەرەکان حوکمیان تێدا گێرِاوە.

## هەڵسەنگاندنی سەرچاوە (سەرەکیەکان):-

بۆ ئامادەکردنی ئەم لێکۆلینەوەیە، کتێبی( معجم البلدان ) بەشێوەکی دیار و بەرهەمێکی سەرەکی دادەنرێت، ئەگەرچی هەندێك لەسەرچاوەی تر بەرچاو دەکەوێت، بەلاّم بۆ مەبەستی پرکردنەوەی زانیاری یاخود، بەراوردکردن یان جیاوازی پێکردنی ئەم فەرهەنگە لە بارەی کورد وناوچە کوردنشینەکان بووە.

١- سەرچاوەی گەریدەو ولاّتناسان:

گرنگترین سەرچاوەی رِەسەن لەم توێژینەوەیەدا کە بەر لە چاخی یاقوت نوسراون وناوبراو بەکاری هێناون ئێمەش دووبارە پشتمان پێبەستووە، لە بەشی یەکەمیشدا

کورتە ژیانی ئـەم خـاوەن بەرهەمانـەمان تیشـك خسـتۆتە سـەر، لەوانـە (ابـن خرداذبە)(م:٢٨٠ك/٨٩٣ز) کتێبەکەی بەناوی (المسالك والممالك)ە کە لەئـەنجامی شـارەزایی کەسـایەتی وتاقیکردنـەوە وجێبـەجێکردنی پێداویسـتیەکانی پلـەی بەرێوەبردنی کـارگێری دەولـەت لەلایـەن خـودی خـۆی بەرهـەم هـاتووە، بـاس لەدەسەلات وفەرمانرەوایەکانیورێگاو بان وجگە لەباسی پێوانی نێوان ناوچەکان وسەرسورهێنەری وولاتان، بەلاّم لەم لێکۆلینەوەیە بۆچۆنیەتی باسکردنی نشینگە کوردیەکان لەولاتی فارس سودی لێوەرگیراوە.وە کتێبی (البلدان) ی (الیعقوبی)(م: ٢٩٢ك/٩٠٥ز) ئەمیش یەکێکە لەو بەرهە مە ولاتناسیانەی کـەباس لەزانسـتی هەوالی ولاتان وپێوانی نێوان ناوچەکان وداب ونەریت وئاین وپێکهاتەی نەتـەوەی ناوچەکانە، لەم لێکۆلینەوەیە بۆ روونکردنەوەی بابەتەکان بەتایبەتی شوێنی کورد لەهــــــەرێمی چــــــیاکان بــــــەکار هاتووە.وەکتێبەکــــــەی (الـبلاذری)(م:٢٩٧ك/٨٩٢)بـەناوی(فتوح البلـدان) کـەزانیاری تێـرو تەسـەلی سەبارەت بە فتوحات بۆ ناوچە کوردییەکان ئاماژەی پێراوەو یاقوتیش دووبـارەی کردۆتەوە، جا لەم لێکۆلینەوەیە زانیاری خستنە سەر تێبینیەکانی یاقوت سودی لێوەرگیراوە. بەلاّم بۆ زانستی کتێبەکەی یاقوت وراستی گواستنەوەی زانیاریەکان بەرهەمەکەی (ابن الفقیە الهمذانی)(م: ٣١٠ك/٩٢٢) بەناوی (البلدان) بەکارهێناوە زیاتر بەرچاوە، بەگشتی زانیاری ناوەرۆکی ئەم بەرهەمە باس لە دروسـت بـوونی زەوی ووتەی زاناکان دەربـارەی سەرسـورهێنەرەکان لەگـەلّ تیشکخسـتنە سـەر بەناوبانگەکان تایبەت مەندی ناوچەو بڕی خەراج ....هتد و هەروەها کتێبەکـەی (الاصـطخری)(م:٣٤٠ك/٩٥١ز) بـۆ هـەمان مەبەسـتی بـەراورد کـردن لـەم لێکۆلینەوەیە بەکار هاتووە. کتێبەکەشی لە ئەنجامی گەشـت وگـەڕان سەرچـاوە گرتووە، بەناوی (المسالك والممالك) بەجۆرێك باس لەزانستی ولاتناسی وبەگشـتی دەکات .وەکتێبی گەریدەو بازرگان (ابن حوقل)(م: ٣٦٧ك/٩٧٨ز) ش کە لەسـەر هێوازی بەهەرێمکردنی ولاتان و بنچینەی نەخشە کێشانی ئەو هەرێمانە پەیوەست بوون بە بەبەلگەی بینین دارێژراوە بەناوی (صـورة الارض) لـەم لێکۆلینەوەیـەش

دەبینرێت بۆ روونكردنەوەی زانیاریەكانی كتێبی (معجم البلدان) جگە لەمەش بەرهەمی (المهلبی)(م:٣٨٠ك/٩٩٠ز) بەناوی(العزیزی)لەپەراوێزی ئەم لیكۆلینەوە بۆ پێناسەی هەندێ لەوولاتان سودی لێوەرگیراوە .جگە لەمە هەندێ لە بەرهەمی ولاتناسانی تر كە لە دوای یاقوت حەمەویەوە نوسراوین وەك (القزوینی )(م:٦٨٢ك/١٢٨٤ز) هەردوو سەرچاوەكەی بەتایبەتی (اثار البلاد و اخبار العباد)، (ابو الفداء) (م: ٧٣٢ك/١٣٣١ز ) بەرهەمەكەی (تقویم البلدان) لەگەل سەرچاوە ولاتناسی فارسی(حمد الله المستوفی القزوینی) (م : ٧٥٠ك/١٣٤٩ز ) بەناوی(نزهة القلوب) وەكتێبی (اوضح المسالك الی معرفة البلدان و الممالك)ی سباهی زادە(م: ٩٩٧ك/١٥٨٩ز).

٢-سەرچاوە مێژوویەكان:

وە لە گرینگترین سەرچاوە مێژوویەكان كتێبەكانی(ابن الاثیر) (م:٦٣٠ ك/١٢٢٢ز) بەتایبەتی (الكامل فی التاریخ) سودی لێوەرگیراوە كە ڕەنگدانەوەی مێژووی گەلی كوردی لێبەدی دەكرێت، جگە لەوەی هاوسەردەمی یاقوتەو هاورێشی بووە، هەردوو بەكاری نووسینەوە خەریك بووینە. هەروەها بەرهەمەكانی (ابن العبری) (م:٦٨٥ك١٢٨٦ز)بەتایبەتی (تاریخ الزمان) كە بۆ زانیاری ناوچە كوردنشینەكان لەسەردەمی ئەتابەكیەكان سوودی لێ وەرگیراوە.

٣- سەرچاوە (الطبقات والتراجم):

بەلاّم ژمارەیەكی زۆر لەكتێبەكانی (طبقات التراجم) بەرچاو دەكەوێت، بەتایبەتی بۆ تیشك خستنەسەر ژیانی یاقوت بەدیار خستنی بایوگرافیای ئەو كەسە، و لەگەلّ ئەو كەسایەتیانەی كەناوبراو سودی لەبەرهەمەكانیان وەرگرتووە، بەلاّم هەمدیسان بۆ زاناو ئەدیبی شارە كوردنشینەكان دووبارە دەبێتەوە. گرینگترینیان بەرهەمی(ابن الندیم )(م:٣٨٣ ك /٩٩٣ ز) بەرهەمەكەی (الفهرست) هەروەها كتێبی(انباه الرواة)ی (ابن القفطی)(م:٦٤٦/١٢٤٦ز)، بەسەرچاوەیەكی هەرە گرینگ دادەنرێت بۆ ژیان وبەسەر هاتی كەسایتی یاقوت، ، لەگەلّ ابن الشعار الموصلی (م:٦٥٤ك/١٢٥٦ز)، كتێبەكەی (عقود الجمان في فرائد الشعراء هذا

الزمــان)، و(ابــن خلكــان)(م:٦٨١ك/١٢٨٢ز) (وفيــات الاعيــان). بەگشــتی بەرهەمەکانی (الذهبي)(م:٧٤٨ك/١٣٤٧ز) بەلاّم بەتایبـەتی (تـاريخ الاسـلام)، وەکتێبی (الوافي بالوفيات) (الصفدي) (م:٧٦٤ك/١٣٦٣ز) .

لەگەڵ ئەوەشـدا فەرهەنگـە ئەدەبیەکـەی خـودی یـاقوت کـە( معجم الادبـاء) بەرادەیەکی زۆر بەرچاو دیارە لەم لێکۆڵینەوەیەو ڕاستی زانیاریەکەی فەرهەنگـە جوگرافیەکەی دەسەلمێنێ.

٤- سەرچاوە نوێیەکان:

کتێبە نوێیــەکانیش بێبـەش نـەبوون لـە دەوڵەمەنـدنکردنی ئـەم توێژینەوەیـە، بەتایبــەتی ئــەو بەرهەمانــەی گەیشــتونەتە دەرئــەنجامی هەنــدێ بابــەت وەکوبەرهەمەکانی (ابو الفتوح محمد التوانسي) (ياقوت الحموي الجغرافي والرحالـة الاديـب)، (کراتشکۆفسـکی) (تـاريخ الادب الجغـرافي العربـي) ئەمانــە زيــاتربۆ زانیاریەکانی بەشی یەکەم بەکارهێنراون، بەلاّم بۆ بەشەکانی تر ئەوەی کتێبەکانی بەرادەکی زۆر دووبارە دەبێتەوە (درويش يوسف حسن ) (بلاد الهكاري)، هەروەها (الكورد في كتابات ابن الاثير)ی(كرفان محمد احمـد )، وەگـرنگترین ماسـتەرنامەو دکتۆرا کە سودی لێ وەرگیراوە لەم لێکۆلینەوەیە (الكورد في الدينور وشـهرزور)، (أذربيجان )ی (حسام الدين علي غالب النقشبندي)، (الكورد في الجزيرة و شهرزور) ی (فائزة محمد عزت)ن.

توێژەر

تارا محمد دەشتی

# هێماكان

أ- هێما عه‌ره‌بییه‌كان
ب- توفی
ج- جزء
مج- مجلد
م- الميلادی
ه- الهجری
د.ت- دون تاريخ الطبع
د.م- دون مكان الطبع
ص- صفحه
ص ص- صفحات
ق- القسم

ت- هێما كوردیه‌كان :
ز- زاینی
ك- كۆچی
ل- لاپه‌ره
ل ل- لاپه‌ره‌كان
م- مردووه
پ.ز- پێش زاین
ج- هێما فارسیه‌كان:
ه.ش- هجری شمسی
ص- صفحه

د- هێما ئینگلیزیه‌كان
لاپه‌ره- p-pages
به‌ش- vol-volume

# به‌شی یه‌که‌م

# ژیان وبه‌رهه‌مه‌کانی یاقوت ومیتۆدی

# له‌کتێبی (معجم البلدان) دا

**ته‌وه‌ری یه‌که‌م:**

**ڕه‌وتی ژیان و به‌رهه‌مه‌کانی**

**(بنه‌چه و ره‌چه‌ڵه‌کی، له دایك بوون و پێگه‌یشتنی، سه‌رچاوه‌ی بیری زانستی حه‌مه‌وی، کۆچی دوای کردنی، به‌رهه‌مه‌کانی....)**

**ته‌وه‌ری دووه‌م:**

**ڕێبازی نووسین و شێواز و شیکردنه‌وه له کتێبی (معجم البلدان)دا**

**(هۆکاره‌کانی نووسینی کتێبه‌که، هه‌ڵسه‌نگاندنی زانستی پێشه‌کیه‌که، شێواز له‌دارشتنی کتێبه‌که، شیکردنه‌وه‌ی ناوه‌رۆکی کتێبه‌که، سه‌رچاوه‌کانی کتێبی (معجم البلدان)...)**

# تەوەری یەکەم:

## ڕەوتی ژیان وبەرهەمەکانی:

### یەکەم: بنەچە و ڕەچەڵەکی:

ناوی (ابو عبدالله یاقوت بن عبدالله الرومی البغدادی) [١]. یاخود (یاقوت بن عبدالله الحموی الرومی) یە [٢] ئەگەرچی سەبارەت بە ناوەکەی وا بەدیار دەکەوێ کە گۆڕانی تێکەوتبێ، بەڵام بەگشتی بە ناوی یاقوت ناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڵگەیەکی چەسپاومان لەبەردەست دا نییە، کە یاقوت ناوی راستەقینەی خۆی بێت. چونکە کۆیلە و بەندەکانیش لەسەردەمانێ بەناوی بەردە بە نرخەکانی (یاقوت، کافور، زمرود) ناوبراون[٣]. ناوبراویش یەکێك بووە لەو کەسانەی بۆتە دیل و بە کۆیلە کراوە، کۆیلەش وەکو دەستکەوت سەیر دەکرا. (کافور ابو مسك)[٤]یش کە خاوەنەکەی سولتانی میسر

---

[١] - یاقوت الحموي، معجم الادباء، اعداد: احمد شمس الدين، (بيروت: ١٩٩٣)، ج١، ص ١١؛ ابن المستوفي الاربلي، نباهة البلد الخامل بمن ورده من الاماثل، المعروف ب(تاريخ اربل)، حققه و علق عليه: سامي بن سيد خماس الصقار (بغداد: ١٩٨٠)، ق١، ص ٣١٩ ؛ عمر رضا كحاله، معجم المؤلفين، (بيروت: ١٩٩٣)، ج٤، ص ٨٣ ؛ابو الفتوح محمد التوانسى، الجغرافي الرحاله الاديب ياقوت الحموي، (مصر: ١٩٧١)، ص ٦٠.

[٢] - ابن القفطي، انباه الرواة علي انباه النحاة، حققه: فاضل ابراهيم، (بيروت: ٢٠٠٤)، ج ٤، ص ٨٠.

[٣] - ياقوت الحموي، الخزل و الدال، حققه: يحي زكريا، محمد اديب، (دمشق: ١٩٨٨)، ق١، ص ٨ ؛ كراتشكوفسكي، تاريخ الادب الجغرافي العربي، نقله الى العربية، صلاح الدين عثمان هاشم، ق١، ص ٣٨٨؛ ابو الفتوح محمد التوانسى، المرجع السابق، ص ٦٢؛ نەبەز مەجید ئەمین، یاقوتی حەمەوی، (سلیمانی: ٢٠٠٢)، ل ٨.

[٤] - کافوری ئەبو مسك، رەش پێستێکی حەبەشی بوو سەرەتا لەلای خەڵکی میسر کۆیلە بوو، دواتر سوڵتانی میسر کرێوەتیەوە. الصفدي، الوافي بالوفيات، تحقيق : احمد الآرناؤوط، تركي مصطفى، (بيروت: ٢٠٠٠)، مج ٢٤، ص ٣٣١.

(ئەخشیدی)[1] بوو، ئەمیش هەر بەم سامانە ناوبراوە. ئەگەر چی دوای ئەوەی یاقوت پێگەیشتووە، ناوی لەخۆی ناوە (یعقوب) [2] ئەمیش لەکاتێکدا، کەئازاد بوو و کاری بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی کردووە، وە ڕەنگە ئەم ناوەی لەبەر ئەوە هەلبژاردبێت، لەناوەکەی خۆی نزیکە و، بەلاّم مانایەکی کۆیلەی نادات. لەگەل ئەمەشدا ناوەکۆنەکەی بەگشتی لەلای خەلك بەسەریدا چەسپاوە .

لە پالّ ناوی یاقوت لەکاتی ناساندنی، نازناوی تر بە دی دەکرێت، کە ژیان و بەسەرهاتی ئەو پیشان دەدەن. وەکو (حەمەوی) [3] بۆ خاوەنەکەی (عسکر بن نصر بن ابراهیم الحموی) دەگەڕێتەوە، خەریکی بازرگانی بووە و یاقوتی بەکۆیلە کڕیوەتەوە[4]. بەدیلی هێنراوەتە بەغدادو پاشان لەگەلّ یاقوت لە شاری بەغدا نیشتەجێ بووە، هەربۆیەش ناوبراو بە (بەغدادی)ش ناسراوە[5]. وەنازناوی (شەهابەدین)ی[6] کە پێوە لکاوە بۆ گەورەی وناوبانگی کەسایتی یاقوت دەگەڕێتەوە.

---

(١) - سولّتانی ئەخشیدی: یەکێکە لە سولّتانەکانی میسر ناوی (ابوبکر بن محمد طغج) بووە، کە خاوەنی میسر وشام و حیجاز بووە لە سالّی (٢٤٧ك/٨٦٢ز) مردووە. ابن خلكان، وفيات الاعيان و انباء ابناء الزمان، حققه: احسان عباس، (بيروت: د/ت)، مج٥، ص ٥٦.

(٢) - ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من الذهب، (بيروت: د/ت)، ج ٥، ص ١٢٢.

(٣) - حەمەوی: ئەم ناوە بۆ شاری حەما دەگەڕێتەوە، کە لە نێوان حەلەب و حمص لە ولاّتی شام. السمعاني، الانساب، تقديم: عبدالله عمر البارودي، (بيروت: ١٩٨٨)، ج ٢، ص ٢٦٧.

(٤) - ابن القفطي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٨٠؛. بڕوانە: ابن الشعار الموصلي، قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان: تحقيق: كامل سليمان الجبوري، (بيروت: ٢٠٠٥)، ج ٩، ص ١٩٧ ؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٧ ؛ الزركلي، الاعلام، (بيروت: ٢٠٠٤)، ج ٨، ص ١٣١.

(٥) — ياقوت الحموي، معجم الادباء، ج١، ص ١١ ؛ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق١، ص ٣١٩.

(٦) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٦؛ علي ادهم، بعض مؤرخي الاسلام، (القاهرة: ٢٠٠٣)، ص ١٢٦.

بەڵام وشەی (رۆمی)[1] رەچەڵەکی یاقوت پێ دیار دەکرێت، چونکە لە ولاتی رۆم (ئاسیای بچوك) لەدایك بووەو هەر لەوێشەوە بە دیل گیراوە و کراوەتە کۆیلە[2]. بەڵام لە رایەکی تردا هاتووە، رۆمی نەبووبێ، بەڵکو عەبدوڵڵای باوکی، لەولاتی رۆم دەستگیر کراوە، ماوەیەك لەوێ ماوەتەوە، هەر لەوێشەوە خێزانی پێك هێناوە، یاقوتیش لەو کاتە لەدایك بووە، پاشان لە شەڕێکی نێوان عەرەبە موسوڵمانەکان و رۆم بەدیل گیراوەو کەوتۆتە دەست عەرەبەکان و بە رۆمیان لە قەڵەم داوە، یاخود مامەڵەی رۆمیان لەگەڵ کردووە[3]. لەگەڵ ئەمەشدا گومان لە ڕاستیی ناوی باوکی یاقوت هەیە، کە (عەبدوڵڵا) بێت، چونکە لای عەرەب وا باو بووە کەسێکی نەناسراو بێت یان ناوی باوکی یا باپیری دیار نەبێت پێی دەڵێن (عەبدوڵلا یاخود ئەبوعەبدوڵلا)[4].

هەر سەبارەت بە بنەچەکەی، رۆژهەڵاتناس (جان. س. ریسلەر) لە کتێبی شارستانی عەرەبیدا دەڵێ:- (یاقوت کۆیلەیەکی یۆنانی بووە).[5] بەڵام(کمال الدین ابی البرکات) ناسراوبە (ابن الشعار الموصلی) (م:٦٥٤ ك/١٢٥٦ز) وەسفی دەکات و دەڵێت: ((یاقوتم لە شاری موسل بینیوە پیاوێکی رەنگ سووری چاوشینی پرچ زەرد بووە))[6]. هەروەها لەرایەکی تردا هاتووە، کەدایك وباوکی یۆنانی بوون.[7]، ئەمەش رەچەڵەکە گریکیەکەی دەسەلمێنێت.

---

[1] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج٤، ص ٨٠؛ اليافعي، مراة الجنان و عبرة اليقظان في المعرفة مايعتبر من الحوادث الزمان، وضحه: خليل منصور، (بيروت: ١٩٩٧)، ج ٤، ص ٤٨ ؛البغدادي، هدية العارفين، (بيروت: ١٩٩٥)، مج٢، ص ٥١٣.

[2] - ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ٦٠ ؛عمر فروخ، تاريخ الادب العربي، (بيروت: ١٩٨٠)، ج٣، ص ٤٩٠.

[3] - بروانە: راجي عنايت، ياقوت الحموي (العالم الجغرافي الاديب)، ( بيروت: ١٩٧٧)، ص ١٦ ؛ سليمان فياض، ياقوت الحموي (ابو الموسوعات الجغرافية)، (القاهرة: ١٩٩٩)، ص ص٤-٥.

[4] - ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٩ ؛ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ٦٢.

[5] - ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ٦١.

[6] - قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، ج٩، ص ١٩٨.

[7] - ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ٦٠.

## دووەم: لەدایکبوون و پێگەیشتنی:

**ئەدیب و زمانزان و شاعیری مێژوونووس، گەشتیاری جوگرافی وڵاتناس[١] یاقوت لە نێوان ساڵانی (٥٧٤-٥٧٥ك/١١٧٩-١١٨٠ز) هاتۆتە دونیاوە[٢]. سەرەتا بەدیلی هێنراوەتە بەغداو بازرگانێکی خەلکی شاری حەما، دانیشتوی شاری بەغدا کڕیویەتیەوە[٣]، وە دوای بەکۆیلە بوونی کاتێ پێگەیشتووە، بە کاری بازرگانی خەریك دەبێت، کە هاندەری سەرەکی بۆ ئەم کارە خاوەنەکەی بووە، ڕێگەی بۆ خۆش دەکات و بە بەڕێوەبەری کارە بازرگانییەکانی خۆی دایناوە، چونکە خۆی جگە لە بازرگانی، شارەزایی لە نووسین و زانستی تر نەبوو[٤]، هەربۆیەش پێویستی بە کەسێك دەبێت بۆ هەڵسووڕاننی کاروبارەکانی، بەمەش یاقوتی ناردۆتە بەر خوێندن و لەسەر کارە بازرگانییەکانی رایهێناوە [٥].**

**سەبارەت بە خوێندنی یاقوت، سەرەتا لەبارەی زانستی زمان و ڕێزمان ڕووەو خوێندن چووە، زانیاری لە زانایان وەرگرتووە[٦]. هەندێك لەو زانایانەی کە یاقوت بە مامۆستای خۆی داناون و زانیاری لێیانەوە فێر بووە، هەروەها ناویان لەبەرهەمەکانی بەرچاو دەکەوێت ئەمانەن:**

---

[١] - الذهبي، نزهة الفضلاء تهذيب سير اعلام النبلاء، اعداد: محمد موسى شريف، (بيروت: ٢٠٠٧)، ج ٣، ص ١٦٧٨ ؛ اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨.بڕوانە: كامل سلمان الجبوري، معجم الشعراء، (بيروت: ٢٠٠٣)، ج ٦، ص ١٢٠ ؛ بسام عبدالوهاب الجابي، معجم الاعلام، (د/م: ١٩٨٧)، ص ٩٣٤.

[٢] - حاجي خليفه، كشف الظنون عن اسامي الكتب و الفنون، (بيروت: ١٩٩١)، ج٦، ص ٣٩٩، البغدادي، المرجع السابق، مج ٢، ص ٥١٣.

[٣] - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص١٢٧.

[٤] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج٤، ص ٨١؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٧.

[٥] - معجم الادباء، ج ١، ص ١١؛ كراتشكوفسكي، المرجع السابق، ق١، ص ٣٣٨.

[٦] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨١؛ اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨؛ محمدامين الخانجي، منجم العمران في المستدرك على معجم البلدان، (مصر: ١٩٠٧)، ج١، ص ٥.

**١- ئەدیبی زمانەوان (عکبری)[١] بەمامۆستایەکی یاقوت دادەنرێت، لەبەر ئەوەی سەرەتای خوێندنی لای ئەو زانایە بووە، جگە لەوەش زانیاریەکانی لە فەرهەنگەکانی ناوبراودا ڕەنگ دەداتەوە [٢].**

**٢-(ابن یعیش)[٣] زانایەکی نەحوی بوو[٤]، بە مامۆستای خۆی بۆ بەرهەمەکانی دادەنێت[٥].**

**٣-(علي بن المرجي) [٦] یاقوت لە بەرهەمەکانی پێمان رادەگەیەنێت، کەوا لەسەر دەستی ئەم زانایە فێری زمانی عەرەبی و زانستی هۆنراوە زانی (عروض) بووە.)[٧]**

**٤-(ابن الدبیثي) [٨] ئەمەش خاوەنی ڕۆشەنبیری زانستی بووەو پایەیەکی بەرزو دیاری لای یاقوت هەبووە[١]. زانیاری لێوەرگرتووە بۆ کتێبی (معجم البلدان)[٢].**

---

[١] - عکبری: ناوی (ابو البقاء عبدالله ابن ابي عبدالله حسیني عکبري) لەشاری بەغدا سالّی (٥٣٨ك/١١٤٣ز) لەدایك بووە، لە (٦١٦ك/١٢١٩ز) کۆچی دوایی کردووە خاوەن بەرهەمی زۆر بووە. ابن خلکان، المصدر السابق، مج٣، ص ١٠٠؛ الداودي، طبقات المفسرین، تحقیق: علي عمر، (د/م: ١٩٧٢)، ج ١، ص ص ٢٢٤-٢٢٧.

[٢] - یاقوت الحموي، معجم البلدان، (بیروت: ٢٠٠٧)، مج ٣، ص ٣٠٠؛ مج ٤، ص ٤٨، ص ١٤٢ .

[٣] - ئیبن یەعیش ناوی (یعیش بن علي بن یعیشي بن محمد ابي سرایا بن یحي) لە حەلەب سالّی (٥٥٣ك/١١٥٧ز) لەدایك بووە لە (٦٤٣ك/١٢٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە، خاوەن بەرهەم بووە وەکو (شرح المفصل، شرح تصریف ابن جني). السیوطي، بغیة الوعاة، تحقیق: محمد ابي فضل ابراهیم، (بیروت: ١٩٧٩)، ج٢، ص ص ٣٥١-٣٥٢

[٤] - راجي عنایت، المرجع السابق، ص ١٧؛ کراتشکۆفسکي، المرجع السابق، ق١، ص ٣٣٨؛ نەبەز مەجیدئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١.

[٥] — بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٥٠٨.

[٦] —(علي بن المرجي): ناوی (سالم بن احمد بن سالم المرجي) ناسراو بە ڕێزمان زان و هۆنراوە زانی بەغدادی لە بەغدا سالّی (٦١٢ك/١٢٥١ز) کۆچی دوایی کردووە. معجم الادباء، ج ٣، ص ٣٥٧ .

[٧] - المصدر نفسه، ج٣، ص٣٥٩.

[٨] - (ابن الدبیثي): ناوی ( عبدالله محمد بن سعید بن یحی الواسگی) لە بەغدا سالی (٥٨٨ك/ ١١٤٤ز) لەدایك بووە، لە (٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) مردووە. ابن الشعار الموصلی، المصدر السابق، ج ١، ص ١٦٠ " ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٤، ص ص ٣٩٤- ٣٩٥.

٥-(عبدالعزیز بن المبارك الجنباذي) [٣]یەکێك بووە لە مامۆستا ناسراوەکانی یاقوت[٤].

سەرەڕای ئەوەی بەردەوام بووە لە خۆفێرکردنی زانست، هەندێ لە کاتەکانیشی بۆ جێبەجێکردنی کاروباری خاوەنەکەی تەرخان کردووە، هەروەها کاتێ ئەم شار و ئەو شاری دەکرد بۆ هەڵسەنگاندنی کارە بازرگانییەکانی، هەوڵی دەدا چاوی بە زانا و ئەدیبەکان بکەوێت، هەروەکو کاتێ سەردانی (دوورگەی کیش)[٥]، کردووە[٦]، ئامادەی کۆڕوکۆبوونەوەکانی خەڵکانی ئەم ناوچەیە بووە، جگە لەو بەرهەمە جۆراوجۆرانەی چاوی پێکەوتوون، وەکو (ما اتفق لفظە واختلف معناه) کە لە دوو بەرگ پێك هاتبوو[٧]. وە لە ڕێگەی بینین و خوێندنەوەی بەرهەمی جۆراوجۆر فێری زانیاری بووە[٨].

بەم شێوەیە یاقوت لە سەردەستی چەندین مامۆستای زانست پەروەر و شارەزا و هەروەها بەشداری کردنی کۆڕ وکۆبوونەوەکان، توانیویەتی خۆی پڕ زانیاری بکات و لە دواییدا بەرهەمەکانی پێ دەوڵەمەند بکات.

## سێیەم: سەرچاوەی بیری زانستی:

ڕوون و ئاشکرایە هەر تاکێك ئارەزوومەندی ئەوە بێت لە ڕیزی پێشەوەی زانست

---

[١] - معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٧١.

[٢] - المصدر نفسە، مج ١، ص ٢٦٤، ص ٣٣٢؛ مج ٤، ص ٣١.

[٣] - (عبدالعزیز بن المبارك الجنباذي) ناسراو بە (ابن الاخضر) لە بەغدا لە دایك بووە، لە ساڵی (٥٢٤ك/ ١١٢٩ز) لە ساڵی (٦١١ك/١٢١٤) مردووە. حاجي خلیفە، المصدر السابق، ج ٥، ص ٤٦٧.

[٤] - بۆنمونە بڕوانە : معجم ا لبلدان، مج ٢، ص١٦٥؛ مج ٣، ص ١٢٦؛ ص ٢٢٨، مج ٤، ص ٢٥١؛ مج ٥، ص ٤٣٦.

[٥] - دوورگەی کیش: ئەم دوورگەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی دەریای عومان.معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٨٧.

[٦] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨١.

[٧] - ر.م الهي، یاقوت الحموي البغدادي، ترجمە، یوسف حداد، مجلە المورد، (بغداد: ١٩٨٧)، مج ٧، عدد ١، ص ١٥.

[٨] - الذهبي، المصدر السابق، ج ٣، ص ١٦٨٧.

خوازەكان خۆی ببینێتەوە، ناوی خۆی تۆمـار بكـات لـە ڕیـزی هاوچـەرخانی زانسـتی سەردەمی خۆی، ئەوا پێویستی بە هیممەتی گەورە و ماندووبوونی زۆرەوە هەیە، تا بەو پلە و پایە بگات كە دەیەوێ، زانستی لێرەدا بەو مەبەستە نایەت كە یاقوت وەكوئەوەی لە قوتابخانە وەریگرتبێت، بەڵكو وەكو ئەزمونی ژیان وهەوڵـدان بـۆ بەدەسـت هێنـانی زانست، گەران وسوران بووە، ئەمەوجگە لە هەندێ هۆكاری دیكـە، كـە بوونەتـە هـۆی گەورەیی یاقوت و ناوبانگی، لە خوارەوە باسی دەكەین:

## ١- بازرگانی:

ئەو چالاكییە ئابوورییە، كە مرۆڤ هەر لە كۆنەوە ئەنجامی داوە و بەردەوامـە، (ابـن خلدون) لەبارەیەوە دەڵێت: ((بازرگانی هەوڵدانە بۆ بەدەست هێنان و بوژاندنەوەی سامان و دارایی لە رێگەی كڕین و فرۆشتنەوەی كەلوپەل بە نرخی جیاواز، كە لە كۆتاییدا ئـەم جیاوازییە دەبێتە قازانج)) [١].

یاقوت لەتەمەنێكی زووەوە كاری بازرگانی بۆ خاوەنەكەی ئەنجامداوە، لەبەر ئـەوەی یەكێك لە كارە سروشتیەكانی كۆیلە، بە جێگەیاندنی ئەو كاروبارەیە كـە خاوەنەكـەی پێیدەسپێرێت. گەشتە بازرگانییە سەرەتاكانی بۆ دوورگەی كیش وڵاتی شام بووە [٢].

بەڵام دوای ئەمە واتـا لـە سـاڵی (٥٩٦ك/ ١١٩٩ز) نـاكۆكی لـە نێـوان یـاقوت و خاوەنەكەی ڕوو دەدات [٣]. ئەوكاتیش تەمەنی بیست و یەك سـاڵ بـووە، بۆیـە لـەكاری

(١) - مقدمة، تحقيق: حامد احمد طاهر، (القاهرة: ٢٠٠٤)، ص ٤٧٧.

(٢) - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨١ ؛ ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج٩، ص ١٩٧ ؛ الذهبي، المصدر السابق، ج ٣، ص ١٦٨٧؛ نقولا زيادة، الجغرافيا و الرحلات عند العرب، (بيروت: ١٩٦٢) ص ٦١؛ علي ادهم، المرجع السابق، ص ١٢٥.

(٣) - الذهبي، تاريخ الاسلام و وفيات المشاهر الاعلام، تحقيق، عبدالسلام تدمري، (بيروت:١٩٩٨) ، ج ٤٥، ص ٦٦ ؛محمد محمود محمدين، التراث الجغرافي الاسلامي، (الرياض: ١٩٩٩)، ص ١٨١ ؛محمد مونس، الجغرافيون و الرحالة المسلمون في بلاد الشام، (د/م: ١٩٩٥)، ص ١٨٣.

**بازرگانی دەوەستێت و بەکاری لەبەرگرتنەوەی کتێب خەریك دەبێت[١]. بینینی ئەو کتێبانەی کە کاری تێدا کردوون، سوودی بەلایەنی زانستیی کەسایەتی یاقوت گەیاندووە.**

**دوای ئاشتبوونەوەی لەگەڵ خاوەنەکەی، دووبارە ناوبراو بەلای کاری بازرگانییەوە دەچێت، بەڵام لەکاتی گەڕانەوەی لە یەکێك لە گەشتە بازرگانییەکانی، خاوەنەکەی کۆچی دوای کردبوو، بۆیە ئەو دەسکەوتەی کە بەدەستی هێنابوو هەندێکی بەخشییە ماڵ و خێزانی خاوەنەکەی، بەشێکیش کاری بازرگانی کتێبی پێدەکرد[٢]، تاکو سوود لەو شارەزاییە بازرگانییەی کە هەیبوو وەربگرێت، پاشان سەردانی شاری (مەڕو)[٣] دەکات هەر لەوێ دەگیرسێتەوە، سوودی لە کتێبخانەکانی ئەم شارە کە بە (خزانە الکتب)ناودەبران، وەردەگرن[٤]. خواستنی کتێب لەو کتێبخانانە بەخۆڕایی بووە، بۆیە یاقوت تا رادەیەکی زۆر بایەخی لێوەرگرتووە وتەنانەت هەندێکی لەم کتێبانەی لاماونەتەوە[٥].**

**بەڵام کاتێ هێرشی تەتەر و مەغۆلەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی دەستیپێکرد[٦].**

---

(١) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٧؛ ربحي مصطفى، المكتبات في الحضارة الاسلامية، (عمان: ١٩٩١)، ص ٧٦ ؛خيرالله سعيد، و راقو بغداد في العصر العباسي، (رياض: ٢٠٠٠)، ص ٥١٠.

(٢) - معجم الادباء، ج ١، ص ١١ ؛ ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨١، باقر امين الورد، معجم العلماء العرب، راجعه: گورگيس عواد، (بغداد: ١٩٨٢)، ج ١، ص ٢٥٦.

(٣) - مەڕو: یەکێکە لە گەورەترین شارەکانی خوراسان. معجم البلدان، مج ٥، ص ص ١١٢- ١١٣.

(٤) - دوو لەم کتێبخانانە یەکێکیان بەناوی عەزیزیە و ئەوەی تریان کەمالییە بووە. معجم البدان، مج٥، ص ١١٤.

(٥) - زكي محمد حسين، الرحالة المسلمون في عصور الوسطي، (مصر، ١٩٤٥)، ص ١٠٥ ؛ محمد مؤنس، المرجع السابق، ص ٧٦.

(٦) - یەکەمین هێرشی مەغولەکان بۆ ئەو دیو رووبار (ماورا النهر) لە ساڵی( ٦١٥ك/ ١٢٨١ز) دەستی پێکردووە، پێش ڕۆیشتنیان بۆ کەنارەکانی رووباری جەیحون و پەڕینەوەیان گەیشتوونەتە شاری بوخارا و سەمەرقەند، لە رێگەی خوارەزمیشەوە گەیشتوونەتە شاری قەزوین و هەمەدان، خەڵکیان کوشتووەو مزگەوتەکانیان سووتاندووە. ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر و القاهرة، تحقيق: محمد حسين، (بيروت: ١٩٩٢)، ج ٥، ص ٢٢٥.

هێرشەکانیان گەیشتە شاری (مەرو) لەساڵی (٦١٦ك/ ١٢١٩ز) ناوبراو ئەم شارە جێدەهێڵێت وبە تەواوی ماڵ وحاڵی کتێبەکانیەوە[١]. لەگەشتێکی تری بازرگانی بۆ شاری حەلەب چاوی بە ئەبوعەلی قەیولی کەوتووە، کە کاربەدەستی وەزیر (ابن القفطي)[٢] بوو، کاری کڕینی کتێبی بۆ وەزیر دەکرد، چونکە وەزیر خولیای کتێب کۆکردنەوە بوو[٣]. بەڵام دەربارەی ئەو کتێبانەی یاقوت کە بۆ ئەم شارەی بردووە، (ابن القفطي) دەڵێت:(( تەنیا دوو لە کتێبەکانیم بەدڵ بووە))[٤] بەم جۆرە یاقوت لە ڕێگەی بازرگانییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ کتێب و کتێبخانەکان پەیدا کردووە، لەبەرهەمەکانیشی دا ڕەنگدانەوەی ئاشکرای لێ بەدی دەکرێت.

## ٢- گەشت وگوزار:

گەشت جۆرێکە لە بزاوت و جوڵەوگەڕا ن وسووران بەشوێنە جوگرافیە جیاجیاکان دا، تێکەڵاوبوونە لەگەڵ سروشت و خەڵك و نەتەوەکان، بەهاکەشی دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ پەیداکردنی ڕۆشنبیریی مرۆڤایەتی، کەبەهۆی ئەو ئاشنایەتییەی لە هەندێ لایەنی ژیانی خەڵك و کۆمەڵگایەکی دیاریکراو لەکاتی دیاریکراودا سەرهەڵدەدات[٥]. گەشت و گەشتکاریش لەلایەن یاقوتەوە لە کتێبی (معجم البلدان) دا باسکراوە، بەتایبەتی ناوبراو

---

(١) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ٢٧؛ كراتشكوفسكي، المرجع السابق، ق١، ص ٣٣٨؛ باقر امين الورد، المرجع السابق، ج ١، ص ٢٥٦.

(٢) - (ابن القفطي): ناوی (علي بن يوسف بن ابراهيم بن عبدالواحد بن موسى) ناسراو بە (قاضي الاكرم) بووە لە ساڵی (٥٦٨ك/ ١١٧٢ز) لەدایك بووە، بە گەورەیی و جوامێری و مەردایەتی ناسراوە، توانادار بووە لە زانستی زمان و ڕێزمان و خوێندنەوە و ئەستێرە ناسی و بیناسازی و مێژوو و بەرهەمی وەکو (اصلاح الملل، الواقع في صحاح الجوهري، الضاد و الظاد، تاريخ النحاة، تاريخ المصر، تاريخ الحكماء)، هەبووە. معجم الادباء، ج ٥، ص ٣٨١؛ ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج١، ص ١٣٣؛ السيوطي، المصدر السابق، ج ٢، ص ص ٢١٢- ٢١٣.

(٣) - رجي مصطفى، المرجع السابق، ص ١٢٦.

(٤) - انباه الرواة، ج٤، ص ٨١؛ معجم الادباء، ج ٥، ص ٣٩٥.

(٥) - حسين محمد فهيم، ادب الرحلات، (د/م: ١٩٨٩)، ص ٩٠.

وشەی (بینیم/رأیت)ی زۆری دووبارەکردۆتەوە[١]، جگـە لـەو تێبینیانـەی کـە لـە لای کۆبووەتەوە، لەکاتی باسکردنی هەرجێگایەك کە سەردانی کردووە.

یەکەمین گەشتی کە ئەنجامی داوە، هۆکاری بازرگانی دەبێت، هـەروەکو ئاماژەمـان پێکرد بۆ دوورگەی کیش[٢]، لەماوەی ژیانیدا چوار جار[٣] بە رێگای وشکانی وئاوی بـۆ ئەم ناوچەیە سەفەری کردووە، لە کاتێکدا کە مەڵبەندی بازرگـانی و ژمارەیـەکی زۆری بازرگانانی جیهانی ئیسلامی لەم ناوچەیە کۆ دەبوونـەوە[٤]. دواتـر سـەردانی تـەورێز و موسل دەکات و لە رێگەی شامەوە بۆ میسر دەچێت[٥]. بەم شێوەیە لە دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەردەستپێکردنی گەشتەکانی، واتا سـاڵی (٦١٣ك/ ١٢١٦ز) دا سـەردانی دیمەشق و حەلەب دەکات، لە رێگەی موسڵەوە گەیشـتۆتە هـەولێر و لـەم شوێنەشـەوە رێگای خوراسانی گرتۆتەبەر[٦]. کاتێ دەچێتە (نیسابوور) [٧] لەوێ نیشتەجێ دەبێت[٨]. سەردانی شارەکانی خوراسان دەکات و دەچێتە شاری (نەسا)[٩] هەروەها لە نێوان شاری (مەڕو) و (خەوارزم) هاتوچۆی بازرگـانی دەکـرد[١٠]. هـەر لـەو کاتیشـەوە تەتـەرەکان

---

[١] - بۆنمونە بروانە: معجم البلدان، مـج ١، ص ١٤٤، ص ١٥٩، ص ٢٠١، ص ٣٨٠؛ مـج٢، ص ٧٥، ص ١١٢، ص ٢٠١، ص ٢١٢، ص ٤٤١؛ مج ٣، ص ١٣.

[٢] - بروانە: ئەم لێکۆلینەوەیە، ل١٠، پەراوێزی ژمارە (٤).

[٣] - ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٧.

[٤] - ابو الفتوح محمد التوانسی، المرجع السابق، ص ٦٦؛ نەبەز مەجید ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠.

[٥] - یاقوت الحموی، الخزل و الدال، ق ١، ص ١٢؛ کراتشکوفسکي، المرجع السابق، ق١، ص ٣٩٩.

[٦] - الذهبي، تاريخ السلام، ج ٤٥، ص ٢٦٦؛ نزهة الفضلاء، ج٣، ص ١٦٧٨؛ صلاح الدين المنجد، اعـلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، (بيروت: ١٩٥٩)، ج ١، ص ٦٥.

[٧] - نیسابوور:شارێکی بەناوبانگی خۆراسانەو، دەکەوێتەنێوان قادسیەو جەیحون نێوانی لەگـەل شـاری ڕەی سەدو شەست فەرسەخە .معجم البلدان، مج٥، ص٣٣١.

[٨] - معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٣١.

[٩] - نەسا : شارێکی خوراسانە و بەناوبانگە بەوەی کەئاوهەوای خۆشەوە زۆر لەزانای لێهەلکەوتووە.. معجـم البلدان، مج ٥، ص ٢٨٢.

[١٠] - الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص٢٦٦؛ علي ادهم، المرجع السابق، ص ١٢٦.

بەدیارکەوتوون.بۆیە لەرێگەی شاری (الری) و قەزوین گەیشتۆتە هەولێر[(١)]. دووبارە چۆتەوە موسڵ و سەردانی سنجاریشی کردووە[(٢)]. لە کۆتاییدا لەشاری حەلەب گیرساوەتەوە[(٣)] تا دوایین تەمەنی. بەم جۆرە گەشت و گەڕانەکانی ماوەی شازدە ساڵی خایاندووە[(٤)].

## چوارەم: کۆچی دوایی کردنی:

یاقوت هەر لەو کاتەوەی شاری مەرو بەجێدەهێڵێت، رووە و شاری موسل کەوتۆتە رێ و دواتر ماوەیەك لەم شارە دەمێنێتەوە. نامەیەك بۆ وەزیر (ابن القفطي) دەنێرێت[(٥)]. کە باس لە جیهانی ئیسلامی و هێرشی مەغۆلەکان دەکات. هەروەها لە نامەکەی دەردەکەوێت کە خواستی ئەوەی هەبووە بچێتە شاری حەلەب و بە پاڵپشتی وەزیری ناوچەکە نیشتەجێبێت[(٦)]. هەر بۆیەش پێویستی بە پشتگیری دەبێت، چونکە کاتێ یەکەم جار سەردانی وڵاتی شام دەکات، لە شاری دیمەشق تووشی لەگەڵ هەندێ کەسایەتی ئەم شارە گیروگرفت دەبێت، لەبەر ئەوەی بیروڕای (خەوارجەکان)[(٧)]ی دەربڕیوە و پاڵپشتیانی کردووە، کەئەمەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە جیهانی ئیسلامی تووشی

---

(١) - ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق١، ص ٣١٩.

(٢) — ياقوت الحموى، الخزل و االدال، ق١، ص١٣؛ ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٣؛ عمر رضا كحالـه، المرجع السابق، ج٤، ص٨٣.

(٣) - الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٢٦٦؛ كامل سلمان الجبوري، المرجع السابق، ج٦، ص ص ١٢٠-١٢١ ؛ نقولا زياده، المرجع السابق، ص ٨٧.

(٤) - كراتشكوفسكي، المرجع السابق، ص ٣٩٩. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(٦).

(٥) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٣٠؛اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨.

(٦) - ابن القفطي: انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٢٦٧.

(٧) - خەوارجەکان، کۆمەڵەیەکی سیاسی و دینی بوون، سەرەتا بەشداریان لە دژایەتی مەعاویە کوڕی ئەبی سەفیان (٤٠-٦١ك/٦٦١-٦٨٠ز) دەکرد، بەڵام دوای مەسەلەی تەحکیم لە عەلیش دوورکەوتنەوەو بەرامبەر ئەویش وەستان، چونکە بڕوایان بە تەحکیم نەبوو. الشهرستاني، الملل والنحل، حقق: احمد فهمي، (بيروت: ٢٠٠٧)، ج ١، ص ١٠٦.

پەرتەوازەی هات، کاتێ ناکۆکی لەنێوان عەلی ومەعاویە روویداوهەروەها خوێندنەوەی کتێب دەربارەی بیروڕای خەوارجەکان گاریگەر بووە لەسەر خودی یاقوت.بۆیەش رایەکانی دەربارەی عـەلی کـوڕی ئـەبی تالـب (٣٥-٤٠ ك/ ٦٥٦-٦٦١ز) خەلیفـەی چـوارەمی راشیدینیش نابەجێ بووە، لەوکاتیدا خەڵکی شارەکە رووبەڕووی دەبنەوە و تـەنگی پـێ هەڵدەچنن، هەر لەهەمان کاتدا شارەکە بەجێدەهێڵێت[1].

جگە لەو بارودۆخەی کە بەلەدەستدانی ماڵ وسامانی لەشاری(مەڕو) تووشی هاتبوو، بەلاّم وەزیر وەلاّمی نەداوەتەوە، پاش ماوەیەکی تر یاقوت سەردانی شاری حەلەب دەکات و چاوی بەوەزیر (ابن القفطي) دەکەوێت و پێی دەڵێت :-((ئەوا بە گۆچانەکەم لە دەرگای تۆم داوە و هیوام وایە لەتەك جەنابتەوە بم))[2] سەرەڕای ئەوەی وەزیر سەرەتا نەکەوتۆتە بەر دڵی، بەلاّم پێشوازی لێ دەکات و مەعیشەتی بۆ دابین کردووە[3]. بۆیـە لـەم شـارە دەمێنێتەوە، خەریکی زانست و کتێب دەبێت بەشداری لە کۆڕوکۆبوونەوەکانی ئەم شارە دەکات، هەروەها خەریکی داڕشتنی بەرهەمـەکانی دەبێـت و تـاوەکو سـاڵی (٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) ماڵئاوای لەژیان دەکات.[4] (ابن خلکـان)ش باسـی رۆژی کۆچـی دوایییەکـەی دەکات و دەڵێت: ((خەڵکی بەسەریان دا هەڵـدەگوت و باسـی گـەورەیی و خوورەوشـتی بەرزیان دەکرد))[5].

---

(١) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٦، ص ١٢٨.

(٢) - ابن القفطي: انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٣؛ علي ادهم، المرجع السابق، ص ١٢٨.

(٣) - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٣.

(٤) - ابن الشعار، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٧؛ الذهبي، نزهة الفضلاء، ج ٣، ص ١٦٧٨؛ ابن تغري بردي، المصدر السابق، ج٦، ص ٢٧٤. بڕوانە: حاجي خليفه، المصدر السابق، ج٦، ص ٣٩٩؛ ابن العظم، السير الموصون ذيل على كشف الظنون، حققه: سليم يوسف، (بيروت: ٢٠٠٢)، ص ١٠٠.

(٥)- وفيات الاعيان، مج ٦، ص ١٣٩.

## پێنجەم: بەرهەمەکانی

هەموو بەرهەمەکانی یاقوت دەکرێ وەك سەرچاوەی زانستی وەری بگرین چونکە هەڵگری لایەنێکی دیار و پەرەسەندووی تیایە سەبارەت بەزانستی جوگرافیا وئەدەب و مێژوو و بابەتی جۆراوجۆر، کە دەکرێ بکرێت بە بنچینە بۆ لێکۆڵینەوە و نووسین، بەڵام هەندێ لەو بەرهەمانەی کە مێژوونووسان ناویان هێناوە، گەڕاندوویانەتەوە بۆ خاوەنەکەی، کە یاقوت حەمەویە. هەندێکیان لەبەردەست نین و بەرچاو نەکەوتوون، تەنانەت دەست نووسەکانیشیان هەر بزرن، بۆیە بەرهەمەکانی دەکەین بە دوو بەش:

### ا- بەرهەمە بەردەستکەوتووەکان:

#### أ- (معجم الادباء):

یەکێکە لە بەرهەمە بە پێزەکانی یاقوت، کە بەناوی جیاواز سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کردووە، بەڵام هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی ناوەڕۆکەکەی باس لە ئەدیبەکان و زانایان دەکات. بە ناوی (ارشادالالباء الى معرفة الادباء)[1] یان تەنیا بە (الادباء)[2] یا کتێبی (تحفة الادباء في اخبار الادباء)[3]، هەروەها بە (ائمة الادب)[4]، یان (ارشاد الاريب الى معرفة الاديب)[5]

---

[1] - اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٤٥، ص ٦٦.

[2] - الذهبي، نزهة الفضلاء، ج ٣، ص ١٦٧٨؛ السخاوي، الاعلان بالتوبيخ لمن ذم اهل التاريخ، ترجمة: صالح احمد علي، (بيروت: ١٩٨٦)، ص ١٨٦.

[3] - حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩.

[4] - ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨.

[5] - معجم الادباء، ج ١، ص ٣٩ ؛ ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق١، ص ٣٢٢

لەگەڵ (طبقات النحاة)[١] ش ناوبردراوە، ئەم جیاوازییەی کە لەم دەستەواژانەی بەدی دەکرێت ئەوە ناگەیەنێت کە هەریەکەیان بەرهەمی سەربەخۆن یان جیاوازن، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لەمێژوونووسان دابەشی دەکەن بۆ دوو بەرهەم هەروەکو (ابن المستوفی الاربلی)[٢] وەسفی کتێبەکە دەکات بە ناوی (ارشاد الاریب الي معرفة الادیب)، [٣] بەڵام دواتر لەریزی بەرهەمی یاقوت ناوی (معجم الادباء) ی بەسەرچاوەیەکی تری یاقوت داناوە.[٤]

لەم کتێبەدا باسێکی زۆری لە بارەی زانایانی زمان و رەچەڵەکناس و خاوەن بەرهەمە ئەدەبیەکان و نامەبەر تێدایە، هەریەکەش بە نموونە کراوە و خستراونەتەوە ڕوو[٥].

بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لە بەرهەمەکانیان[٦]، تەنیا باس لە ئەدیبی یەك ناوچە یاخود سەردەم ناکات، بەڵکو بە شێوەی گشتی تەنانەت ئاماژە بە هەواڵی چەند نەتەوەیەك دەکات زاناکانیان بە نموونە دەهێنێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی سوودیان بە زانستی ناو

---

(١) –طاش کبري زادة، مفتاح السعادة و المصباح السیادة، (بیروت: ١٩٨٥)، مج ١، ص ٢٦٢" القنوجی، ابجد العلوم والوشی المرقوم في بیان الاحوال العلوم، ج٢، ، تحقیق:عبدالجبار زکار، (بیروت:١٩٧٨)، ص٣٦٤.

(٢) - ابن المستوفي الاربلي ناوی (الموهب بن غنیمه بن علي بن شمس الدین ابوالبرکات) لە ساڵی (٥٦٤ك/ ١١٦٨ز) لە دایك بووە، و لە (٦٣٧ك/ ١٢٣٩ز) کۆچی دوایی کردووە. خاوەن زانیاری بووە لە بواری فەرموودە و ئەدەب و زمان و رێزمان و عروز و بەیان. بەرهەمەکانی وەکو (دیوان المتنبي وابی تمام، تاریخ اربل). ابن خلکان، المصدر السابق، مج ٤، ص ١٤٧. بروانە: ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج١، ص ١٥٠؛ السیوطي، المصدر السابق، ج٢، ص ٢٧٢.

(٣) - تاریخ اربل، ق ١، ص ٣٢٢.

(٤) - المصدر نفسه، ق ١، ص ٣٢٤.

(٥) - المصدر نفسه، ق١، ص ٣١٩؛ معجم الادباء، ج١، ص ٢٩؛ عمر فروخ، المرجع السابق، ج ٣، ص ٣٩١.

(٦) - معجم الادباء، ج ١، ص ٢٧.

قورئان و فەرموودەکان گەیاندووە [١]. هەروەها سوودی زۆری لە زانایان وەرگرتووە، جا چ زانایانی سەردەمی خۆی بێت یاخود بەرهەمی ئەو کەسانەی بەچاوی خۆی نەیبینیون[٢].

## ب- المشترك وضعا و المفترق صقعا:[٣]

ئەم بەرهەمە لای مێژوونووسان هەر بەم نـاوە ناسـراوە، بـەڵام یـاقوت کـاتێ خـۆی ئاماژەی پێدەکات، کەمێك جیاوازی هەیە لە ناوەکە وەکو (المتفق و المفترق)[٤] یـان لـە باسکردنی دێری (عاقول)[٥] دەڵێت :(( لە "المتفق خطا و ضـبطا" باسـم کـردووە)) [٦]. بەڵام یاقوت لێرەدا بەپێی ناوەرۆکی کتێبەکە ئەم دەربڕینەو ناوەی داوەتێ. هەمان ئـەو بەرهەمە بریتییە لە جۆرێك لەدانانی (تالیف)، کە سەرچـاوەکەی (معجـم البلـدان)[٧]. بەڵام کورتکراوەی ئەم کتێبە نییە، چونکە ئەو رایسپاردووە، کە بە هیچ جۆرێ کتێبەکەی کورت نەکرێتەوە و نەشێوێنرێت بەشێوەیەك کەواتاو سوودەکەی لەدەست بچێ[٨].

---

[١] - معجم البلدان ج ١، ص ٣٢.

[٢]- یەکێك لەو خاوەن بەرهەمەی کە خۆی نەیبینیوە ناوی (عبدالملك التاريخي) ناسراو بە (سراج البغدادي)یـە، کە ئەدیبێکی خاوەن چاکە و هەوال گێرەوە بووە ناسراوە بە تاریخی، چونکە بەردەوام خەریکی مێـژوو بـووە . السمعاني، المصدر السابق، ج ١، ص ٤٢٢. یاقوتیش ئاماژە بەوە دەکات لاپەڕە سپییەکانی کتێبەکـەی بە زانیارییەکانی ئەم زانایە ڕەش کردووە. معجم الادباء، ج ١، ص ٢٨.

[٣] - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩؛ ابن العمـاد الحنبلـي، المصـدر السـابق، ج ٥، ص ١٢٢.؛ حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩.

[٤] - معجم البلدان، مج ٥، ص ٧٨.

[٥] - دێری عاقول: ئەو دێرەیە لە نێوان مەدائینی کسری و نەعمانیە، دووری لە بەغدا نزیکەی (١٥ فەرسـەخ/ ٩٠کم) دەبێت. معجم البلدان، مج ٢، ص ٥٢٠.

[٦] - المصدر نفسه والصفحه.

[٧] - ياقوت الحموي، المشترك وضعا و المفترق صقعاً، اعداد: قاسم محمد رحيب، (د/م:١٨٤٦م)، ص ٣.

[٨] - معجم البلدان، مج ١، ص ١٤.

## جـ- الخزل و الدال:

دوای دۆزینەوەی دەست نووسی ئەم کتێبە و لێکۆڵینەوە لەبارەی دانەری ئەم بەرهەمە، لێکۆڵەرەوان گەیشتوونەتە سەر ئەوەی کە ئەمە بەرهەمی یاقوتە، ئەگەرچی هیچ لە سەرچاوەکان ئاماژەی بەناوی کتێبی یاقوت نەکردووە، کە بەم ناوە بێت، بەڵام بەڵگەی ئەو لێکۆڵەرانە لەم بارەیەوە روونە، کاتێ دەست نووسەکەیان شی کردۆتەوە، وەکو دەرکەوتووە لەلاپەڕەی یەکەم وسەرەوەی دەست نووسەکە بە خەتێکی (ثلثي) عەرەبی نووسراوە (كتاب الخزل و الدال لياقوت رحمه الله) [1]. یاخود دانەرەکە دەڵێ ((ناوم لێ ناوە خەزەل و دال لە نێوان (دور و دارات و دیره) یە، بە پشتیوانی خوا سوودمەند دەبێت، هەروەکو چۆن (معجم البلدان) سوودمەندە)) [2]. جگە لەمە هەمان شێواز ومیتۆدی کتێبی (معجم البلدان)ە، کە کاری شیکردنەوە و زمانەوانی و بە نموونە هێنانی هۆنراوە ئەنجام داوە، لە باسەکانی سوودی لە چەندین کەسایەتی وەرگرتووە، لە پێکهاتەی کتێبەکەدا وتارێك کە بەکورتی باس لە پێشەکی و سێ بەشی بەرهەمەکەی دەکات، پاشان لە پێشەکییەکەی، ئەو بابەتانەی (دور[3] و دارات[4] و دیره)[5] کە بەشەکانی کتێبەکەی لێپێکهاتووە روون دەکاتەوە. بە جۆرێك وشەی (دار) هەر بۆ خانووی بەکار نەهێناوە، بەڵکو بۆ (بلد) واتا ناوچەشی بەکارهێناوە، هەروەکو لە قورئانی پیرۆز

---

[1] - ياقوت الحموي، الخزل و الدال، ق ١، ص ٤٠.

[2] - المصدر نفسه، ق١، ص ٤٠، ص ٤٦.

[3] - دور: چاوگەکەی (دار) ە، کە مانای کوچە کەیلەکۆنە واتا بەگشتی ناوچە و گەڕەك، هەر شوێنێك خەڵکی تێدا کۆببێتەوە دەگرێتەوە، جۆرێك ناوێکی کۆکراوەیە لە نێوان ئەم دەستەواژانە. ابن المنظور، لسان العرب، (القاهرة: ٢٠٠٣)، مج ٣، ص ٤٤٦.

[4] - دارات: تاکەکەی (دارە) یە مەبەستی ئەو ناوچەیەیە، کە بە شتێك دەورە درابێت، وەکو ئەو رووناکییەی لە دەوری مانگ دایە، پێی دەڵێن خەرمانەی مانگ یاخود ئەو زەویەی لە نێوان چیاکانە. یاقوت الحموي، الخزل و الدال، ق ١، ص ١٥١؛ ابن المنظور، المصدر السابق، مج ٣، ص ٤٤٥.

[5] - دير: واتا ڕەبەنگەکان و بونیات نراوێکە لە زۆر شوێندا هەیە و بەوماڵە دەوترێت کە ڕەبەنەکان (لێبراو بۆ ژینی دوای) پەرستنی خوای تێدا دەکەن. الخزل و الدال، ق١، ص ١٥٧.

داهاتووه، ﴿فاصبحوا في دارهم جاثمين﴾[1] به‌م شێوه‌یه هه‌موو بابه‌ته‌کانی ئه‌م کتێبه چه‌ندین مانا و مه‌به‌ست وشوێن له‌خۆ ده‌گرێت.

## ٢- به‌رهه‌مه چاپ نه‌کراوه‌کان و به‌رده‌ستنکه‌وتووه‌کان:

أ- (المقتضب في كتاب جمهرة النسب): (ابن خلكان ) وه‌سفی ئه‌م سه‌رچاوه‌یه‌ی کردووه، که باس له ئه‌سل و فه‌سلی عه‌ره‌ب ده‌کات و ناویشی بردووه به [2]، (المقتطف في النسب)ش ناوی هاتووه. [3] ئه‌م به‌رهه‌مه ده‌ستنووسێکی له شاری قاهیره‌ی ولاتی میسردا به‌رچاوکه‌وتووه[4].

ب- (المبدأ و المآل)[5]: ئه‌م به‌رهه‌مه باس له مێژووی ئیسلام و گرووپه ئیسلامییه‌کان ده‌کات، خۆیشی ئاماژه به‌و سه‌رچاوه‌یه ده‌کات له‌کاتی باسکردنی هۆزه به‌ربه‌ره‌کان له (مبدا و المال)ی زیاتری ڕوونکردۆته‌وه[6].

ج- (كتاب الدول): ناوی له ڕیزی به‌رهه‌مه‌کانی یاقوت داهاتووه[7]. بێ ئه‌وه‌ی هیچ زانیارییه‌ك ده‌رباره‌ی بزانرێت.[8]

د- (اخبار المتنبى).[9]

هـ-(كتاب مجموع كلام ابي علي فارسي)[10].

---

(١) - سورة هود: الاية ٦٧.

(٢) - وفيات الاعيان، مج ٦، ص ١٢٩؛ الزركلي، المرجع السابق، ج ٨، ص ١٣١.

(٣) - حاجي خليفة: المصدر السابق، ج ٦، ص ٤٠٠؛ البغدادي، المرجع السابق، مج ٢، ص ٥١٣.

(٤) -ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٠؛ ر.ن الهي، ياقوت الحموي البغدادي، ص ٣٦.

(٥) - حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩؛ ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢؛ كامل سلمان الجبوري، المرجع السابق، ج ٦، ص ٢١؛ باقر امين الورد، المرجع السابق، ج١، ص ٢٥٦.

(٦) - معجم البلدان، مج ١، ص ٤٣٣.

(٧) - ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢؛ البغدادي، المرجع السابق، مج ٢، ص ٥٠٣.

(٨) - ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق ١، ص ٣١؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩ .

(٩) - ابن العظم، المصدر السابق، ص ١٠٣؛ الزركلي، المرجع السابق، ج ٨، ص ١٣١.

(١٠) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩؛ ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص ١٢٢.

و- (عنوان الاغاني)[١]، هەروەها بە (المنتخب كتاب الاغاني)[٢] ناوی هاتووە.
ز- (اخبار الشعراء المتاخرين و القدماء)[٣] بە (معجم الشعراء)ش[٤] هاتووە.
ح- (كتاب نهاية العجب في الابنية لكلام العرب)[٥] یان تەنیا (كتاب الابنية) [٦].
ط- (كتاب في الاشتقاق اسماء المواضع)[٧].
ی- (اخبار اهل الملل والقصص اهل النحل) [٨].
ك- (كتاب الاوزان الاسماء و الافعال الحاصرة للكلام العرب) [٩].
ل- (اخبار الحسن) [١٠].
م-(كتاب الانساب)[١١] كە ڕەنگە هەمان كتێبی (المقتضب في النسب) بێت.
ن- كتاب الرد على ابن جنى و كلامه[١٢].

---

[١] - نفس المصادر والصفحه.
[٢] - ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨.
[٣] - اليافعي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٤٨.
[٤] - ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨؛ الزركلي، المرجع السابق، ج ٨، ص ١٣١.
[٥] - ر.ن الهي، ياقوت الحموي البغدادي، ص ٣٨.
[٦] - ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج٩، ص ١٩٨.
[٧] -ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٥.
[٨] - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٦٩.
[٩] -ياقوت الحموى، الخزل و الدال، ق١، ص ٣٥؛ ابن القفطي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٨٥.
[١٠] - ابن العظم، المصدر السابق، ص ١٠٠.
[١١] - الذهبي، نزهة الفضلاء، ج٣، ص ١٦٧٨.
[١٢] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٥.

## تەوەری دووەم:

## ڕێبازی نووسین و شێواز و شیكردنەوە لە كتێبی (معجم البلدان)دا

ئەم بەرهەمە یەكێكە لەو دانسقانەی بە ڕۆشنبیری فراوانی زانستی جۆراجۆری سەردەمەكان دەناسرێت. كە سەرجەم لایەنەكانی جوگرافی و سیاسی و فەلەكی و زمانەوانی و ڕەچەلەكناسی و كۆمەلایەتی و مێژوویی و ڕۆشنبیری ئەدەبی لەخۆدەگرێت، باس لە ئازا وسەركردە و پیاو چاك و خاوەن بەرهەم و پاشماوەی هەوالەكان و ئەفسانە و شوێنەوارە مێژووییەكان دەكات، كەهەر بەم ناوە، واتا (معجم البلدان)، ناوی هاتووە[1].

### یەكەم: هۆكارەكانی نووسینی كتێبی (معجم البلدان):

هۆكاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هەبوون بۆ ئەوەی یاقوت هانبدەن بۆ داهێنانی ئەم بەرهەمە، هەر خۆی لەپێشەكیی كتێبەكەیدا دەڵێت: ((مەبەستم لە دانانی ئەم كتێبە ئارەزوو و ترس نەبوو، هەروەها لەبەر ئەوەش نەبووە، كە دوور بووم لە نیشتمان، ئەم كارەی من هەوێنی ئەو زانستەیە، كە خوای گەورە و قورئانی پیرۆز دەستیان گرتم و ڕێنومایان كردوم و سەریان خستم))[2]. بۆیە دەتوانین یەكێك لەهۆكارەكان بە باوەری ئاینی ومتمانەبوون بەهاریكاری خودا دابنێین.

---

(1) - ابن المستوفي الاربلي، المصدر السابق، ق ١، ص ٣٢٤؛ ابن الشعار الموصلي، المصدر السابق، ج ٩، ص ١٩٨؛ ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٦، ص ١٢٩.بروانە: ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٥، ص١٢٢ ؛ حاجي خليفه، المصدر السابق، ج ٦، ص ٣٩٩.

(2) - معجم البلدان، مج ١، ص ٧.

**یەكێك له هۆكارەكانی تر گرنگیی زانستی وڵاتناسی (علم البلدان)[1]یە، سوودی بۆ لێكۆڵینەوەی زانسته جۆربەجۆرەكان هەیە، هەروەها ئاشنابوون به كتێب و كاری بازرگانی، كه وەك دەسكەوتی ژیانی و پاڵنەر و پێداویستی كتێبەكه سەیر دەكرێت[2].**

**بەلاّم هۆكاری راستەوخۆ ئەوەبووە، كه خۆی ئاماژە پێدەكات و دەڵێت: ((یەكەم هاندەرم بۆ كۆكردنەوەی ئەم كتێبه ئەوە بووە، له ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز) له شاری مەرو له كۆبوونەوەیەك لەگەڵ پیاوماقوڵان دا لەوانە( ابو سعيد تاج الاسلام)ناسراو به (ابن سعد السمعاني[3]) بووە، پرسیاری سەبارەت به (حەباشە)ی لێكردم، به جۆرێك شوێنەكەی ناوی له فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، كه بازارێكی عەرەبانه لەسەردەمی جاهیلییەت، بیروڕای خۆم دەربڕی وتم، وای بۆ دەچم (حوباشه) كۆمەڵه خێڵێك بێت له چەند هۆز و تیرەیەك پێكهاتبێ، بەلاّم یەكێك له دانیشتوانی كۆڕەكه لێم راست بووە و گوتی حەباشەیه نەك حوباشە، زۆر سوور بوو لەسەر رایەكەی خۆی بێ ئەوەی بەڵگەیەكی هەبێت))[4].**

**ساڵی (٦١٥ك/ ١٢١٨ز) لەمەرو دەستی به نووسینی ئەم بەرهەمەی كردووە، سەرەتا به دوای زانیاری كۆكردنەوە گەڕاوە و دواتر له ساڵی (٦٢١ك- ١٢٢٤ز)دا ئەم بەرهەمەی**

---

(1) - زانستی وڵاتناسی، ئەو زانستەیە باس له هەواڵی رێگەوبانی وڵاتان چ وشكانی یان ئاوی، دەشتایی یا چیاكان دەكات، هەروەها زانیاری دەربارەی ناوچەكان لەهەموو رووێكەوە لەخۆوە دەگرێت، بەتایبەتی ئەوپانتایەی كه كەناوەدانە. طاش كبري زادة، المصد رالسابق، مج١، ص ٣٦١. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حكيم احمد مام بكر، الكرد و بلادهم عند البلدانين و الرحالة المسلمين(٢٣٢-٦٢٦هـ/٨٤٦-١٢٢٩م)، (دمشق:٢٠٠٩)، ص١٣.

(2) - بڕوانە: ئەم لێكۆڵینەوەیە، ل ل ١٠-١٢.

(3) - ابو سعد السمعاني: ناوی (عبدالكريم بن محمد بن منصور بن المظفر) له ساڵی (٥٠٨ك/١١١٤ز) له دایك بووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانەئەم لێكۆڵینەوە یە، ل ٤٦ .

(4) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٠" ابو الفتوح محمد التوانسي، المرجع السابق، ص ١٠١" عبد العال عبدالمنعم الشامي، مدن مصرية و قراها عند ياقوت الحموي، (كويت: ١٩٨١)، ص ٩ "

- Wadie Gwaidein,The Introductory Chapters Of( Yaquts Mujam Al Buldan) (Brill: 1967) P 9.

تەواو دەکات[١] و دانەیەکی دەستنووسەکەی پێشکەش بە وەزیر (ابن القفطي) کردووە[٢].

بەڵام پێش مردنی وەسیەتی بۆ (عزالدین ابن الاثیر)[٣] کردووە، کەکۆکراوەکەی و بەرهەمەکانی بباتە مزگەوتی زەیدیە لە بەغداد[٤]. وادیارە یاقوت متمانەی بە (ابن الاثیر) بووەو هەروەها هاورێشی بوو، بۆیەش ویستویەتی بەرهەمەکانی بباتە بەغدا ئەوکات زۆر زانای بەناوبانگ لێوە نیشتەجێبوون، جگە لەمەش شوێنی زانست وزانیاری بوو.

بەڵام سەبارەت بەوەی کەناوبراو وەسیەتەکەی یاقوتی بەجێ نەگەیاندووە، بەرهەمەکانی بەسەر خەلك دابەش کردووە[٥]. ئەمە تارادەیەك گومان تێدا هەیە. لەبەر ئەوەی هەندێ بەرهەمی بەشێوەی پوخت بەردەستن و، لەوانەشە بەرهەمەکانی گەیاندبێتە بەغدا، بەڵام گۆڕانکاری بارودۆخی وهێرشی داگیرکەران لەناوچونی کتێبخانەکان کاریگەری هەبووبێت بۆ لەناوچوونی هەندێ بەرهەمەکانی یاقوت.

## دووەم: هەڵسەنگاندنی زانستیی پێشەکیەکە:

دارشتنی پێشەکی ئەم کتێبە لەسەر شێواز و ڕێبازێکی فراوانی زانستی بووە، چونکە لەکاتی خوێندنەوەیدا هەست بەوە دەکرێ، کە پابەند بووە بە (ڕێبازی زانستی) پێشەکی، بەتایبەتی هۆکاری هەڵبژاردنی بابەت و پاڵنەر و هاندەرانی و چ ئامانجێکی هەیە لەبەرهەمەکەی، جگە لە ئاماژە کردنی بەبابەتی ناوەڕۆك و چۆنییەتی ڕێکخستنی بابەتەکان[٦].

---

[١] - یاقوت الحموی، الخزل و الدال، ق ١، ص ١٤.

[٢] - معجم البلدان، مج١، ص ١٤" نقولا زیاده، المرجع السابق، ص ٦٢.

[٣] - ابن الاثیر: ناوي (ابو حسن علي بن محمد بن عبدالكريم) ناسراو بە (ابن الاثیر الجزري). بۆزیاتری زانیاری بروانە ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل ٤٦.

[٤] - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ٤، ص ٨٤.

[٥] - المصدر نفسه والصفحة.

[٦] - معجم البلدان، مج١، ص ص١٠-١٥.

کەئەمــەش لەخالــە گرینگــەکانی نوســینی پێشــەکی زانســتیە[1] و کاریگــەریی سەرچاوەکان وچۆن و چی بەکارهێناوە، دەکرێت بلـێن پابەنـدە بەمەرجـەکانی نوسـینی پێشەکی زانستی کەلەسەرچاوەی هاوکات دا هەژماریان کردووە[2].

لە پێشەکی (معجم البلدان) یشـدا هەنـدێ لـە مەرجـەکان بـەدی دەکـەین، وەکـو دیاریکردنی هۆکار و پاڵنەرەکانی[3]، هەروەها ئامانجەکەی ئەوە بە دیاردەخات کە خەڵك پێویستی بە سەرچاوەیەکە، کە ورد و پوختە و رێکخراو بێت[4]. لەگەل چۆنییێتی پشـت بەست بە سەرچاوە کاریگەری زانستی سەرچاوەکان و ناو هێنان و جیاکردنەوەیان[5]. جگە لە دەست نیشانکردنی بابەتی ناوەرۆکەکەی، کە سەرەتا لە چەند بەش پێك دێـت، هـەر کورتە بەشێك باسی چی دەکات[6].

## سێیەم: شێوازی دارشتنی کتێبەکە:

خستنە رووی شێواز و دارشتنی زانیاری کتێبی (معجم البلدان)، رێبازێکی تایبەتمەند و جیاوازی هەیە، لەگەڵ بەرهەمەکانی پێش خۆی، کە پێکهاتووە لە پێشەکییەك و چەند بەشێك، وەکو بەرایی (تمهید) کتێبەکە نزیکەی (سی) لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە، دواتر شێوازی ناوەرۆکەکەی لەسەر بنەمای پیتی عەرەبی (هجائی)وئەلفا بێ ی سەرچـاوەکان پۆلێن کردووە، بۆ هەر (٢٨) پیتە عەرەبییەکە، هەر یەکێکیان دەکاتە (٢٨) بەش وەکو : پیتی سەرەتای وشەکە ← ئەلف + با ← ریزبەندی پیتی هجائی یەك لە دوای یەك

---

[1] - محمد عبدالغني و محسن احمد خضري، الاسس العلمية لكتابة رسائل الماجستر و الدكتورا، (مصر: ١٩٩٢)، ص ٢٣.

[2] - علي ابراهيم حسين، استخدام المصادر و الطرق البحث، (القاهرة: ١٩٨٠)، ص ٢٧.

[3]- بڕوانە: ئەم لێکۆلێنەوەیە، ل ل ٢٩-٤٧.

[4] - معجم البلدان، مج١، ص ١٠.

[5] - المصدر نفسە، مج٢، ص ١١.

[6] - المصدر نفسە، مج١، ص ١٥.

وەکو (ابار)[١]

یاخود پیتی سەرەتای وشەکە ← با + همزە ← ریزبەندی پیتی هجائی وەکو (بئـر ارما)[٢].

بەلاَم ئەوەی تێبینی دەکەیت هەر (٢٨) پیتەکە، ٢٨ بەش تەواو ناکەن، ئەمەش لەبەر نەبوونی وشە یان ناو یان زانیاری، کە پیتی سەرەتا لەگەلْ پیتەکەی دوایی وەکو (بێ+ ڤێ) یان (تێ لەگەلْ حێ).

هەروەها ریزبەندی هاوبەشی بۆ وشەیەك کردووە بەمجۆرە:

(وشەی هاوبەش+ ناوەکە ← بە پێی ریزبەندی پیتی هجائی ناوەکەیـە). وەك (قلعە/ قەلاَ) قەلاَی (ابی حسن)[٣] قەلاَی (ابي طويل)[٤] قەلاَ (نجم)[٥] ...هتد، بە هەمان شـێوە بـۆ وشـەکانی (تـل (تەپۆلکـە)، جبـل (چـیا)، ، دار (مـالْ)، دیـرە، بحیرە (دەریاچە)...هتد دووبارە دەبێتەوە.

## چوارەم: شیکردنەوەی ناوەڕۆکی کتێبی (معجم البلدان):

### أ- خستنە ڕووی بەراییەکە:

ڕوونکردنەوەی بابەت و زانسـتیی بەراییەکـە، لـە پێـنج کورتـە بـەش پێکهـاتووە، هەریەکێکی بۆ زانستێکی گشتی جۆراوجۆر تایبەت کردووە، لەگـەلْ بیروبـاوەڕی خـۆی

---

(١) - آبار: کۆکراوەی بیرە (کاریز) و کورمیەکە لە شاری واست. معجم البلدان، مج١، ص ٤٩.

(٢) - (بئرا رما): کاریزکە دووری لە شاری مەدینە (سێ میلە/یـەك فەرسـەخە). معجم البلدان، مـج ١، ص ٢٩٨.

(٣) - قەلاَی ئەبی حەسەن، قەلاَیەکە لەکەنارەکانی نزیك شاری صەیدا لە ولاَتی شام. معجم البلدان، مـج ٤، ص ٣٨٩.

(٤) - قەلاَی ئەبی طویل: قەلاَیەکە لە ئەفریقایە و گەورەیـە پارێزگـاری لـە شـاری قـەیرەوان دەکـرد. معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٩٨.

(٥) - قەلاَی نەجم: قەلایەکی قایمە دەورە دراوە بەرووباری فورات. معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٩١.

**لەگەڵ و بیروڕای زاناکان تێکهەڵکێش کردووە، (بەشی یەکەم) باس لە خەسڵەت و پێکهاتەی زەوی لەڕووی شێوەی دەشتایی یان بان یان شێوەی تردەکات.[1]**

**بیروڕای جیاواز سەبارەت بە قەبارەی چەندییەتی زەوی دەخاتەروو، وەکو ڕای (بطلموس)[2] کە چۆن زەوی دابەش کردووە بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هێڵی ناوەڕاستیش لە نێوانیانە[3]. هەروەها باس لە رووبار و چیاکانیش دەکات، بە جۆرێك ڕووبارەکان لە کوێوە هەڵدەقوڵێن، بۆ کوێ هەڵدەرژێن، هەرواش باس لە خەسڵەتەکانی ئاوی رووبارەکان دەکات لە رووی پاکی و شیرینی وسوێری و پێکهاتەی ژێر زەوی. بەشی دووەمی بەراییەکە لەبارەی حەوت هەرێمە ئاوەدانەکەی زەوییە، کە یەکە یەکەیان روون دەکاتەوە، سنووری ئەو ناوچانەی دەکەونە چ هەرێمێك دیاری دەکات، لەگەڵ دیاری کردنی هێڵی درێژی و پانی، هەروەها درێژی ماوەی شەو ورۆژ لە هەر هەرێمێکدا[4]. لە بەشی سێیەمیشدا باس لەشیکردنەوەی زاراوە بەکارهاتووەکان دەکات، بۆ نموونە (فەرسەخ)[5] (کورە)[6] (روستاق)[7] (غەنیمە)[8] ..هتد. کە پێناسەیان دەکات و ماناکەشیان شی دەکاتەوە، بەشی دواتری بەراییەکە بریتییە لە باسکردنی حوکمی زەوی و وتەی زاناکان و**

---

(1) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٦.

(2) - بەتلیموس، یەکێکە لەو زانا بەناوبانگە یۆنانیەی کە زانیارییەکانی کاریگەر بووە لەسەر رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە وڵاتی میسر لەدایك بووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل ٢٩.

(3) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٩.

(4) — معجم البلدان، مج١، ص ص ٢٥- ٣٣.

(5) - فەرسەخ: لە فەرسەنگی فارسییەوە هاتوەو، لە ڕووی زمانەوانی بە مانای ماوەیەك دێت، وەك فەرسەخی رۆژ و شەو و کاتەکانییەتی، بەڵام یەکەیەکی پێوانەییە بەگشتی بۆ پێوانی درێژی بەکار دێت، یەك فەرسەخیش سێ میلە(٤٨٢٧)مەترە . معجم البلدان، مج ١، ص ٣٥.

(6) - کورە: ناوێکی فارسییە و ئەو ناوچە فراوانەیە گوند و شار و شارۆچکە و شارەدێ لەخۆوە دەگرێت. معجم البلدان، مج١ ص ٣٦.

(7) - روستاق: لە وشەی ڕۆزە فستای زمانی فارسییەوە هاتووە، لەهەر شوێنێك سەوزاییەکی لێ بوایە کەمێك خەلکی لێ نیشتەجێ بوایە، پێیان دەگوت ڕوستاق. معجم البلدان، مج١، ص ٣٧.

(8) - غەنیمە: ئەودەستکەوتەیە موسڵمانەکان لە زەوی و بێ باوەڕەکان بەدەستیان دەهێنا، لە دوای سەرکەوتن دابەشیان دەکرد بەسەر هاوەڵەکان، دوای دەرکردنی پێنج یەکی بۆ جەنگاوەران، معجم البلدان، مج ١، ص

بڕی باج و سەرانە لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی و لە هەمان كاتدا باس دەكات[1]. لە بەشی پێنجەم كۆتایی بەراییەكە باس لە پێكهاتە كۆمەڵایەتییەكانی كردووە، كە خەڵك لە ناوچە و شارەكان بە چی بەناوبانگن، لەگەڵ وەسف كردنی مەلیك و سەركردە جیاجیاكان[2].

## ب- میتۆدی زانستیی ناوەرۆكەكە:

ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی كە شارو ناوچەكانی پێ باس دەكات لەم خاڵانەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە.

١- سەلماندن و چەسپاندنی ناوەكان لە ڕووی زمانەوانییەوە: سەرەتا لەكاتی خستنە ڕووی زانیاری دەربارەی هەر شوێنێك، شیكردنەوەیەكی زمانەوانی بۆ ناوی شوێنەكە دەكات، هەندێ جاریش ناوی شوێنەكەی بۆ دەگەڕێنێتەوە، وەكو لە شاری (ئامەد)دا ناوەكەی بۆ (فعل) ی چاوگی (أمد) دەگەڕێنێتەوە، كە وشەكە ڕۆمییە و لە زمانی عەرەبی بەمانای درێژ دێت[3]. بەم جۆرە تا بۆی كرابێت بنج و بنەوانی ناوی شارەكان و وشەكانی بۆ زمانی عەرەبی گەڕاندۆتەوە، ئەمەش یەكێكە لەو هەڵە زانستییانەی كە تێی كەوتووە.

هەروەها ئاماژە بە هەر گۆڕانكارییەك لە پیتەكانی ناوی ناوچەكە دەكات كە چی بەسەر دێت، وەكو (اشب) ئەگەر (ئاشەب) بێت شوێنێكە لە (طالقان)[4]، بەڵام (ئاشیب) بێت ئەوا قەڵایەكی وڵاتی هەكارییە[5].

---

٣٩. یاخود ئەو دەستكەوتەیە موسڵمانان لەكاتی فەتح كردنی بە جەنگ لە ماڵی بێ باوەڕان بە دەستیان دەهێنا. الماوردي، الاحكام السلطانية، تحقيق: عصام فارس، محمد ابراهيم، (بيروت: ١٩٦٦)، ص ٢١٧.

(١) - معجم البلدان، مج ١، ص ص ٤٤- ٤٦.

(٢) - المصدر نفسه، مج ١، ص ص ٤٧- ٤٨.

(٣) - المصدر نفسه، مج١، ص ٥٦.دوورنیە ووشەیەكی كوردی بێت، لەئومێدەوە هاتبێت.

(٤) - طالقان: ناوچەیەكە لە خوراسان لە نێوان مەرو و بەلخە. معجم البلدان، مج ٤، ص ٦.

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٥٤.

یاخود ناوی شوێنەکانی بۆ ئەو وشەیە گەڕاندۆتەوە، کە زمانەوانان باسیان لێوە کردووە، وەکو ناوی (اربل/ هەولێر) (الاصمعي)[1] بۆ چاوگەکەی (ربل) گەڕاندۆتەوە، ناوی ڕووەکێکە گەڵای بەبێ باران سەوز دەبێت، لەم ناوچەیەش ڕوواوە[2].

هەندێ جار ناوەکانی برگە بەبرگە شیکردۆتەوە، کە هەر برگەیەك مانای چی دەگەیەنێت، وەك (ایران شهر) کە دەستەواژەیەکی فارسییە لە دوو برگە پێك دێت، یەکەمیان ناوی پاشای وڵاتە و دووەمیان بەمانای شار یان ناوچە دێت[3]. بەڵام هەندێ جار بەبێ هیچ گۆڕانکارییەك لەناوی شوێنەکە، کەچی دەکەوێتە دوو ناوچەی جیاواز، واتا دوو ناوچە بە هەمان ناو هەن[4].

## ٢- هەڵکەوتەی ناوچەکان لە ڕووی فەلەکییەوە:

ڕووکاری فەلەکی و بیروڕای ئەستێرەناسان بەشێوەیەکی ئاشکرا و بەرچاو دەردەکەوێت، کە ئەمەش بۆ گرنگی ئەم زانستە دەگەڕێتەوە و کاریگەری و سوودی لە سەر زانستی وڵاتناسیدا، تەنانەت یاقوت خۆی ئاماژە بەوە دەکات هیچی لە زانستەکانی تر کەمتر نییە، بۆ سوود گەیاندن بە وڵات و ناوچەکان و بە پێچەوانەشەوە ئەستێرەناسانیش بۆ زانینی خولگە وشوێنی ئەستێرەکان پێویستیان بە زانستی وڵاتناسی هەیە[5]، هەر بۆیە زانیاریی فەلەك ناسان لە چەندین شوێنی (معجم البلدان)دا بەرچاو دەکەوێت، وەك لە باسکردنی شاری حەران[6].

(١) - الاصمعي، ناوی (ابو سعید بن عبدالملکي بن قریب بن عبدالملك بن الاصمعي)، لە شاری بەسرە لە دایك بووە. بڕوانە ئەم لێکۆلینەوەیە، ل٣٥.

(٢) - معجم البلدان، مج١، ص١٣٧.

(٣) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٢٩٨.

(٤) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٢٨٨.

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٩.

(٦) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٣٥.

## ٣- یەكە كارگێڕییەكان:

لە باسی یەكە ئیدارییەكانی ئەم بەرهەمە تێكەڵاوییەكی بەرچاوی پێوە دیارە چونكە ئەو دەستەواژانەی كە بەیەكەی ئیداری ناوبراون (المدينه/شار)- (بلد/شارۆچكە)- (بليدە/ شارەدێ)- (قریە/گوند)- ( ناحیە)-(موضع/شوێنگە)- (قصبە/مەلبەند)- (كورە)- (روستاق)..هتد بەهیچ شێوەیەك جیاكردنەوە لە نێوانیان دا نییە، بە جۆرێك یەكێكیان گەورە تربێت یاخود بە پێچەوانەوە، هەندێ جار شارێك كە بە (بلد)ی ناوبردووە[1]، كەچی ناوچەیەكی تر، كە نەگەیشتۆتە ئاست شار ئەویش هەر بە (بلد) ناو دەبات[2]. كەواتە یاقوت لە زۆر شوێندا ناوی (بلد)ی بە زۆر شوێندا لكاندووە، تەنیاش مەبەستی شار نییە. یا وشەی (ناحیە)ی بەرامبەر (اقلیم/ هەرێم) داناوە[3]. واتا هەندێ جار هەرێمەكە بە ناحیە ی بەكار هێناوە[4]، تەنانەت لە جیاتی شاریش هەم دیسان بە ناحیەی ناوبردووە. لەگەڵ بەكارهێنانی دوو دەستەواژە بۆیەك ناوچە [5]، تێكەڵاویەكەشی لەوەیە، نازانرێت ئایا ئەوەی مەبەستیەتی شار بووە یان بچووكترە لە شار (ناحیە) یان گوندە. كە ئەمە بەشێوەیەكی بەرچاو دیارە، وای لەكۆكراوەكەی كردووە، ڕێبازێكی ووردی لەم بارەیەوە نەبێت لەبەر ئەوەی گۆڕانكاری بەسەر ناوچەكان هاتووە.

جگە لە دیاركردنی شوێنی بەڕێوەبردنی یەكە ئیدارییەكان، هەروەكو لە هەندێ سەردەمدا (دار الامارە) بە یەكەیەكی بەڕێوەبردنی سیاسی و كارگێڕی دادەنرا.یاقوتیش لە هەندێ ناوچەدا ئاماژە بە بوونی ئەم بەڕێوەبەرایەتییە كارگێڕییە كردووە[6].

---

[1] – معجم البلدان، مج ٣، ص ١٥٢.
[2] - المصدر نفسه، مج ٣، ١٨٩.
[3] - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٢٦٢، ص ٣٦٤.
[4] - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٣٩٩.
[5] – المصدر نفسه، مج ٥، ص ٤٧.
(٦)- المصدر نفسه، مج ٥، ص ٢٣٥.

٤- گەڕاندنەوەی ناوی شوێنەکان بۆ یەکەمین بنیاتنەری، یاخود جێنشینی وەکو (هەمەدان)[١] و (ئەسفەهان)[٢] ناویان بۆ کوڕی سام کوڕی نوح (سەلامی خوایان لەسەر بێ) دەگەڕێتەوە. یاخود دیاریکردنی دەسەڵاتدارانی رۆژگاری خۆی، واتا تاسەدەی حەوتەمی کۆچی سیانزەی زایینی، ئایا ئەو شوێنە تا ئەوکاتی ماوەتەوە[٣]، جگە لەوەی هەوڵی داوە ناوی شارەکان بەپێی یەکە یەکە لەوشەکانی ناوەکە بە سەرو بۆرو ژێر بچەسپێنێت وەکو (اربل/هەولێر)، ( سنجار/سینجار)، (امد/ئامەد)، (حصن کیفا/حیصن کەیفا) ....هتد[٤].

٥- میتۆدی یاقوت لەبارەی زانستی جوگرافیای ناوچەکان بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەدیار دەکەوێت، تەنانەت ئەم بەرهەمە لە بواری جوگرافییەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە، چونکە لە هەموو ڕوویەکی جوگرافییەوە باسی ناوچەکان دەکات، وەکو شوێنیان لە حەوت هەرێمە ئاوەدانەکەی زەوی، ماوەی نێوان ناوچەکان و سروشتی ناوچەکە و ئاو و هەوا و ڕووبار و دەریا و چیاکان، ڕووی زەوی بەگشتی، لەگەڵ درێژی و پانی، ئەمانە بەگشتی لە باسکردنی شاری موسل بەدی دەکرێن.[٥]

٦- گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان وەکو میتۆدێکی زانستی ئەم بەرهەمە سەیر دەکرێت، چونکە هەندێ بارودۆخی مێژوویی لە زۆر ناوچە باسکراوە، بگرە هەر لە فتوحاتی ئیسلامییەوە تاکو خاوەندارییەتی ناوچەکان و گەورە پیاوان و خەلیفە و دەسەڵاتداران، لەگەڵ دیاریکردنی کات و ساتی مێژوویی و هەروەها دژە دەسەڵاتی داگیرکاری دوای سەردەمی یاقوت باس کراوە، لە هەر یەکێکیان تایبەتمەندی بەرچاو

(١) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٤١٠.

(٢) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٢٠٦.

(٣) — معجم البلدان، مج ١، ص ١٣٢، ص ١٤٦.

(٤) - پەیرەوی دەربرینی ناوی شارەکان پەپی چۆنییێتی دەربرینی یاقوتە کەپابەندی ئەلفا بێ ی سەرچاوەکانە مەبەست لەئەلف بێش فەتحەو زەمەو کەسرەی عەرەبیی یە.کە لەبەشی دووەمەوە کارمان پێکردووە. بۆزیاتر زانیاری بڕوانە: بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

(٥) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

دەکەوێ لە گێڕانەوەی بابەتەکان، وەك چۆنییەتی بەڕێوەچوونی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لەناوچەکان[1]. یاخود بەسەرهات وکاری خەلیفەکان وەکو باسی خەلیفەی عەباسی (ابو جعفر المنصور) (١٣٦-١٥٨ك/ ٧٥٠-٧٥٥ ز)، کە چۆن ئەیوانی کیسرای رووخاندووە.[2]

لەگەڵ ئەو شوێنانەی کە ناکۆکیان تیادا رووی داوە وەکو (باجەمیرا)[3] ناوچەی بەرەنگاربوونەوەی هێزی نێوان (مصعب بن زبیر)، [4] لەگەڵ خەلیفەی ئەمەوی (عبدالملك بن مروان) (٦٥-٨٦ك/٦٨٥-٧٠٥ز) بووە.

جگە لە هێرشی داگیرکەران بۆ ناوچەکان[5]، لەگەڵ خستنەرووی شوێنەوارە مێژووییەکان[6].

٧- میتۆدی لایەنی شارستانی خۆی لە باسکردنی باری بیناسازیی ناوچەکان و باری ئایینی و رۆشنبیری و ئابووری ناوچەکان دەبینێتەوە.

٨- دیاری کردن و باسکردنی زاناوناودارانی ناوچەکان، وەك دەبینین لەسەرچاوەکەی یاقوت دا لە کۆتایی باس کردنی هەر ناوچەیەك باسی چەند کەسایەتییەك دەکات، کە زۆربەیان رەچەڵەکیان بۆ ئەو شوێنە دەگەڕێتەوە، کە ناوی هێناوە جا چ کەسایەتی زانستی یان خاوەن دەسەڵات و پلەو پایە بەرزەکان بێت، هەندێ جار باس لە کورتەی ژیانیشیان دەکات، وەك لەشاری مەراغە دەردەکەوێت[7].

---

(١) – المصدر نفسه، مج ١، ص ١٢٨. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل ل ١٥٦-١٦٢.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ٢٩٤.

(٣) - باجه میرا: شوێنێکە لە نزیك تکریت. معجم البلدان، مج ١، ص ٣١٤.

(٤) - موسعەبی کوری زبیری کوڕی عەوامی کوڕی خوەیلدە، ناسراو بە ئەبو عەبدوللا لە لایەن براکەی(عبدالله بن زبیر) لەساڵی (٦٧ك/ ٦٨٧ز) کرا بە والی عێراق و لە نێوان ساڵانی (٧٢- ٧٢ك/ ٦٩١-٦٩٢ز) مردووە. ابن عساکر، تاریخ دمشق، تحقیق: محمدالدین ابی سعید، (بیروت: ١٩٩٥) ج ٥٨، ص ص ٢١٠- ٢٢٥؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج ٥، ص ٥٢٤.

(٥) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٥٩، ص ٢٠١، ص ٣٧٩.

(٦) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٦٥، مج ٢، ص ٨٤.

(٧) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٩٣.

٩- بەڵگە هێنانەوە و روونا‌ككردنەوەی باسەكانی بە ئایەتی قورئان و فەرمودە پیرۆزەكان، وەك لەروونكردنەوەی بۆ هۆزی (بەربەر) بەدیار دەكەوێت [1]. قسەكانی بە هۆنراوەی شاعیرانیش روون دەكاتەوە، وەك لە باسی ئاران. ئاماژە بە هۆنراوەی شاعیرێك دەكات، كە دەڵێ [2]:

بلادالله واسعه فضاها رزق الله في الدنيا فسيح

فقل للقاعدين على هوان اذا ضاقت بكم ارض فسيحوا

((بەرفراوانە زەوی خوا، زۆرو زەوەندە لەوجیهانە بژێوی خوا،

بڵێن بەدانیشتوان بێ پەروا، برۆنە ئەم وولاتە گەر تەنگیان پێهەڵچنرا))

لێرە دا مەبەستی پان وبەرینی وولاتی ئاران لێكۆڵەرانیش ژمارەی ئەو دێرە شیعرە بە كارهاتووانەیان لە ناو (معجم البلدان) بە پێنج هەزار دێرە شیعریان هەژمار كردووە [3].

١٠- بابەتە ئەفسانەییەكان لەم كتێبەدا دووبارە دەبێتەوە، تەنانەت خۆی ئاماژە بەوە دەكات، كە هەندێ شتی باس كردووە عەقڵ رەتی دەكاتەوە، چونكە لەگەڵ نەریتە باوەكان ناگونجێ و گومانیشی لێ هەیە [4]. بەڵام ئەو میتۆدەی گرتوویەتییە بەر بۆ گێڕانەوەی ئەم بابەتە خۆی لێ بێ بەری دەكات و دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو كەسەی لێ ی وەرگرتووە [5].

١١- ئەگەر بەوردی لەزانیاریی ناوچەكان بەگشتی بكۆڵینەوە، ئەوا هەمووئەو بابەتانەی لەسەرەوە ئاماژەمان بۆكرد باسی لێوە نەكراوە، گەر بێت و لایەنی زمانەوانی وجوگرافی بەردەوام باسیان لێوەكرابێت، بەڵام زانستەكانی تر هەندێ جار بەردەوام نابێت، یازۆر بەكورتی تیشك خراوەتەسەر، جگەلەمە قسەكردن لەسەر هەندێ بابەت یا ناوچە چەندلاپەرەیەكی كتێبەكەی بۆتەرخان كراوە، كەچی لەهەندێ شوێندا زۆر بەكورتی بەچەند دێرێك كۆتای پێدێنێت، ئەمەش بۆ زانیاری وتایبەتمەندی وگرینگی بابەتەكە دەگەڕێتەوە.

---

(1)- معجم البلدان، مج١، ص٣٦٩.

(2) - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٣٦.

(3) - محمد مؤنس، المرجع السابق، ص ٧٥؛ نەبەز مەجید ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٧.

(4) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٢.

(5) – معجم البلدان، مج ١، ص ٤٧٥.

## پێنجەم: سەرچاوەكانی كتێبی (معجم البلدان)

### ا- سەرچاوە ئاماژە پێكراوەكانی لەپێشەكی (معجم البلدان) دا:

*** فەلەكناس

أ- بەتلمیوس:

یەكێك لەو زانایانەی كاریگەری لەسەر رۆژهەلآت و رۆژئاوا هەبووە، لە میسر هاتۆتە دونیاوە، سالّی (١٧٠ ز) مردووە، بە خاوەن كتێبی (مجسطي) ناسراوە[١]، (ابـن قفطـي) باسی لێوە دەكات وەدەڵێت:(( كتێبەكـەی سـەبارەت بـە زانسـتی فەلـەك و جوولـەی ئەستێرەكانە)) [٢]. جگە لەوە بەرهەمی تـری هـەبووە وەك (الموالیـد، الحـرب و القتـال، استخراج السهام، المرض و شرب و الدواء، سیر سبعه) هتد[٣].كتێبی(الملحمة) ی ناوبراو لە ئینسوكلۆپیدیایەكەی یاقوت زانیارییەكانی بەرچاوە[٤]. زیاتر لە شەشت جار پشتی پێ بەستراوە.

*** سەرچاوەی گەشتیار و ولآتناسان:

أ- (ابن خرداذبه) [٥]:

ناوی (ابوقاسم عبدالله بن عبدالله بـن ابـن خرداذبـە) یـە لەسـالّی (٢٠٥ك/ ٨٢٠ز) لەدایك بووە[١]، لە (٣٠٠ك/ ٩١٣ز) مردووە[٢]، پلەی ئیداری و دەوڵەت (نامەبـەری و

---

(١) - عمر فروخ، تاريخ العلوم عند العرب، (بيروت: ١٩٨٠)، ص ٤٩.
(٢) - اخبار العلماء باخبار الحكماء، (مصر: ١٣٢٦هـ)، ص ٦٩.
(٣) - ابـن النـديم، الفهرسـت، ضـبطه: يوسـف علـي طويـل، (بـيروت: ٢٠٠٢)، ص ص ٤٣٠- ٤٣١؛ ابـن القفطي، اخبار العلماء، ص ٧٠.
(٤) - بۆنمونە بڕوانە : معجم البلدان، مج ١، ص ١٩؛ مج ٢، ص ٣٩؛ مج ٣، ص ٥٩.
(٥) - ابن خرداذبه، المسالك و الممالك، تحقيق: محمد مخزوم، (بيروت: ١٩٩٨)، مقدمه محقق، ص ٨.

هەواڵێنری) لەسەردەمی خەلیفـەی عەباسـی (المعتمـد) (٢٥٦-٢٧٩ك/ ٨٧٠-٨٩٢ز) هەبوو. رەچەڵەکی بۆ خەڵکی فارس دەگەڕێتەوە[٣]، خاوەن بەرهەمی جۆراوجۆر بووە[٤]، بەلأم ئەو بەرهەمەی، کـه یـاقوت سـودی لـێ بینیـوە و ئامـاژەی بـۆکردووە، کتێبـە وڵاتناسییەکەی (المسالك و الممالك) ە[٥]، کە بەهۆی شارەزای کەسایەتی و تاقیکردنەوە و جێبەجێ کردنی پێداویستییە ئیدارییەکان ئەم بەرهەمەی لێ پێکهێناوە[٦].

## ب- (اليعقوبي):

ناوی (احمد ابن يعقوب بن اسحاق بن جعفر وهب) بووە[٧]، ناسراوە بە ئەسـفەهانی و ئەخباری و بەناوبانگە بە یەعقوبی[٨] مێژووی لەدایك بوونی نادیارە، لە شـاری بەغـدا هاتۆتە دونیاوە[٩]، سەرەڕای ئەوەی ژیانی لە میسر و مەغریب بردۆتـە سـەر، گەشـتی کردووە بۆ ئەرمینیا و ئێران و هندستان و شام، بیروڕای جیاواز هەیە سەبارەت بەکۆچی دوای کردنی هەندێکیان ئاماژە بەوە دەکـەن لـە (٢٨٧ك- ٨٩١ز) مـردووە[١٠]. بـەلأم بەپێی زانیاری کتێبەکەی لە (٢٩٢ك/٨٩٥ز) کۆچی دوای کـردووەو، ئەمـەش بەراسـتر دەزانرێت .لەبەرهەمە بەرچاوەکانیشی (تاریخ الکبیر، اسمـاء البلـدان، مشـاکلة النـاس

---

(١) - کراتشکوفسکي، المرجع السابق، ق١، ص ١٥٦.
(٢) - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ٨.
(٣) - ابن النديم، المصدر السابق، ص ٢٣٩؛ شوقي ابو خليل، الحضارة العربية الاسلامية، (بيروت: ٢٠٠٠)، ص ٤٩٢.
(٤) - ابن النديم، المصدر السابق، ص ٢٣٩.
(٥) -بۆنمونه بروانه: معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٤٧؛ مج ٥، ص ١٧٣.
(٦) - طه عبدالمقصور، الحضارة الاسلامية، (بيروت: ٢٠٠٤)، مج ١، ص ٢٧٠.
(٧) - معجم الادباء، ج ٢، ص ٨٢.
(٨) - اليعقوبي، البلدان، وضحه: محمد امين ضناوي، (بيروت: ٢٠٠٢)، مقدمه محقق، ص ٥.
(٩) - علي عبدالله الدفاع، رواد العلم الجغرافي، (بيروت: ١٩٨٧)، ص ٧٨.
(١٠) - الزركلي، المرجع السابق، ج ١، ص ٩٥؛زكي محمد حسين، المرجع السابق، ص٣٥.

لزمانهم)[١] یاقوت بۆ زانیاری کتێبەکەی، سوودی لە بەرهەمە جوگرافیەکەی ئەم زانایە بەناوی (بلدان)[٢] وەرگرتووە[٣].

## ج- (ابن الفقیه الهمذاني):

ناوی (احمد بن محمد بن اسحاق الهمذاني)ە، ناسراوە بە ئیبن فەقیهی و نازناوی حالان بووە[٤].

مێژووی لەدایك بوونی وکۆچی دوایی نادیارە[٥]. بەلاَم لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچی نۆیەمی

زاینیی ژیاوە[٦]، (ابن الندیم) وەسفی دەکات دەڵێت:(( یەکێکە لە ئەدەب دۆستان و خاوەن بەرهەم، وەکو(البلدان، سلخ کتاب الجیهاني، ذکر شعر و شعراء))[٧]. زانیارییەکانیشی لە کتێبەکەی یاقوت ڕەنگی داوەتەوە[٨].

## د- (ابو زید البخلي):

ناوی (احمد بن سهل بلخی)، ناسراوە بە ئەبوزەید[١] لە ساڵی (٢٣٥ك/٨٤٩ز) لەدایك بووە[٢]. لە (٣٢٢ك/٩٣٤ز) ماڵئاوایی لەژیان کردووە[٣]. دانراوەکانی

---

[١] - معجم الادباء، ج ٢، ص ٨٢.

[٢] - البلدان: ئەم کتێبە زانیاری دەربارەی هەواڵی وڵاتان، پێوانی نێوان ناوچەکان و باروودۆخ و داب و نەریتی ئاینیی، دەسەڵاتدارانی ناوچەکان تێدایە، کە بەشاری بەغدا دەستی پێدەکا، پاشان ناوچەکان دەکاتە چوار چارەك و بڕی خەراج و فەتح کردنی ناوچەکان لەخۆوە دەگرێت. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە کتێبەکە.

[٣] - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٤٨.

[٤] - معجم الادباء، ج ١، ص ٦٠١.

[٥] - یحي زهراني و سعید العسري، نصوص لم تحقق من کتاب اخبار البلدان، (د/م: ٢٠٠٣)، ص ١٢.

[٦] - علي عبدالله الدفاع، المرجع السابق، ص ٨٣؛ طه عبدالمقصور، المرجع السابق، مج ١، ص ٢٧٢.

[٧] - الفهرست، ص ٨٣؛ معجم الادباء، ج ١، ص ٢٠٦.

[٨] - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٥٦؛ مج ٢، ص ٤٢؛ مج ٣؛ ص ١٦٥.

فەلسەفی و ئەدەبی بوون[٤]. کە نزیکەی شەست بەرهەمن[٥]، جگە لـە کۆمـەڵێك لەو نامانەی کە کۆیکردوونەتەوە بە بەڵگەنامەی چاخەکەی دەناسرێت بەیەکـەوە لەکتێبی (رسائل)دایناوە[٦]. بەرهـەمی (صـور الاقـالیم)ی بەیەکـەمین کتـێبی قوتابخانەی کلاسیکی جوگرافیناسە عەرەبییەکان دادەنرێت، کـە وێنـەی هەرێمـە ئیسلامییەکانی لە شێوەی نەخشەنامە (اطلس) کێشاوە[٧]. یاقوت بەرهەمەکەی لەزانیاری ئەم زانایە بێ بەش نەکردووە[٨].

## هـ- (الجیهانـي):

ناوی (احمد بن محمد بن نصر الجیهانی)یە[٩]، زێد و مێژوو و لەدایك بوونی نادیارە، بەڵام لە ساڵی (٣٦٧ك/ ٩٧٧ز) لـە پلـەی وەزیریـەتی دوورکەوتۆتـەوە[١٠]. کـە وەزیری (نصر بن احمد)(٣٠١-٣٣١ك/٩١٣-٩٤٢ز) سامانی خـاوەنی خوراسـان بـوو، هەنـدێ لـە بەرهەمـەکانی وەکـو (العهـود الخلفـاء، ایـین، المسـالك و الممالك)...هتد[١١]. یاقوت بۆ کۆکراوەکەی پشتی بە زانیارییەکانی بەستووە[١].

---

(١) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ١٢٢؛ معجم الادباء، ج ١، ص ٣٧٤؛ الداودي، المصـدر السـابق، ج ١، ص ٤٢.

(٢) - نقولا زیاده، المرجع السابق، ص ٣١؛ علي عبدالله الدفاع، المرجع السابق، ص ٩٢.

(٣) - الداودي، المصدر السابق، ج ١، ص ٤٤.

(٤) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ٢٢٤؛ شاكر مصطفى، تاریخ العـرب المؤرخون، (بـیروت: ١٩٧٩)، مـج ١، ص ٧٨.

(٥) - معجم الادباء، ج ١، ص ٣٧٥.

(٦) - شاكر مصطفى، المرجع السابق، مج ١، ص ٧٨.

(٧) - احمد سوسة: الشریف الادریسي في الجغرافیة العربیة، (بغداد: ١٩٧٤)، باب١، ص ٦٨.

(٨) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ٢، ص ١١٥؛ مج ٤، ص ٣٣٣.

(٩) - معجم الادباء، ج ١، ص ٥٩٦؛ ادم متز، الحضارة الاسلامیة في قرن الرابـع الهجـري، نقلـه الى العربیـة: عبدالهادي ابو ریدة، (بیروت: ١٩٦٧)، مج ٢، ص ٨.

(١٠) - علي عبدالله الدفاع، المرجع السابق، ص ١١٠.

(١١) - الصفدي، المصدر السابق، ج ٨، ص ٣٦.

و- (الاصطخري):

ناوی (ابو اسحاق بن ابراهيم بن محمد بن الفارسی)یە[٢]، لە ساڵی (٣٤٦ك/٩٥٢ز) مردووە[٣]. گەشتی بۆ ناوچە جیاجیاكان كردووە، لە ساڵی (٣٠٣ك/٩١٦ز) لە (ئوستوخر)[٤] دەرچووە[٥]، بەرهەمەكەی (المسالك و الممالك)[٦] بۆتە هەوێنی بەرهەمەكەی یاقوت[٧].

ز- (ابن حوقل):

ناوی (محمد بن علی بن ابی قاسم النصيبينی)، ناسراو بە (ابن حوقل البغدادی)[٨]، یەكەمین سەرنجی بۆ ژیان لە نەسیبینی هەرێمی جەزیرەبووە، لە ساڵی (٣٣١ك/ ٩٤١ز) بۆ بەغدا بەڕێكەوتووە، پاشان دەستی بە گەشتەكانی كردووە[٩]، تێینی گەران وسەفەرەكانی لە كتێبی

---

(١) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٠٩.

(٢) - حاجي خليفه، المصد ر السابق، ج ٥، ص ٩.

(٣) - احمد سكري، موسوعة االعلماء العرب، (عمان: ٢٠٠٤)، ص ١٣٤.

(٤) - ئوستوخر:كۆنترین وبەناوبانگترین كورە وشاری هەرێمی فارسە نێوانی لەگەل شاریشیرازدونزە فەرسەخە.معجم البلدان، مج١، ص٢٠٩..

(٥) - حكيم احمد مام بكر، المرجع السابق، ص ٥٨.

(٦) - ا(المسالك و االممالك) ئەو بەرهەمە جوگرافیە وەك دراسەتێكی زاستی باسی هەرێمەكانی زەوی دەكات، كە مەبەستی هەرێمە ئیسلامییەكانە، دابەش كردووە بۆ بیست بەش، جگە لە پێوانی ناوچەكان و شار و رووبار و گرنگی دان بە نەخشە، وەكو ئەوەیە وێنەی گرتبێ، جگە لەزانیاری وردتر، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: كتێبەكە.

(٧) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٣؛ ج ٢، ص ٦٢؛ ج ٣، ص ١٧؛ ج ٤، ص ٦.

(٨) - علي عبدلله الدفاع، المرجع السابق، ص ١٠٣.

(٩) - كراتشكوفسكي، المرجع السابق، ق ١، ص ٢٠٠.

**(صورة الارض)[1] خستۆتە ڕوو، لە ساڵی (٣٦٧ك/٩٧٧ز) مردووە[2]. زانستی بەرهەمەکەی لەکتێبی یاقوت بەکارهاتووە[3].**

**ح- (المقدسي):**

**ناوی (شمس الدین بن محمد بن ابي بكر البناء)[4]، لە نێوان ساڵانی (٣٣٤-٣٣٥ك/٩٤٦-٩٤٧ز) لەدایك بووە، نازناوی جۆراوجۆری هەبووە، وەکو مەقدسی، شامی، بەغدادی..هتد[5]. بە بازرگانی خەریك بووە، بۆ زۆر ناوچە گەڕاوە، زانیاری وەرگرتووە و لە کتێبی (احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم)[6] کۆی کردۆتەوە، کە ناوبانگی زۆری پێوە دەرکردووە و یاقوتیش نزیکەی پەنجا جار زانیارییەکانی لە کتێبەکەی خستۆتەڕوو[7]. لە ساڵی (٣٧٥ك/ ٩٨٥ز) کۆتایی بەژیانی هاتووە[8].**

---

(1) - (صورة الارض): زانیاری ئەم کتێبە دەربارەی وڵاتانی ئیسلامیە، بە شێوەی تایبەت لەسەر شێوازی بە هەرێم کردنی ناوچەکان کە هەواڵ و زانیاری مێژوویی و زانستی جۆراوجۆر، داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی پەیوەست بە میتۆدی ورد و بەڵگەی بینین تێدایە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کتێبەکە.

(2) - علي عبدالله االدفاع، المصدر السابق، ص ص ١٠٣- ١٠٤.

(3) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٤؛ مج ٣، ص ٤١٨؛مج ٤، ص ٣٢٤.

(4) - الزركلي، المرجع السابق، ج ٥، ص ٣١٢. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: المقدسي، احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم، علق علیه: محمد ضناوي، (بیروت: ٢٠٠٣)، مقدمة محقق، ص ٥.

(5) - فلاح شاكر، المقدسي، (بغداد: ١٩٨٨)، ص ٧.

(6) - (احسن التقاسیم في معرفه الاقالیم): ئەم بەرهەمە زانستی و جوگرافی ئابووری و مێژووی و کۆمەڵایەتی و سیاسی مەملەکەتی ئیسلامی لێ بەدی دەکرێت. کە دابەشی دەکات بۆ سەر چواردە هەرێم، کە هەموو بارودۆخی هەرێمەکان دەخاتە ڕوو، پێناسەی ناوچە و شار و گوند و ماڵ، خاوەنە مێژووییەکان و جیاوازی ڕەگەز و ئاین و زمان ومەزهەب دەکات، تەنانەت باس لەجۆری خۆراك، کەموکوڕییەکان دەکات. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کتێبەکە.

(7) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٣؛ مج ٢، ص ٦٠؛مج ٣، ص ١٦٧؛ مج ٤، ص ١٨.

(8) - فلاح شاكر، المرجع السابق، ص ص ٧-٨.

## ط- (المهلبي):

**ناوی (حسن بن احمد او محمد مهلبی) بە خاوەنی کتێبی (المسالك و الممالك) ناسراو بە (العزیزی) [1] دانراوە، ئەمەش دانراوێکە بۆ خەلیفەی فاتمی (العزیز)[2] کە لە ساڵی (٣٨٠ك/ ٩٩٠ز) مردووە[3]. یاقوت چەند جارێك ناوی موهەلەبی و کتێبەکەی دەهێنێت، کە چۆن سوودی لێوەرگرتووە[4].**

## ی - (ابو عبید البکري):

**ناوی (ابوعبید بن عبدالله بن ابی زید محمد بن ایوب البکری) ناسراو بە ئەبوعوبەیدەی ئەندەلوسی[5]، لەساڵی (٤٣٢ك/ ١٠٤٠ز) لەدایك بووە، لە ساڵی( ٤٨٧ك/ ١٠٩٤ز) کۆچی دوای کردووە[6].**

---

(١) - ئەم سەرچاوەی موهەلەبی (المسالك و الممالك) بە سەرچاوەیەکی جوگرافی وەسفی دادەنرێت، چونکە لەباس کردنی هەرێم و شارەکان زیاتر تیشك خراوەتەسەر لایەنی جوگرافیاکەی، ئەگەرچی ئەوەی ئێستا لەبەردەستە تەنیا لە کتێبەکانی یاقوت و (ابوالفداء) کۆکراوەتەوە جگە لەمەش هەندێ لەدەست نووسەکەی دۆزراوەتەوە، لێکۆلەرەوان ئاماژە بەوە دەکەن باس لە یەهودی و فەتح کردنی ناوچەکانی میسر وشام دەکات، هەروەها گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆ مێژووی سودان .بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە :المهلبي، المسالك و اللمالك، جمعه و عقله علیه: تیسر خلف، (دمشق: ٢٠٠٦)، صلاح الدین المنجد، قطعة من الکتاب المفقود المسالك و الممالك، مجله معهد المخطوطات العربیة، مج٤، ج١، ص ص ٤٦-٦٦، ادم متز، المرجع السابق، مج ٢، ص ١٦.

(٢) - عزیزی فاطمي: دووەمین خەلیفەی فاتیمەکانە لە میسر ناوی ئەبو مەنسووری کوڕی نزار کوڕی معد لە ساڵی (٣٤٤ك/٩٥٥ز) لە دایك بووە، لە ساڵی (٣٦٥ك/ ٩٧٥ز) بووەتە جێنشینی خەلیفە، هەر لەم ساڵەش بۆتە خەلیفە تا ساڵی (٣٨٦ك/ ٩٩٦ز) کۆچی دوایی دەکات. ابی عبدالله قضاعي، تاریخ القضاعي، (معرف باعین المعارف)، تحقیق: احمد فریق المزیدي، (بیروت: ٢٠٠٤)، ص ١٦٥.

(٣) - حاجي خلیفه، المصدر السابق، ج ٥، ص ٢٢٥؛ احمد سوسه، المرجع السابق، باب١، ص ١٧٤،

(٤) - بۆنموونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٨٤؛ مج ٢، ص ٩؛ مج ٤، ص ٢٠٣.

(٥) - البکري، المسالك و الممالك، حققه: جمال طلبه، (بیروت: ٢٠٠٣)، مقدمة محقق، ص ٥.

(٦) - الصفدي، المصدر السابق، ج ١٧، ص ١٥٦؛ الخوانساري، روضات الجنات في الاحوال العلماء و السادات، تحقیق: اسدالله اسماعلیان، (تهران: د/ت)، ج٥، ص ١١٧٠.

بەرهەمەکانیشی وەکو (اعیان النباتات، التدریب و التهذیب في ضروب احوال الحروب، معجم ما استعجم، المسالك و الممالك)[١]. یاقوت ئاماژە بە سوود وەرگرتنی لە هەردووبەرهەمی (معجم مااستعجم)[٢] و(المسالك و الممالك)[٣] دەکات. زیاتر لە شەست جار زانیارییەکانی ئەم کتێبانەی خستۆتە روو[٤].

*****سەرچاوەکانی زمانەوانە جوگرافی ناسەکان:**

**أ- (الاصمعي):**

ناوی (ابوسعید بن عبدالملك بن قریب بن عبدالملك بن علی الاصمعی)[٥] لەشاری بەسرە لە نێوان سالآنی (١٢٢-١٢٣ك/٧٤٠-٧٤١ز) لە دایك بووە[٦]. لە نێوان سالآنی (٢١٦-٢١٧ك/٨٣١-٨٣٢ز) مردووە[٧]. لە بواری زمان و رێزمانەوە

(١) - الصفدي، المصدر السابق، ج ١٧، ص ١٥٦؛ عبدالله یوسف الغنیم، مصادر البکری و نهجه الجغرافي، (القاهرة: ١٩٧٤)، ص ٢٤.

(٢) - معجم مااستعجم: ئەم کتێبە لە شێوەی کۆکراوەیەکی زمانەوانی و جوگرافیە، چونکە جگە لە زانیاری لەبارەی جوگرافیای ناوچە شوێنەوارییەکان، شی کردنەوەی زمانەوانیشی بۆ کردوون. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: معجم مااستعجم، حققه: جمال طلبه، (بیروت: ١٩٩٨).

(٣) - المسالك و الممالك: باس لە دروست بوونی زەوی و ئاسمان و خەلق کردنی ئادەم و نەوەکانی، هەواڵی عەرەبەکان لە پێش ئیسلام و دوای هاتنی ئیسلام دەکات، جگە لە باسکردنی زەوی و رووبار دەریا و حەوت هەرێمەکەی زەوی وبیروڕای فەلەکناسە یۆنانییەکان، هەروەها بەگشتی مەملەکەت و فەرمانڕەواکان باس دەکات. بڕوانە، کتێبەکە.

(٤) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٠٠؛ مج ٢، ص ٣٣؛ مج ٣، ص ١٤١؛ مج ٤، ص ١٧٦.

(٥) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ١٥؛ ابن خلکان، المصدر السابق، مج٣، ص ١٧٥.بڕوانە: الزبیدي الاندلسي، طبقات النحویین واللغویین، تحقیق: محمد ابی الفضل، (القاهرة: د/ت)، ص١٦٧.

(٦) - ابن خلکان، المصدر السابق، مج٣، ص ١٧٥.

(٧) - الداودي، المصدر السابق، ج١، ص ٣٥٥؛ عبدالحمید شلقاني، الاصمعي اللغوي، (القاهرة: ١٩٨٢)، ص ١٠٢.

زانستی زۆری پێ بووە، جگە لەمە بە کەسێکی خاوەن چیرۆك و خولیای هۆنراوە یان شیعر دادەنرێت[1]. بەرادەیەکی یەکجار زۆر زانیاریەکانی لەلای یاقوت بەکارهاتووە، بەتایبەت ئەو بابەتانەی پەیوەستن بە شیکردنەوەی زمانەوانی ناوی ناوچەکان[2].

**ب- (ابن درید):**

ناوی (ابوبکر محمد بن حسین بن درید الازدی)[3]، سالی (٢٢٣ك/ ٨٣٧ز) لە بەسرە لەدایك بووە، لە عەممان پێگەیشتووە[4]، شاعیرێکی زمانزان بووە و لە هۆنراوەکانی زانیاری ڕەنگی داوەتەوە[5]، خاوەن بەرهەم بووە(الاشتقاق،الامالی ، الانباء، الانواء، البنین والبنات .، تقویم اللسان ، التوسیط، جمهرة اللغة، خیل الصغیر ، خیل الکبیر ، رواد العرب، رواة العرب،سلاح ، غریب القران، فعلت وافعلت)[6] و لە سالی (٣٢١ك/٩٣٣ز) مردووە[7]. شی کردنەوە زمانەوانییەکان و هۆنراوە و زانیاری تر لەکۆکراوەکەی یاقوت بەرچاو دەکەوێت[8].

**ج-(الهمداني):**

ناوی (حسن بن محمد بن یعقوب الهمدانی) بە ئەبی یەعقوبی هەمەدانی رەچەڵەکناس ناسراوە، لەشاری(صنعاء) سەنعا سالی (٢٨٠ك/٨٩٣ز)

---

(١) - الانباري، نزهة الباء في طبقات الادباء، تحقيق: ابراهيم سامرائي، (عمان: ١٩٨٥)، ص ١٠٠.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ٧٧؛ مج ٢، ص ٥٨؛ مج ٣، ص ٢٤.

(٣) - معجم الادباء، ج ٥، ص ٢٩٥؛ الزبيدي الاندلسي، المصدر السابق، ص ١٨٣.

(٤) - الانباري، المصدر السابق، ص ١٩٣.

(٥) - ابن دريد، الاشتقاق، تحقيق: عبدالسلام محمد، ( القاهرة: ١٩٥٨)، مقدمه محقق، ص ٢٢.

(٦) - معجم الادباء، ج٥، ص٣٠١.

(٧) - الانباري، المصدر السابق، ص ١٩٣.

(٨) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج١، ص ٦٤؛ مج ٢، ص ٧١؛ مج ٣، ص ٥٣.

هاتۆتەدونیاوە[(١)]. هەر لـە گرتووخانـەی ئـەم شـارە لـە سـاڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) مردووە[(٢)]. بەرهەمی هەبووە وەك (الابل، اخبار، اسماءالشهور، الايـام، الاكليـل، الانساب، جزيرة العرب، صفة جزيرة العرب، عجائب اليمن)..هتـد[(٣)]. يـاقوتيش باسی لەکتێبی (صفه جزيره العـرب) دەکـات، کەلـە نـاوی وڵاتـان و نيشـتەجێ بووەکانی پێکهاتووە[(٤)]. هەربۆيە بۆ بە زانست بوونی کتێبەکـەی زانيارييـەکانی بەکارهێناوە .[(٥)]

## د- (ابوسعيد السيرافي):

ناوی (ابوحسن بن عبدالله المرزبانی سيرافی)[(٦)]، سـاڵی (٢٨٠ك/ ٨٩٣ز) لـەدايك بووە لە (٣٦٨ك/٩٨٧ز) مردووە[(٧)]. زانيارييەکانی دەربارەی ڕێزمانزانی کەم وێنە بووە[(٨)]. بەرهەمی هەبووە وەك (کتـاب شـرح سـيبويه، الفـات القطـع، الاخبـار، النحويين و البصريين، كتاب الشواهد)[(٩)]، ياقوت زۆر سوودی لێوەرگرتووە[(١٠)].

---

(١) - الهمداني، صفة جزيرة العرب، تحقيق: محمد علي الاكوع، (بيروت: ١٩٨٣)، مقدمه محقق، ص ص ٧-٨.

(٢) - ابن القفطي، اخبار العلماء، ص ١١٣.

(٣) - السيوطي، المصدر السابق، ج ١، ص ٤٨٩.

(٤) - معجم الادباء، ج ٢، ص ٤١٣.

(٥) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٩٩؛ مج ٢، ص ٩٧؛ مج ٣، ص ١١٢.

(٦) - معجم الادباء، ج٢، ص ٥٤؛ الزبيدي الاندلسي، المصدر السابق، ص ١١٩.

(٧) -كـارل بروكلمـان، تـاريخ الادب العربـي، نقلـه الى العربي:عبـدالحليم النجـار، (القـاهرة: د/ت)، ج٢، ص ١٨؛عمرفروخ، تاريخ الادب العربي، ج٢، ص ٥١٥.

(٨) - الانباري، المصدر السابق، ص ٢٨٨.

(٩) - ابن خلكان، المصدر السابق، مـج٢، ص ٧٨؛ معجـم الادبـاء، ج ٢، ص ٥٠٧؛ كـارل بروكلمـان، المرجـع السابق، ج ٢، ص ١٨٧.

(١٠) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج١، ص ١٠٥؛ مج ٢، ص ٣١٩؛ مج ٣، ص ٢٦٥.

**هـ-(الغندجانی):**

**ناوی (محمد بن ابوندا غندجانی) ناسراوبە (اسود غندجانی[١])، بەرهەمەکانی وەك (الرد علی السیرافي، في شرح الابیات الکتاب، الرد علی ابی علی في تذکرة، الرد علی ابن الاعرابی، اسماء الاماکن)...هتد[٢]. گێڕەوەیەکی بەتوانا بووە، یاقوت ئاماژە بەوە دەکات، کە زۆربەی ریوایەتەکانی لە غندجانی وەرگرتووە[٣]، لەبەرهەمەکەی ئەمە ڕوون دەبێتەوە[٤].**

**و-(ابو زیاد الکلابي):**

**ناوی (یزید بن عبدالله حره) عەرەبێکی کۆچەری و خاوەن سەرچاوەی جۆراوجۆر بووە، لەوانە (کتاب النوادر، الفرق، الابل، خلق الانسان)[٥]، بەلام سەرچاوەکان ئاماژە بەمێژووی لەدایك بوونی مردنی ناکەن. یاقوت بە زانیارییەکانی ئەم زانایە کتێبەکەی دەوڵەمەند دەکات[٦].**

**ز-(هشام الکلبي):**

**ناوی (هشام بن محمد بن سائب کلبی البشری)، ناسراو بە ئەبو منذري ئەخباری، کەسایەتییەکی راستگۆ و جێگای باوەڕ بووە، بۆ گێڕانەوەی هەواڵی عەرەب و بەرەچەڵکناسیش ناسراوە[٧]. لە ساڵی (٢٠٤ك/ ٨١٧ز) مردووە.بەرهەمەکانی**

---

(١) - معجم الادباء، ج ٥، ص ١٠٨.

(٢) - السیوطي، المصدر السابق، ج١، ص ٤٩٩؛ الصفدي، المصدر السابق، ج٢١، ص ٢٩٣.

(٣) - معجم الادباء، ج٥، ص ١٠٨.

(٤) - بۆنمونە بڕوانە: معجم االبلدان، مج ١، ص ٥٢؛ مج ٢، ص ٢٠؛ مج٣، ص ٥؛ مج ٤، ص ٥٠.

(٥) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ٧٠.

(٦) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ١٠١؛ مج ٢، ص ٢٠؛ مج٣، ص ٥؛ مج ٤، ص ٥٠.

(٧) - معجم الادباء، ج٥، ص ٥٩٤؛ الانباري، المصدر السابق، ص٧٦.

نزیکـــەی (١٥٠) بەرهـــەم بـــووە[١]. زانیارییـــەکانی بەرادەیـــەکی زۆر لـــە ئینسکلۆپیدیایەکەی یاقوت رەنگی داوەتەوە[٢].

## ح-(الزمخشري):

ناوی (محمد بـن عمـر بـن محمـد الزمخشـری)[٣] یـە، لـە نێـوان سـالآنی (٤٦٧-٥٣٨ك/١٠٧٤-١١٤٢ز) ژیاوە. لە (زەمەخشەر)[٤] پێگەیشتووە، پاشان بـەرەو بەغدا چووە[٥]، بەرهەمـەکانی وەك (الکشـاف مـن حقیقـة التنزیـل في التفسـیر، الامکنه الجبال و المیاه، المفصل في النحـو)..هتـد[٦]. نـەوەد جـار زیـاتر یـاقوت زانیارییەکانی بۆ فەرهەنگە زانستیەکەی بەکارهێناوە[٧].

## ط-( العمراني):

ناوی (علی بن محمد بن احمد بن ابو حسن عمرانی) لـە سـالّی (٥٦٠ك/١١٦٥ز) مردووە[٨]، هۆنراوەو بەرهەمی زۆر بـووە، لەوانـە (المواضـع البلـدان، في التسـفیر

---

(١) - ابن النديم، المصدر السابق، ص ١٥٥.

(٢) - بۆنمونه بروانه: معجم البلدان، مج١، ص ٨١؛ مج٢، ص ٧؛ مج ٣، ص ٢٤؛ مج ٤، ص ٩.

(٣) - معجم الادباء، ج ٥، ص ٤٨٩. بـۆ زیـاتر زانیـاری بروانـە: دلـدار غفـور محمدامین، التفسـیر الکشـاف الزمخشري، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، (اربیل: ١٩٩٦)، ص٤.

(٤) - زەمەخشەر: گوندێکی گەورەیـە لەگونـدەکانی خـوارەزم. ابـو الفـداء ، تقـویم البلـدان، (بـاریس: ١٨٤٠)، ص٤٧٩.

(٥) - السیوطي، طبقات المفسرین، تحقیق: علي محمد عمر، (القـاهرة: ١٩٧٠) ص ١٧٠؛احمد احمد الحوفي، الزمخشري، (القاهرة: ١٩٦٦)، ص ٣٠.

(٦) - الانباري، المصدر السابق، ص ٢٩٠؛ السیوطي، طبقات، ص ١٢١.

(٧) - بۆنمونه بروانه: معجم البلدان، مج١، ص ٦٦؛ مج ٢، ص ١١٤؛ مج ٣، ص ٢٢٩.

(٨) - الداودي، المصدر السابق، ج ١، ص ٣٠ ؛الخوانساري، المرجع السابق، ج ٥، ص ٢٢٩.

القران، الاشتقاق الاسماء)[١]، زانیارییەكانیشی بەرچاوە لە هەموویەشەكانی كتێبەكەی یاقوت[٢].

ی-(ابن النجار البغدادي):

ناوی (محمد بن محمود بن حسن هبه الله محاسن النجار البغدادی)[٣] یە . یاقوت باسی لێوە كردووە، بەوەی كە مێژوونووس و ئەدیبی پێگەیشتووی لە ساڵی (٥٧٨ك/ ١١٧٩ز) لەدایك بووە[٤]. لە ساڵی (٦٣٤ك/١٢٤٥ز) مردووە، بەرهەمەكانی وەك (تاریخ بغداد ذیل علی تاریخ مدینة سلام، المتفق المفترق، معجم الشیوخ)[٥]، هەروەها یاقوت بە زانستی ئەم هاوڕێیەی بەرهەمەكانی و گێڕانەوەكانی زانیاری خۆی زیاد كردووە[٦].

ك-(حازمي):

ناوی (محمد بن عثمان بن موسي ابوبكر حازم الهمذاني) لە ساڵی (٥٤٨ك/ ١١٥٣ز) لەدایك بووە[٧]، لە هەمەدان نیشتەجێ بووە و زانیاری لەسەردەستی

---

(١) - معجم الادباء، ج ٤، ص ٢٣٠؛ الصفدي، المصدر السابق، ج ٢٢، ص ٦٢.

(٢) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٧٩؛ مج ٢، ص ٢١؛ مج ٣، ص ٢؛مج ٤، ص ٣٣؛ مج ٥، ص ١٧.

(٣) - الكتبي، فوات الوفيات، تحقيق: احسان العباس، (بيروت: د/ت)، مج ٤، ص ٣٦؛ الصفدي، المصدرالسابق، تحقيق و اعتناء، دريد ينغ، (د/م: ١٩٩١)، ج ٥، ص ٩.

(٤) - معجم الادباء، ج ٥، ص ٤٤٣.

(٥) - الكتبي، المصدر السابق، مج ٤، ص ٣٦.

(٦) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج١، ص ٥٢؛ مج ٢، ص ٢٩؛ مج ٣، ص ٢٠٢.

(٧) - الذهبي، سير اعلام النبلاء، حققه: بشار عواد، محي هلال، (بيروت: ١٩٨٦)، ج ٢١، ص ١٦٧.

**زانایانی بەغدا زیاد کردووە[١]. لە (٥٨٤ك/ ١١٨٩ز) مردووە[٢]. یـاقوتیش لـە لیستی خاوەن زانیارییەکانی کتێبەکەی دایناوە[٣].**

## ل-(ابوموسي الاصفهاني):

**ناوی (ابوموسی بن ابـی بکـر بـن عمـر ابـی عیسـی الاصـفهانی المـدینی) بـە پێشەوایەکی چەرخی خۆی دانراوە لە ئەسفەهان، ساڵی (٥٠١ك/١١٠٧ز) لە دایك بووە، لە ساڵی (٥٧٢ك/١١٧٦ز) مردووە[٤]. بەرهەمەکانی وەك (معرفة الصحابة، الطولات، تتمه الغـرين، الوظـائف البطـائف، عـرض في كتـاب علـم الحـديث)[٥]، زانیارییەکانی و گێڕانەوەکانی لای یاقوت بیست و پێنج جار دووبارە دەبێتەوە[٦].**

## م-(ابو فتح الاسكندر النحوي):

**نـاوی (نصـر بـن عبـدالرحمن بـن اسماعيـل حسـين) نەحەویـە و خـەڵکی شـاری ئەسکەندەرییەی میسر بووە، لە بەغـدا خوێندوویـەتی و گەشـتی کـردووە بـــۆ خوراسان و لە نیسابور گیرساوەتەوە[٧]. بەرهــەمی هــەبووە وەك (امكنـة الميـاه و الجبال والاثار و نواحيها[٨]) سەرچاوەکانی بەردەست ئاماژەیـان بەسـاڵی لـەدایك بوون ومردنی ناکەن .یاقوت بیرۆکەی بۆ زانستی کتێبەکەی لێ وەرگرتووە.**

---

(١) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٤، ص ٢٩٤.

(٢) - الصفدي، المصدر السابق، اعتناء: دريد ينغ، ج٥، ص ٨٨.

(٣) -معجم البلدان، مج١، ص١١.

(٤) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٤، ص ٢٨٦.

(٥) - الصفدي، المصدرالسابق، ج ٤، ص ١٧٤.

(٦) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٧٠؛ مج٢، ص ١٨٢؛ مج ٣، ص ١٥؛ مج ٤، ص ٢٣٦.

(٧) - ابن القفطي، انباه الرواة، ج ١، ص ص ٣٣٥- ٣٣٦.

(٨) - الزركلي، المرجع السابق، ج ٥، ص ٢٤.

### ن-(ابو عبيدة السكوني):

ناوی (احمد بن حسن بن اسماعيل ابو عبدالله سكونی الكندی)يە رەچەڵەك ناس و خاوەن بەرهەم بووە[1]، ياقوت ئاماژە بە بەرهەمەكەی (اسماء مياه العرب) دەكات، بەبی ئەوەی سڵی لەدايكبوون وميژووی ژيانی بكات، لەگەل ئەوەش زانياری لێوەرگرتووە[2]. لە كتێبەكەی روون دەبێتەوە[3].

### ص-(ادريس بن ابی حفصە):

ناوی (ادريس بن يحی ابی حفصە)[4] يە ياقوت لە فەرهەنگە زانستيەكەی ئاماژە بە زانيارييەكانی دەكات[5].

### ع-(ابوالاشعث الكندي):[6]

تا رادەيەك ياقوت زانيارييەكانی خستۆتە روو[7].

## ٢- بينين و هزر و تێڕامان:

بينين هۆيەكی ديكەی ياقوت بوو بۆ باسكردن و لێكۆڵينەوە لەو بابەتانەی كەخۆی گەرەكی بووە، مرۆڤ لە رێگەی چاو وێنەی و تێبينی لە زاكيرەی خۆی تۆمار دەكات، هەرواش سەبارەت بە هزر و تێڕامان، كە هەم بينين و هەم هزر و تێڕامان كەرەستەی بيركردنەوەی مرۆڤن لەتۆماركردنی تێبينەكان، ياقوتيش يەكێك لەو سەرچاوانەی كە

(١) - الصفدي، المصدر السابق، ج ٦، ص ١٩١.
(٢) - معجم الادباء، ج ١، ص ٣٤٢.
(٣) - بۆنمونە بروانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٩٤؛ مج ٢، ص ٦٨.
(٤) - ئاماژە بەزێدو مێژووی لەدايك بوونی ومردنی ناكات .الصفدي، المصدر السابق، ج ٢، ص١٢٨.
(٥) - بۆنمونە بروانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٩٣؛ مج ٢، ص ٦٠؛ مج ٣، ص ٢٤.
(٦) - ژيانی لە سەرچاوەكانی بەردەست ئاماژەی بۆ نەكراوە.
(٧)- بۆنمونە بروانە: معجم البلدان، مج ١، ص ٣٤٩؛ مج ٢، ص ٩٣؛ مج٣، ص ٧٤؛ مج ٤، ص ٣٢٦.

بەکاری هێناوە لەپڕکردنی زانیاری کتێبەکەی، تێڕامانی خۆی بۆ ناوچەکان دەربڕیوە کە ئەمەش لە ڕێگەی سوڕانەوە بۆ زۆر ناوچە و سەردان کردنیان[١].

ئەو زانیارییانەی، کە لەم ڕێگەیەوە تۆماری کردووە بۆ راستی بابەت و گۆڕانکارییەکانی، بەراوردی کردووە لەگەڵ سەرچاوەکانی تر، هەروەکو لە شاری بەرزەعەدا لەهەرێمی ئاراندا[٢]، زانیاری وولاتناس (الاصطخري)ی دەربارەی ئەم شارە خستۆتە ڕوو، پاشان گۆڕانکارییەکانی ڕۆژگاری خۆی باس کردووە.

هەروەها هەر لەم ڕێگەیەوە توانیویەتی پێوانی درێژی و ماوەی نێوان ناوچەکان، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی کە پێیدا تێپەڕیوە بپێوێت، بە جۆرێك کاتێ سەردانی شاری ئورمیە(ورمێ) لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) دەکات، نێوان لەگەڵ هەریەك لە شاری تەورێز(تبریز) و هەولێر(اربل) دیاری دەکات[٣]. هەروەها ئەو زانیارییانەی کە لەم ڕێگەیەوە بەدەستی دەهێنا، تەنیا جەختی لەسەر خودی بینینی خۆی نەکردووە، بەڵکو زانیاری لەو کەسانەش وەرگرتووە، کە سەردانی شوێنی مەبەستیان کردووە. تەنانەت لە هەندێ ناوچە ئاماژە بەوە دەکات کە پرسیاری لەو کەسانە کردووە، کە بۆ شوێنی مەبەست چوون، یان پێیدا ڕۆیشتوون[٤].

## ٣- گواستنەوە و وەرگرتنی زارەکی:

وەرگرتنی زانست و زانیاری پەیوەستە بە ئاستی ئەوکەسەی شتەکان دەگێڕێتەوە، چۆنییەتی هەڵسەنگاندنی وتەکانیان و زانستەکانیان کە گێڕاویەتیەوە، کاری وەرگرەکەیە، ئەو بەرپرسە لەزانستێتی گێڕانەوەکانی.

یاقوت تا رادەیەکی زۆر پشتی بە زانستی گێرەوەکان بەستووە، جا چ خەڵکی ناوچەکان بێت، یان خاوەن زانست یا دەسەڵاتداران ...هتد، بە لەبەرچاوگرتنی وشەکانی

(١) - بروانە: ئەم لیکۆڵینەوەیە، ل ل١٣-١٤؛ پاشکۆی ژمارە (٦).
(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.
(٣) -بۆنمونە بروانە: المصدر نفسه، مج١، ص ١٥٩.
(٤) - بۆنمونە بروانە: معجم البلدان، مج١، ص ٢٤٥.

**(حدثني، ذکر، قال). ئەگەرچی رەنگ نییە هەموویان گێڕەوە بن، بەڵام دووبارە بوونەوەی وشەی (حدثني/باسبێژەکان) بەڕادەیەکی بەرچاو ئەمە بەدیار دەخات، جا ئەو گێڕەوانەش تەنیا بۆ یاقوت زانیارییەکانیان باس نەکردووە، بەڵکو هەندێ جـار بـۆ کەسـانی پـێش سەردەمی یاقوتن، بەڵام ناوبراو بۆ سوودی ئینسکلۆپیدیاکەی بەکاریهێناون.**

**هەروەها لە گێڕانەوەکانی ناوفەرهەنگی ولاّتناسی (معجم البلدان)، تەنیا لەیەك چین زانیاری وەرنەگیراوە، بەڵکو هەندێ جار خـەڵکی ناوچـەکە بـوون، وەکـو (حـدثني اهـل همدان[1]) (حدثني اهل الشـام[2]) (حکـي عـن مشـايخ الاهـواز[3]) يـا (حـدثني بعـض التجار[4]) (حدثني بعض النصاری[5]) و گێڕانەوەکانی تەنیا بۆ یەك چینی خاوەن زانست وەرنەگرتووەو لێیان ناگێڕێتەوە، بەڵکو (قال اهل النحويون[6]) (حدثني اصحاب السير[7]) (قال بعض الرواة[8]) (قال المنجمـون[9])دەر دەکەون. هەروەها هەندێ جار تێبینی ئاستی متمنانەی ئەو کەسایەتییەی کردووە، کە زانستەکەی لێوەرگرتووە، وەکو (حدثني من اثق به[10]). جاری واش هەبووە تەنیا راستییەکانی لەسەر قسەی یەك گێڕەوە نەچەسپاندووە، بەڵکولە (حدثني غير واحد[11]) دوای ئەوەی زانیارییەکەی لێ وەرگرتوون، پاشان هەوڵی داوە ڕوانینی خۆی بۆ بابەتەکە دەربڕێت وشـەی (أظنـه)[12]دەبینرێـت، پاشـان لەگـەڵ**

---

(1) - بۆنموونە بڕوانە: معجم البلدان ، مج١، ص ١٦٣.

(2) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ١٦٨.

(3) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٢٨٦.

(4) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٢٠٦.

(5) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٨.

(6) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٨٩.

(7) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه مج١، ص ١٨٣.

(8) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١ ص ٥١.

(9) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٢٨٣.

(10) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج١، ص ٣١٤.

(11) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه ، مج١، ص ٣٦٦.

(12) - بۆنموونە بڕوانە: المصدر نفسه، مج٢، ص١٢٩، ص١٧١.

سەرچاوەکانی تر بەراوردیان دەکات هەروەکو دەڵێ: (فهذا الذي شاهدته و ضبطه لكل ما يحكى[١]) یاخود گومانی لەهەندێ زانیاری هەیە، بۆیە دەڵێت:(وهذا قول لا ارتضيه)[٢].

## ٤- سەرچاوەکانی زانیاریی لەبارەی ناوچە کوردو کوردنشینەکان:

وەك ئاشکرایە یاقوت پشتی بەسەرچاوەی جۆراوجۆر وزۆر بەستووە، کە لە ناوەرۆکەکەیدا ئەمە بەدیار دەکەوێت، بەڵام هەندێ جار تەنیا ناوی خاوەن بەرهەم دەهێنێت، بۆیە نازانرێت کام سەرچاوەی ئەو کەسایەتییە زانستییەیە، چونکە زۆربەیان خاوەنی کۆمەڵێ دانسقی زانستی و ئەدەبی جۆراوجۆرن، ئەگەرچی هەندێ جار ناوی بەرهەمەکەشی لەگەڵی دەهێنێت، بەڵام ئەمە بە شێوەیەکی تایبەتییە نەك گشتی، یاخود هەندێ جار زانیاری لەبەرهەمە زانستییەکان وەرنەگرتووە، بەڵکو گێڕانەوەکانیان سوودی لێوەرگیراوە، لە ناوچە کوردنشینەکانیش ئەمە دووبارە دەبێتەوە، سەرچاوەو ناوی خاوەن سەرچاوەکانی زانیاری بۆ ناوچەکورد وکوردنشینەکانیش هەمەجۆرن، بەڵام هەندێکیان کە دووبارە دەبنەوە و بەشێکیشان گرینگن بۆ مێژووی کورد وەکو ئەمانە[٣]:

### أ-(الواقدي):

ناوی (محمد بن الواقد المديني) لە ساڵی (١٣٠ك/٧٤٧ز) لەدایك بووە، لە( ٢٠٧ك/ ٨٧٠) ز مردووە[٤]. زانیاری زۆری لەسەر ژیانامەی پێغمبەر (صلى الله عليه وسلم)و بەرەنگاربوونەوەو شەرەکانی ئیسلام، هەروەهاجیاوازی لەبارەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەحکامی شەرعی و هەواڵەکان هەبووە[٥]، ئەم بابەتانە بەگشتی لەبەرهەمەکانی، بەرچاودەکەون وەك (اخبار مكة، كتاب طبقات، كتاب فتوح

---

[١] - بۆنمونە بروانە: معجم البلدان ، مج ١، ص ١٨٣.
[٢] - بۆنمونە بروانە: المصدر نفسه، مج٤، ص١٥٤.
[٣] - بروانە: پاشکۆی ژمارە (٥).
[٤] - معجم الادباء، ج ٥، ص ٣٩٤.
[٥] - ابن النديم، المصدر السابق، ص ١٥٧.

**الشام و العراق..هتد)[١]. یاقوت زانیاری زۆری دەربارەی فەتح کردنی ناوچەکان لێوەرگرتووە، بەتایبەتی لەناوچە کوردییەکان، وەکو لەهەرێمی جەزیرەدا بەدیار دەکەوێت[٢].**

**ب-(المدائني):**

**ناوی (ابو حسن علی بن محمد بن عبدالله المدائنی) لە ساڵی (١٣٥ك/٧٥٢ز) دایك بووە، لەساڵی (٢١٥ك/٨٧٨ز) کۆچی دوای کردووە[٣]. بەرهەمی وەکو (اخبار القریش، في اخبار الخلفاء، في اخبار النسا، في فتوح اخبار العرب...هتد)[٤] هەبووە، زانیارییەکانی لە فەتح کردنی ئازەربایجان بەدی دەکرێت[٥].**

**ج- (السرخسي):**

**ناوی (احمد بن طیب السرخسي)، ناسراو بە (فرانقی[٦]) ی ڕەوانبێژ و خاوەن بەرهەم، لە ساڵی (٢٨٦ك/٨٩٩ز) مردووە[٧]. بەرهەمەکانی وەکو (کتاب السیاسة، الدخل في صناعة النجوم، کتاب الموسیقي الکبیر، الموسیقي الصغیر، المسالك و الممالك، رحلة المعتضد[٨]) یاقوت زیاتر ئاماژە بە (الرحلة المعتضد) دەکات، بەتایبەتی لەناوچە کوردییەکانی هەرێمی جەزیرە[٩].**

---

(١) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ١٥٨؛ معجم الادباء، ج ٥، ص ص ٣٩٤-٣٩٥.
(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٤.
(٣) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ١٦١.
(٤) - معجم الادباء، ج٤، ص ٢٢٧.
(٥) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٧.
(٦) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ٤٢١؛ معجم الادباء، ج١، ص ٢١٩.
(٧) - الصفدي، المصدر السابق، ج٧، ص ٥.
(٨) - الزرکلي، المرجع السابق، ج١، ص ٢٥.
(٩) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج١، ص ١٣١، ص ٣١٢ ؛مج ٥، ص ٢٨٨.

## د- (البلاذری):

ناوی (ابو حسن بن يحي بن جابر بن داود البلاذري[١]) لەشاری بەغدا لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەمی کۆچی لەدایك بووە، بە شاعیر و گێڕەوەو ڕەچەڵەکناس ناسراوە[٢]، لە ساڵی (٢٧٩/٨٩٢ز) مردووە[٣]. بەرهەمەکانی وەکو (کتاب البلدان الصغیر و الکبیر، الاخبار و الانساب، معهد اردشیر، ترجمة الشعریة[٤]).

بەڵام یاقوت تەنیا سوودی لە کتێبی (فتوح البلدان[٥])بینیوە[٦]، لەهەموو سەرچاوەکان زیاتر پشتی پێبەستووە، بەتایبەتی لەکاتی باسکردنی پرۆسەی فتوحاتی ناوچە کوردنشینەکان[٧].

## هـ- (ابن الفقیه الهمذاني)[٨]:

لە باسی ناوچەجیاجیاکانی کوردنشینەکان زانیاریەکانی دەبینرێت، وەکو لە شاری بەرزەعەدا بەرچاو دەکەوێت[٩].

---

(١) - ابن الندیم، المصدر السابق، ص ١٠٨. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: البلاذری، فتوح البلدان، حققه: رضوان محمد رضوان، (بیروت: ١٩٧٨)، مقدمة محقق، ص ص ٧- ١٦.

(٢) - معجم الادباء، ج٢، ص ٥٠.

(٣) - الزركلي، المرجع السابق، ج١، ص ٢٦٧.

(٤) - الصفدي، المصدر السابق، ج٨، ١٥٧؛ الزركلي، المرجع السابق، ج١، ص ٢٦٧.

(٥) - بلدان: یەکێکە لە بەرهەمەکانی بەلازری بە(بلدان) ناسراوە، زانیاری تێروتەسەلی دەربارەی فتوحاتی ئیسلامی بۆ هەموو ناوچەکانی تێدایە، لەگەڵ دیاری کردنی دیوانەکان و ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: کتێبەکە.

(٦) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٢١.

(٧) - بۆزانیاری زیاتر دەربارەی ڕێژەکەی بڕوانە :پاشکۆی ژمارە( ٥ ).

(٨) – بڕوانە: ل ٣١، ئەم لێکۆڵینەوەیە، .

(٩) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.

## و-(البلخي)[(١)]:

له‌وه‌سفی هه‌رێمی خۆزستان(اهواز) ئاماژه به زانیارییه‌كانی كراوه[(٢)].

## ز- (مسعر بن مهلهل):

ناوی (ابودلف بن مسعر بن مهلهل) ناسراو به خه‌زره‌جی[(٣)]، ڕه‌چه‌ڵه‌كی بۆ هۆزی خه‌زره‌جی ده‌گه‌ڕێته‌وه، ئه‌و هۆزه ڕۆڵێكی گرنگیان له‌شاری مه‌دینه بینیوه[(٤)]. ساڵی له‌دایك بوونی نادیاره، به‌ڵام سه‌ره‌تای گه‌شته‌كانی له ساڵی (٣٣٣ك/ ٩٤٣ز) ده‌ستی پێكردووه[(٥)]. سه‌ردانی ناوچه جیاوازه‌كان ده‌كات[(٦)].

یاقوتیش سوودی له زانیاریی گه‌شته‌كانی وه‌رگرتووه، ئاماژه به به‌رهه‌مه‌كه‌ی (الرساله[(٧)]) ده‌كات، وه‌ك له‌باسكردنی ده‌ریاچه‌ی ئورمیه به‌دیار ده‌كه‌وێت[(٨)].

## ح-(المسعودي):

ناوی (علی بن حسین بن علی بن حسن المسعودی)[(١)]، خه‌ڵكی وڵاتی مه‌غریب بووه و له‌میسر ساڵی (٣٤٦ك/ ٩٥٦ز) مردووه[(٢)]، خاوه‌ن به‌رهه‌می جۆراوجۆره، له‌وانه (مروج

---

(١) - بڕوانه: ل ٣١، ئه‌م لیكۆڵینه‌وه‌یه .

(٢) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٤٠٥.

(٣) - محمد زكي حسين، المرجع السابق، ص ٣٣، علي عبدالله الدفاع، المرجع السابق، ص ١١٧.

(٤) - حسام الدين علي غالب النقشبندي، الرسالة الثانية للمسعر بن مهلهل، گۆڤاری زانكۆی سلێمانی، ژ٨، ساڵ ٢٠٠١، ل ٢١٠.

(٥) - ادم متز، المرجع السابق، مج ٢، ص ١٥.

(٦) - محمد زكي حسين، المرجع السابق، ص ٣٣.

(٧) - (الرسالة يا الرسالة الثانية): بریتیه له سه‌رچاوه‌یه‌كی ده‌وڵه‌مه‌ندی زانستی وجوگرافی و مێژوویی و بابه‌تی سه‌رسوڕهێنه‌ر، لایه‌نی ئایینی و پزیشكیش له خۆوه ده‌گرێت.

(٨) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٥١.

الذهب ومعادن الجوهر، التنبيه والاشراف، اخبار الزمان، ذخائر العلوم، الاستذكار لما مرمن الاعصار، التاريخ، اخبار الخوارج، الرسائل، المقالات في اصول الديانات)..هتد[٣]. یاقوت لە روون کردنەوەی دەربارەی رووباری خابور، ئاماژە بە بۆچوونەکانی مەسعودی دەکات[٤].

### ط-(الاصطخري)[٥]:

دەقی زانیارییەکانی بەرچاو و دیارە لە ناوچە کوردنشینەکان، وەك لە باسکردنی هەندێ شاری رۆژئاوای هەرێمی چیاکان[٦].

### ي-(المقدسي)[٧]:

زانیارییەکانی لە ئاماژەکردن بەکوردەکانی هەرێمی فارسدا بەدیار دەکەوێت[٨].

### ك-(شيروةبن شهردار):

کوڕی شێرۆی فەنا خەسرەوە، ناسراوە (ابوشجاع الديلمي[٩])، یەکێکە لە مێژوونووسەکانی شاری هەمەدان لە ساڵی (٤٤٥ك/ ١٠٥٣ز) لەدایك بووە[١]، لە ساڵی (٥٠٩ك/١١١٥ز) مردووە[٢].

---

(١) - معجم الادباء، ج٤، ص ٥٠؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبري، تحقيق: محمود محمد، عبدالفتاح محمد، (د/م: ١٩٦٤)، ج ٣، ص ٤٥٦.

(٢) - المصدر نفسه والصفحه؛ الصفدي، المصدر السابق، حققه:احمد الارناؤوط، تركي مصطفى، ج٢١، ص ٥.

(٣) - معجم الادباء، ج٤، ص ٥٠؛ الصفدي، المصدر السابق، حققه: احمد الارناؤوط، تركى مصطفى، ج ٢١، ص ٥.

(٤) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٣٤.

(٥) - بڕوانە: ل ٣٢، ئەم لێکۆڵینەوەیە، .

(٦) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج٣، ص٤٣٩.

(٧) - بڕوانە: ل٣٣ ئەم لێکۆلینەوەیە، .

(٨) - معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

(٩) - السبكي، المصدر السابق، ج ٧، ص ١١١.

خاوەنی بەرهەمی (الفردوس)یش بووە[٣]، زانیارییەكانی سەبارەت بەهەمەدان[٤] و ناوچەكانی سەر بە هەمەدان[٥] لە زانیاری شێرەوی، لەكتێبەكەی یاقوت بێ بەش نەبووە.

## ل- (ابوسعد السمعاني):

ناوی (عبدالكريم يحی بن محمد بن منصور بن المظفر السمعاني) لەساڵی (٥٠٨ك/ ١١١٤ز) لە دایك بووە، لە (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز) مردووە[٦]. بەرهەمەكانی وەك (ذيل تاريخ بغداد، الانساب، مجمع الشيوخ[٧])، یاقوت بەشێوەیەكی زۆر بەرچاو سودی لە زانیارییەكانی وەرگرتووە، جا چ گێڕانەوەكانی بێت، یان بەكارهێنانی كتێبەكانی، ناوچە كوردییەكانیش لێی بێ بەش نەبووە، وەكو لە باسی شاری موسل دەردەكەوێت[٨].

## م- (ابن عساكر):

ناوی (ابوالقاسم بن علی بن ابی محمد حسين) ناسراو بە( ابن عساكر )و نازناوی دیمشقی بووە[٩]. لە ساڵی (٤٩٩ك/١١٠٥ز) لەدایك بووە، لە (٥٧١ك/١١٧٥ز) مردووە[١٠]، گەشتی كردووە و كتێبی بەسوودی هەبووە[١١]، وەكو (الاشراف في معرفة

---

(١) - المصدر نفسه والصفحه.

(٢) - الصفدي، المصدر السابق، ج ١٦، ص ١٢٨.

(٣) - السبكي، المصدر السابق، ج٧، ص ١١١.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١١.

(٥) - معجم البلدان، مج١، ص ١٨٠؛ مج ٣، ص ٢٦١، ص ١٨٨.

(٦) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٣، ص ٢٠٩.

(٧) - المصدر نفسه والصفحه.

(٨) - المصدر نفسه، مج٢، ص١٨٤.

(٩) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٣، ص ٣٠٩.

(١٠) - معجم الادباء، ج٤، ص ٤٠؛ ابن العساكر، المصدر السابق، مقدمه محقق، ص ١١.

(١١) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج٣، ص ٣٠٩.

**الاطراف، معجم الشيوخ، التذهيب المسملين)، ... هتد[١]. زانیارییەکانی لای یاقوت بۆ شوێن هەڵکەوتەی گوندێك لە نەسێبین(نصيبين) بەکارهاتووە[٢].**

## ن-(ابو طاهرالسلفي):

**ناوی (احمد بن محمد بن ابراهيم سلفی)[٣] ناسراو بە (الاسدين ابو طاهر سلفي)، ساڵی( ٤٧٢ك/ ١٠٧٩ز) لە ئەسفەهان هاتۆتە دونیاوە، لە (٥٧٦ك/١١٨٠ز) لە میسر مردووە[٤].**

**لەبەرهەمەکانی (معجم مشيخه الاصفهان، معجم الشيوخ بغداد، معجم السفر)[٥] زانیارییەکانی لەلای یاقوت بەدیار دەکەوێت، وەك لە باسکردنی (الزر)، ناحییەکە لە هەمەدان[٦].**

## ص-(ابن الاثير الجزري):

**ناوی (ابو الحسن بن علی بن محمد بن عبدالكريم) ناسراو بە (ابن الاثير الجزري) و نازناوەکەی (عزالدين) بووە[٧]، لە جەزیرەی ئیبن عومەر لە ساڵی (٥٥٥ك/١١٦٠ز) لەدایك بووە، لە موسل نیشتەجێ بووە[٨]. بەرهەمەکانی وەك (تاريخ الكبير(الكامل في التارخ)، اسد الغابة في معرفة الصحابة، كتاب الانساب(اللباب في تهذيب الانساب))[٩]،**

---

(١) - معجم الادباء، ج ٤، ص ص ٢٣- ٤٢.

(٢) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٦.

(٣) - ابن خلكان، المصدر السابق، مج١، ص ١٠٥.

(٤) — البغدادی، المرجع السابق، مج١، ص٨٧ .

(٥) - ا لزركلي، المرجع السابق، ج١، ص ٢١٦.

(٦) —معجم البلدان، مج٣، ص١٠٤ .

(٧) - ابن القفطي، ابناه الرواة، ج ٣، ص ٢٥٩.

(٨) - الصفدي، المصدر السابق، ج ٢٢، ص ٨٧.

(٩) - ابن خلكان، المصدر السابق، ج٣، ص ٢٦٠. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: كرفان محمد احمد، الكرد في كتابات المورخ ابن الاثير الجزري، (اربيل:٢٠٠٦)، ص ص٢٣-٢٥.

**یاقوت بڕیاسی ناوچە کوردنشینەکان لیّ ی سودمەند بووە[1]، روون کردنەوەکانی بەدی دەکەین.**

[1] — بڕغونە بڕوانە: معجم البلدان، مج٤ ص ٤٥٢.

# بەشی دووەم

## جوگرافیای هەرێمی کوردنشینەکان
## لە کتێبی (معجم البلدان)دا

تەوەری یەکەم:

- هەڵکەوتەی ناوچە کوردنشینەکان لە حەوت هەرێمەکەدا

تەوەری دووەم :

- هەرێمە کوردنشینەکان

(هەرێمی جەزیرە، هەرێمی چیاکان، هەرێمی ئازەربایجان، هەرێمی ئاران، هەرێمی ئەرمینیا، هەرێمی خوزستان )

تەوەری سێیەم :

کورد لە هەرێمەکانی تر

(هەرێمی فارس، هەرێمی خوراسان، هەرێمی کرمان، وولاتی شام ومیسر)

تەوەری چوارەم:

دیاردە سروشتی وئابووریەکانی هەرێمە کوردنشینەکان

(بەرزی و نزمی زەوی، ئاو و هەوا، باری ئابووری)

# جوگرافیای هەرێمی کوردنشینەکان لە کتێبی (معجم البلدان)دا

بۆ باسکردنی هەرێم و شوێن و جوگرافیای ناوچە کوردنشینەکان، ئەگەر بەتەنیا سەیری تێڕوانینی یاقوت بکەین، ئەوا ناتوانین هەموو ئەو ناوچانەی کە کوردی تێدا ژیاون بە شوێنی تایبەت بە کوردی دابنێین، چونکە بوونی رەگەزی کوردی لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا دادەنێت .بۆیە بۆ دیاریکردنی جوگرافیای هەرێم وناوچە کوردنشینەکان دەبێت پشت بە سەرچاوەکانی پێش یاقوت ببەستین، جا مێژوویی بێت یا بەرهەمی جوگرافی، کەوا زانیاری لێکۆڵینەوەکانی لێوە بەرهەم هاتووە، ئەگەرچی ناوبراو زۆر لە سەرچاوەکانی پێش خۆی کردۆتە هەوێنی بەرهەمەکەی، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا بە تێڕوانینی خۆی لە گەشتەکانی و گۆڕانکارییەکانی سەردەم، زانیارییەکانی کتێبەکەی دەولەمەندتر کردووە .

سەبارەت بەبۆچوونەکانیشی دەربارەی ئەو هەرێمانەی لەسەردەمانی زووەوە کوردی لیّ نیشتەجێن، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی زۆر لایەنەکانی لەخۆگرتووە، لە ڕووی جوگرافیشەوە هەڵکەوتنی ناوچەکان لە حەوت هەرێمە ئاوەدانەکەی زەوی دەست نیشان دەکات، هەروەها کاریگەریی ناوی هەرێمەکان لەرووی زمانەوانی و واتاییەوە، لەگەڵ سروشتی جوگرافیاکەی و سەرچاوە ئابوورییەکان دیاری دەکات.

# تەوەری یەکەم
## هەڵکەوتەی ناوچە کوردنشینەکان لە حەوت هەرێمەکەدا

ئەگەر سەیری حەوت هەرێمەکەی زەوی لە (معجم البلدان)دا بکەین، دەردەکەوێت یاقوت سەرەتا زانیاری لە سەرچاوەکانی گەردوونناسان و جوگرافیناسان کۆکردۆتەوە، کە ئەوانیش ناوچەکان بەسەر حەوت هەرێم دا دابەش دەکەن، هەروەها زانیارییەکانی زاناکان تێکهەڵدەکێشێت و هەر لە روانگەی ئەوانیشەوە بۆچوونەکانی خۆی دەرخستووە[١].

ئەودابەشکردنەی یاقوتیش کەکردوویەتی دەبینین لەهەرێمی چوارەم و بەشێك لەهەرێمی پێنجەمی ناوچە کوردنشینەکانی تێدا بەدیار دەکەوێت[٢]، بەتایبەتی لە هەرێمی چوارەم، کە بە گرنگترین ناوچە و نێوەندی ئەم حەوت هەرێمە دەزانرێت[٣].

ناوچەکانیش ئەمانەن: (هەمەدان، شەهرەزوور(شارەزوور)، ماسبذان (ماسەبەزان)، نصیبین (نەسێبین)، دارا، روها، ئازەربایجان، مەراغە)[٤]، ئەگەرچی یاقوت بەشێوەی تاکە تاکە ناوی ناوچەکانی هێناوە، بەلاّم لە هەندێ سەرچاوەکان بەشێوەی کۆ، واتا لەیەك شوێن زیاتر بگرێتەوە، ناوی ناوچەکان دەهێنن وەك، موسل(موصل) و ئاقور[٥]، یا کۆی ناوچە چیاییەکانی (موسل)[٦].

---

(١) - بڕوانە: ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل ل٢٨-٣٩.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ص ٣٠- ٣١.

(٣) - المسعودي، التنبه و الاشراف، (بيروت: ١٩٩٣)، ص ص ٤٧-٤٨.

(٤) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٠. هەروەها بڕوانە: ابن رسته، الاعلاق النفيسه، (ليدن: ١٨٩١)، ص ٩٧ ؛ البكري، المسالك و الممالك، ج١، ص ١٣٤. تێبینی لەناو هێنان و دووبارە بوونەوەی ناوی هەمر شارێك، کە کەوتبێتە سنووری ناوچەکوردنشینەکان ئەوا بڕوانە: بەشی سێیەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

(٥) - المقدسي، المصدر السابق، ص ٧٥.

(٦) - سهراب، كتاب عجائب الاقاليم السبعه الى نهاية العمارة، اعتني بتصحيحه، هانس فون فريك، (ڤينا: ١٩٢٩)، ص ص ٢٤-٢٥؛ الهمداني، المصدر السابق، ص ٤٨.

هەروەها لە هەرێمی پێنجەمیشدا شاری دەربەند وبرذعة( بەرزەعە) ومیافاقین (مەیافارقین) وخلاط (خیلات) و دوین لە خاكی ئەرمینیا[1]. بەلاّم ئەگەر سەرنج بدەین كاتێ باسی هەر شارێك دەكات، زانیاریەكانی ناوچەكە دەخاتە روو وەلە رووی فەلەكییەوە باسی دەكات جیاوازە وەك لەوەی كە لە حەوت هەرێمەكە خستوویەتە ڕوو. وەكو ئازەربایجان لە هەرێمی پێنجەمی دادەنێت[2]، بەلاّم لە باسكردنی حەوت هەرێمەكەدا دەیخاتە هەرێمی چوارەم. ئەگەرچی هەندێ لە ولاّتناسان كۆكن لەسەر شوێنی ئازەربایجان لە هەرێمی پێنجەمدا[3].

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ٣١.

(٢) – المصدر نفسه، مج ١، ص ١٢٨.

(٣) - الخوارزمي، صورة الارض، اعتني بتصحيحه: هانس فون فريك، (ڤينا: ١٩٢٦)، ص ٢٦؛ ابن رسته، المصدر السابق، ص ٩٥.

## تەوەری دووەم
### هەرێمە کوردنشینەکان:

**لە سەرچاوەکانی مێژوونوسان و وڵاتناسان لە بەدواداچوون و سنووری ناوچە کورد نشینەکان لەهەرێمەکاندا نەتوانراوە سنوورێك بۆ ئەو شوێنانە دیار بکرێت کە کوردی تێدا ژیاوە، سەرەڕای ئەمە لەسەرچاوەکانیان دا ئاماژە بە چەندان شوێنی نیشتەجێی کوردی دەکەن، بە جۆرێك دابەشیان کردوون بۆ چەند هەرێمێك، تەنانەت هەندێکیان زۆرینەی دانیشتوانەکەی کورد بوون، هەروەك لە هەرێمی جەزیرە، کە هەر لە دێرزەمانەوە کوردی لێ ژیاوە[1]، هەروەها بەشێکی سنووری وڵاتی کوردان دەکەوێتە ئەم هەرێمە وبە (دورگەی کوردەکان)[2]یش ناسراوە، وڵاتناسانیش ناوچە جیاجیاکانی ئەم هەرێمە بە زۆرینەی دانیشتوانی کورد دەستنیشان دەکەن[3]، لەگەڵ هەموو ئەو بەڵگە مێژووییانەی کە مێژووناسان دانیان پێدا ناوە[4].**

**هەروەها کوردەکان لە هەرێمی چیاکانیشەوە نیشتەجێبووینە، بەتایبەتی لە بەشی رۆژئاوای ئەم هەرێمە[5]. جگە لەمە هەر لەسەرەتای فتوحاتی ئیسلامییەوە**

---

(١) - زينوفون، الاناباسيس او حمله العشرة الاف (حملة فارس)، ترجمه: يعقوب افرام منصور، (الموصل: ١٩٨٥)، ص ص ١٦٦- ١٨٠؛ انور مائي، الاكراد في بهدينان، (الموصل: ١٩٦٠)، ص ص ٤١-٤٢.

(٢) - ابن شداد، الاعلاق الخطيرة في ذكرامراء الشام والجزيرة، تحقيق: يحي العبارة، (دمشق: ١٩٧٨)، ق١، ج٣، ص ٢١٣؛ محمد فريد وجدي، دائرة معارف القرن العشرين، مادة كردستان، (بيروت: ١٩٧١)، مج ٨، ص ١١٥.

(٣) - ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ١٧٧؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ١٩٥؛ الانصاري، نخبة الدهر في عجائب البر و البحر، (د/م:١٨٦٥)، ص ١٩٠؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٢٧٤.

(٤) - بڕوانە: فائزة محمدعزت، الكرد في اقليم الجزيرة و شهرزور، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩١)، ص ص ٨٠- ١٣٠.

(٥) - بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا: سنوورەکەی لەنەخشەی جوگرافی ئێستادا بەشی ناوەڕاست و گەورەی کوردستانی رۆژهەڵات دەگرێتەوە، پارێزگاکانی کرماشان و هەمەدان و باشووری رۆژئاوای ئازەربایجان و

**لەوەڕگاكانيان لە ناوچە جياجياكانى ئەم هەرێمە بەديكراون[(١)]، تەنانەت لە سەدەى چوارەمى كۆچى دەيەمى زاينيدا بە زێدو نشينگەى كوردەكان (دارالاكراد[(٢)]) وەسف كراوە، هەر لەم سەدەيەشدا هەرێمەكانى ئازەربايجان و ئاران و ئەرمينيا وەك پێگەو و شوێنى هۆزى كوردى[(٣)] و دەسەلاَتە خۆجێييەكان و [(٤)] لەگەڵ سەرهەڵدانى ميرنشينەكان لەسەدەى چوارەمى كۆچى لەم هەرێمانە بەدى كراون[(٥)]، شايەنى باسە خوزستانيش(اهواز) بە هەرێمێكى گرنگى نەتەوەى كورد دادەنرێت، بەتايبەتى بەشى باكوورى، كە بە نيشتمانى هۆزێكى كوردى دانراوە[(٦)]. جگە لەو شار و ناوچە جياجيايانەى ئەم هەرێمە،**

---

زەوى ئاراك و زەنجان لەڕۆژهەلاَت، هێڵى مياندەب و مەهاباد و پيرانشار لە باكوورييەوە و لورستانيش لە باشوورييەوە. نيشتمان بشيرمحمد. الاحوال السياسية و الاجتماعية و الاقتصادية لغربي اقليم الجبال، رسالة ماجستير، كليةالاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤)، ص ١٨.

(١) - ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٤٩٥؛ البلاذري، المصدر السابق، ص ٣٠٧.

(٢) - اليعقوبي، المصدر السابق، ص ٢٠، بڕوانە: ل ٧٢، ل ٧٥، ل ٨٨هەمان سەرچاوە.

(٣) - هەندێ لە شارەكانى ئەم هەرێمانە بە پێگەو شوێنى نيشتەجێى هۆزى كوردى دادەنرێت، وەك هەزبانيەكان لە ئازەربايجان و تيرەيەك لە رەواديەكان لە ئاران. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، وضحه و حواشيه: خليل منصور، (بيروت: ١٩٩٧)، ص ص ١٨-١٩، ابن الاثير، التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، تحقيق: عبدالقادر احمد طليمات، ( القاهرة :١٩٦٣م )، ص ١١٩، منجم باشي، جامع الدول، تحقيق: مينورسكي، (كيمبرج: ١٩٥٧)، ص ١.

(٤) - دەيسەم كوڕى ئيبراهيمى كوردى، خاوەن ئەو دەسەلاَتە خۆجێييە كورديە بوو كە لە سەدەى چوارەمى كۆچى و دەيەمى زاينى لە ئازەربايجان سەرى هەڵدا، لەگەڵ هەندێ بەشى ئاران و ئەرمينيا لە ماوەى نێوان ساڵانى (٣١٥ك- ٣٤٥ك/ ٩٢٦-٩٥٦ز). مسكوية، تجارب الامم، اعتني بالنسخ و التصحيح: هـ. ف. امد روز، (مصر: ١٩١٤)، ج ٢، ص ص ٣١- ٣٣؛ ابن الاثير، الكامل في التاريخ، حققة و اعتني به: عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت: ٢٠٠٦)، ج٢، ص ٢٠٢. بۆ زياتر زانيارى بڕوانە: زرار صديق توفيق، الكرد في عصر العباسي حتي مجي البوهيين، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤)، ص ١٥٥؛ قادر محمد حسين، الامارات الكوردية في العهد البويهي، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٩)، ص ص ١٣- ١٦.

(٥) - بڕوانە: احمد عبدالعزيز محمود، الامارة الهذبانية الكردية في اذربيجان و اربيل والجزيرة و الفراتية، من (٢٩٣- ٦٥٦هـ/ ٩٠٥- ٢٥٨م)، (اربيل: ٢٠٠١)؛ اسماعيل شكر رسول، الامارة شدادية الكردية في بلاد ئاران من (٣٤٠- ٥٩٥هـ/ ٩٥١-١١٩٨م)، (اربيل: ٢٠٠١).

(٦) - الاصطخري، صور الاقاليم، مخطوطة مصورة، ص ٥١.

**کە کوردی لێبووە[١].**

**ئەو زانیاریانەی کە یاقوت لە باسی ئەم هەرێمانەدا خستوونەتیە روو کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکردووە، تایبەتە و چڕمان کردۆتەوە لە چۆنییەتی ناولێنانیان و دیاریکردنی سنووری شارەکانی ئەم هەرێمانە و هەڵکەوتنی شوێنی جوگرافی و سەرباری چەند زانیاریەکی تری گشتی :**

## ١- هەرێمی (جَزِيرَة أَقُور/جەزیرەی ئاقور):

**وەك دەبینین یاقوت ئەم هەرێمە بە (جەزیرەی ئاقور) ناودەبات[٢]. کە بە (جەزیرە)ش ناوبراوە[٣]. یاخود ئابور[٤]، جگە لەم ناوانە بە دەستەواژەی تریش وەکو، جەزیرەی فوراتی[٥]، جەزیرەی عیراقی، باسکراوە، [٦] هەروەها (زمخشری )(م: ٥٨٣ك/١١٨٧ز) یش بە جەزیرەی شام ناوی دێنێت[٧].**

**سنووری ئەم هەرێمە بەشێوەیەکی گشتی لە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات لە**

---

(١) - وەکو لە ناوچەی کەنارەکانی رووباری (جور)، هەروەها لەشاری جندی سابوور، گوندەکانی دەوروبەری رامهرمز. بڕوانە: ابن الاثير، الكامل، ج٧، ص ٩٣، ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي(بيروت: ١٩٩٦)، ج١، ص ٢٦٤، المقدسي، المصدر السابق، ص ٣٠٤، ابن بطوطة، رحلة ابن بطوطة،(بيروت: ٢٠٠٧)، ص١١١.

(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٤. دەربارەی وشەی ئاقور لسترنج دەڵێت: "بەو ناوچانە وتراوە، کە کەوتۆتە باکووری وڵاتی نێوان دوو رووبار"، بەڵام لە رایەکی تردا دەیگەڕێنێتەوە بۆ وشەی ئاشوور و گۆڕدراوە بۆ ئاقور. بلدان الخلافة الشرقية، ترجمة و صححه: بشير فرنيس، گورگيس عواد، (بيروت: ١٩٨٥)، ص ١١٤، محمد جاسم حمادي، الجزيرةالفراتية والموصل، (بغداد: ١٩٧٧)، ص ٣٦.

(٣) - الاصطخري، المسالك و الممالك، تحقيق: جابر عبدالعال الحسني، (القاهرة: ١٩٦١)، ص ٥٢؛ ابن رسته، المصدر السابق، ص ١٠٣؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ١٨٧؛ البكري، المسالك و الممالك، ج٢، ص ٢٦٠؛ القزويني، اثار البلاد و اخبار العباد، (بيروت: د/ت)، ص ٣٥١.

(٤) - المشترك وضعا، ص ١٠٢.

(٥) - محمد جاسم حمادي، المرجع السابق، ص ٣٨.

(٦) - المرجع نفسه والصفحه.

(٧) - الامكنه والجبال والمياه، تحقيق: ابراهيم السامرائي، (د/م د/ت)، ص ٦١.

تەك شام دیاری دەکرێت[١]. بەڵام ئەگەر لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە و لای ڕۆژئاوای ڕووباری فورات بێت[٢]، کە یاقوت تەنیا ئەمەی دیاریکردووە، بەبێ دەستنیشانکردنی لای باکوور و باشووری، ئەگەرچی لەسەرچاوەکانی تریشەوە لای باکووری ئەم هەرێمە دیاری نەکراوە، لەبەر هۆکاری بارودۆخی ئەم ناوچەیە و هاوسێیەتی لەگەڵ وڵاتی ڕۆم[٣]. بەجۆرێك شاری (شمشاگ) لە کۆتایی وڵاتی ڕۆمە و هاوتای جەزیرەی فوراتیە و شاری (سیساگ)یش بەپێچەوانەوە لە کۆتایی هەرێمی جەزیرەیە و هاوتوخمی وڵاتی ڕۆمە[٤].

بەڵام لەبەشی باشووری لەگەڵ ڕووباری دیجلە درێژ دەبێتەوە تاکو دەگاتە ناوچەکانی تکریت، لەگەڵ فوراتیش تاکو دەگاتە شاری هیت[٥].

ئەم هەرێمە خۆی لە دیاری بەکر و موزەر (مچر) و ڕەبیعە پێك دێت[٦]. بەڵام یاقوت تەنیا دیاریەکروموزری داناوە[٧]، کە شارەکانی (حیصن کەیف(حصن کیفا) وئامەد(امد)و مەیافارقین(میافارقین)، وسعرد، وحیزان، وحبنی، حەران ورەقە(الرقە)و تەل موزن(تل موزن) و سروج) لەخۆوە دەگرن [٨]. کەچی لە باسکردنی دیار ڕەبیعەدا، کە ناوچەکانی نێوان موسل و ڕەئسولعەین (راس العین) دەگرێتەوە[٩].واتا ئەوناوچانەی کە (راس العین ) لەخۆیان دەگرێت، هەندێك لە شارە گەورەکانی جەزیرە دەکەوێتە ئەم چوارچێوەو نێوەندە،

---

(١) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٤.

(٢) - البكري، معجم مااستعجم، ج٢، ص ٢٥؛ معجم البلدان، مج١، ص ١٣٤؛ القزويني، المصدر السابق، ص ٣٥١.

(٣) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٤.

(٤) - هالا عبدالحميد، الحياة الاجتماعية و الاقتصادية في الجزيرة الفراتية، رسالة ماجستير، كلية الدراسات العليا، جامعة الاردنية، (عمان:٢٠٠١)، ص ١٣.

(٥) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص٥٢؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٢٧٣.

(٦) - المقدسي، المصدر السابق، ص ١٢٥؛ القزويني، المصدر السابق، ص ٣٥١؛ الانصاري، المصدر السابق، ص ١٩١؛ القلقشندي، صبح الاعشى في صناعه الانشاء، (بيروت: ١٩٨٧)، ج٤، ص ٣١٨.

(٧) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٤.

(٨) - المصدر نفسه، مج ٢، ص٤٩٤

(٩) - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٩٤.

کەوا خۆی دیاریکردووە، وەك حەران، روهاو، رەئسولعەین، نەسێبین، سینجار(ژەنگار) و خابور، ماردین و، ئامەد و مەیافارقین و موسل[١]. کەواتە دیار ڕەبیعەش لەم هەرێمەیە .

هەروەها یاقوت دانیشتوانی ئەم هەرێمەی بە خاوەن ڕابردوویەکی مێژوویی درێژ وەسف دەکات[٢]. وەباسی کۆچکردنی هۆزە عەرەبەکان لە هەرێمی شامەوە بۆ ئەم ناوچەیە و دواتر ڕووبەڕوونەوەیان لەگەڵ پاشای ساسانی(شابوری کوڕی ئەردەشیر[٣]) وەکو نموونەیەکی مێژوویی لەم هەرێمە دەکات[٤]، کە ئەمیش بۆ گرنگی شوێن هەلکەوتنی جوگرافیاکەی دەگەڕێتەوە[٥].

## ٢- هەرێمی (الجبال/چیاکان):

وەك ئاشکرایە لەمێژوودا ناوی ئەم ناوچانەی کە چیای سەخت و بەرز دەیڕوانێتە سەریان بە هەرێمی چیاکان ناودەبران، تاوەکو سەدەی پێنجەمی کۆچی یانزەی زاینیدا

---

[١] - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣٤.

[٢] – المصدر نفسه ، مج٢، ص ١٣٤.. رەنگە بۆ هۆکاری هەلکەوتنی شوێنەکەی بێت، کە مەڵبەندی خاکی دلێران و سوارچاکان، پیاوچاکان و پەیامبەران بووە. ابن حوقل، المصدر السابق، ص ١٩٠؛المقدسي، المصدر السابق، ص١٢٤.

[٣] - سابوری کوڕی ئەردەشێر، یەکێکە لە پاشاکانی دەوڵەتی ساسانی بۆ ماوەی سی ساڵ حوکمی کردووە جەندین شارو ناوچەی بنیات ناوەو ناوی شوێنەکانی بۆ دەگەرێتەوە وەبەرەنگاری زۆر لە پاشاکانی جیهان بۆتەوە.المسعودي، مروج الذهب، ج١، ص١٦٩؛.حمزە الاصفهاني، تاریخ سنی ملوك الارض، (د/م: ١٨٦٦)، ص ١٢.

[٤] –لێرەدا (بنی قضاعة) بەنموونە دەهێنێتەوە. معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٤.

[٥] - هەلکەوتنی جوگرافیاکەی کەوتۆتە سەر هێلەکانی گەیاندنی نێوان عێراق و ئەنازول و عێراق و سوریا، لەسەر دوریانی گەورەی ناسراو بە (الهلال الخصیب). شترك، دائرة معارف الاسلامیة، (مادة الجزیرة)، مج ١١، ص ٤٣٤.

بەم ناوە ناسرابوون[١]. ئەگەرچی لە سەدەكانی پێش زانینیدا بە وڵاتی میدیا[٢] و هەروەها بە وڵاتی پەهلەویەكانیش بەر لە ئیسلام ناوی هاتووە[٣].

یاقوتیش تیشك دەخاتە سەر ئەم هەرێمە و لە رۆژگاریدا بە عێراقی عەجەم ناسرابوو[٤]. ئەم ناوەش بۆ حوكمڕانی ئەو كاتەی عێراق دەگەڕێتەوە، كە عەجەمی بوون بۆ وەلاتانی دەسەڵاتی عەرەبی لەعێراق ئەم ناوەیان لێناوە، بەڵام بۆ سنووری ئەم هەرێمە ناوبراو تەنیا تیشكی خستۆتە سەر بەشە ناوخۆییەكەی، ئەمیش بە دیاریكردنی شارە گەورەكان وەكو (ئەسفەهان)[٥] و، (زەنجان)[٦] و، قەزوین و، هەمەدان و، دینەوەر و، قەرمیسین(كرمنشاه))[٧].

سنوورەكەی لەگەڵ دەوروبەریدا لەبەری رۆژهەڵاتەكەی بیابانی خوراسان و لە رۆژئاواكەشی هاوسنوورە لەگەڵ عێراق وجەزیرەو بەشێك لە ئازەربایجان، وڵاتی دەیلەم لەباكووریەوە، ولەباشووریشییەوە هەرێمی خۆزستان و فارسە[٨].

ئەگەر سەیری بارودۆخی ئەم هەرێمە بكەین كە هاو سنوورە لەگەڵ (دەیلەم)[١] لەلایەك و عێراقیش لەلایەكی تریەوە، بۆیە دەبینین هەندێ شار راستەوخۆ دەكەونە

---

(١) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١١٥؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٣٠٤؛ المقدسي، المصدر السابق، ص ٣٨٩.

(٢) - الهمداني، المصدر السابق، ص ٧٩.

(٣) - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ٥٨؛ المقدسي، المصدر السابق، ص ٢٩٠.

(٤) - معجم البلدان، مج٢، ص ٩٩.

(٥) - ئەسفەهان:شارێكی بەناوبانگ وگەورەی هەرێمی چیاكانە نۆزدە روستاقی لەخۆوە گرتبوو، هەریەكێكیان شەست گوندە بوجوك پێكهاتبوو. معجم البلدان، مج١، ص ص٢٠٦-٢٠٧.

(٦) - زەنجان:شارێكی هەرێمی چیاكانەودەكەوێتەباكوری رۆژئاوای ئەم هەرێمە، رەچەڵێكی كەسایەتی رۆشەنبیری بۆ دەگەڕێتەوە.ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤١٧.

(٧) - معجم البلدان، مج٢، ص ٩٩.

(٨) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١١٥؛ مؤلف مجهول، حدود العالم، تحقيق: يوسف الهادي، (القاهرة: ١٩٩٩)، ص ١٠٦؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٤٥٨.

هەرێمی چیاکان، بەڵام لە رووی کارگێڕییەوە خراونەتە سەر هەرێمێکی تر وەکو شاری حولوان، بەیەکێك لە شارەکانی سەر بە عێراق ژمێردراوە[٢]، یاخود بە حولوانی عێراق ناسراوە[٣].

لەکتێبی (معجم البلدان)دا بەوشێوەیەك وەسفی ئەم هەرێمە کراوە، کە چەندین ناوچەی فراوان لەخۆدەگرێت[٤].

سەبارەت بەهەر سێ هەرێمی ئازەربایجان و ئاران و ئەرمینیا لەلایەن زۆربەی وڵاتناسان بەیەکەوە باسکراون[٥]. هەندێ جاریش بەیەکەوە ناو براون بە (اقليم الرحاب[٦]) بەڵام یاقوت جیا لەو وڵاتناسانە هەر هەرێمێك بەجیاباس دەکات، کە لەسەردەمی ئەودا وابووە کە ئەمەش بۆ ئەو تایبەتمەندییە دەگەڕێتەوە، کە لە میتۆدی داڕشتنی بابەتەکان گرتوویەتییەبەر[٧]:

## ٣- هەرێمی(أذْرَبِيجَان/ ئازرەبیجان-ئازەربایجان):

یاقوت ئەوەی دەربارەی ئەم هەرێمە تۆماری کردووە، سەرەتا شوێنی لە حەوت هەرێمە ئاوەدانەکەی زەوی دیاری دەکات[٨]. پاشان لە ڕووی زمانەوانییەوە چەسپاندوویەتی بە (اذربیجان/ ئازرەبیجان) بەڵام دوو بۆچوون بۆ بنەچەی ئەم ناوە دەخاتەڕوو، لە بۆچوونی

---

(١) - دەیلەم: ولاتێکە لەزەوی چیاکگشتی خاکەکەی چییایە، لەنزیك قەزوین، لەرۆژئاواکەی ئازەربایجانەو لە باشوری قەزوین ولەرۆژهەلاتی شاری رەی وتەبەرستان لەباکوریشی دەریای خەزەرو گەیلانە. القزوینی، اثار البلاد، ص٣٣٠"ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤٢٧.

(٢) - قدامة بن جعفر، الخراج و صناعة الكتاب، تحقيق: محمد حسين الزبيدي، (بغداد: ١٩٨١)، ص ١٣٥.

(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص٢٩٠.

(٤) – المصدر نفسه، مج ٢، ص ٩٩.

(٥) - المهلبي، المصدر السابق، ص ١٣٩؛ الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١٠٨؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ٢٨٥؛ مؤلف مجهول، المصدر السابق، ص ١١٩.

(٦) - المقدسي، المصدر السابق، ص ٢٨١.

(٧) - بروانە: ئەم لێکۆلینەوەیە، ل ل٢٤-٢٨.

(٨) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨.

یەکەمدا بۆ ناوی (باذرباذبن ایران بن الاسود بن سام بن نوح) یان(اذبـاذ بـن بیوراسـف) دەگەڕێنێتەوە، گوایە یەکەم کەسە لێی نیشتەجێ بووە[١].

لە بۆچوونی دووەم بۆ شیکردنەوەی واتای بڕگەکانی گەڕاندۆتەوە، واتا (ئازەر- ئاگر) و (بیجان- خانوو) بەگشتی واتا (ماڵی ئاگر) کەوا ئەم بۆچوونەی بەراستر زانیوە[٢].

سەبارەت بـە سنورەکەشـی، یـاقوت لەبـەری ڕۆژهـەڵاتی ئـەم هەرێمـە بەرزەعـە و ئەرزەنجانی داناوە لەلای ڕۆژئاواکەشی بەستوویەتەوە بە باکووری دەیلەم و جەیلان و تەرم [٣]. بەڵام ئەم دیاریکردنە نازانرێ لەکام ئاراستەوە بووە، چونکە ئەگەر باکووری هەرێمی دەیلـەم و جـەیلان بکەوێتـە لایـەکی ئـەم هەرێمـە، ئـەوا شـاری بەرزەعـە ناکەوێتـە ڕۆژهەڵاتەکەی بەڵکو لە بەشی باکووریەوە، ئەرزەنجانیش لە لای باشوورییەوە[٤].

ڕاستی سنوورەکەی لەگەڵ دەوروبەریدا لەبەشی ڕۆژهەڵاتی دەیلەم و جەیلان و تارم و ڕۆژئاوای دەریای خەزەرە(قەزوین)، وە لەبەری باشووری هەرێمی چیاو عێراق و بەشـێك لەسنووری جەزیرەیـە، هـەرێمی ئـەرمینیا و گورجسـتانیش لـەلای ڕۆژئاوایـەتی، لای باکووریشی چیاکانی قەوقاز و ئاران و وڵاتی ئالانە[٥].

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨ .بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حسام الدين علي غالب النقشـبندي، آذربيجـان، اطروحة دكتوراه، مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٨٤).ص ص ٣٤- ٣٧.

(٢) - معجم البلدان، مـج١، ص ١٢٨. لەسەرچاوە نوێیەکان بەشـێوەیەکی تـر بڕگـەکان شـی کراونەتـەوە بـە جۆرێك ئازەر (ئاگر) بای (زەوی بە پیت) جان (گەورەی ناوچەکە) بووە. محمود علي اسماعيل، مختصر تـاريخ اذربيجان، ترجمە: رفيق عليوف، رامز مرسالوف، عني الـنص الى العربـي: نـزار اباضـة، (دبـي: ١٩٩٥)، ص ١٠.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨.

(٤) - النقشبندي، اذربيجان، ص ٣٧.

(٥) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص ص ٣٨٦-٣٨٧؛سباهي زادة، اوضح المسالك الى معرفة البلدان والممالـك، تحقيق :المهدى عيد الرواضية، (بيروت:٢٠٠٨)، ص١٣٤؛ النقشبندي، اذربيجان، ص ٣٧.

**هەروەها یاقوت، تەبریز(تەوریز) و مەراغە و خوێ و ئورمیە و ئەردەبیل و مەرەندی به شاره گەورەکانی هەرێمی ئازەربایجان هەژمار کردووه [(١)].**

**ناوبراو وەسفی دانیشتووی ئەم هەرێمه دەکات، بـه جۆراوجـۆری نەتـەوەو جیـاوازی ئایینی، بۆیه هەمیشه پێگەیەکی ناکۆکی و ململانـێ بـووە[(٢)] و هـەروەها بـه شـوێنی یاخیبوان له دەسەڵاتی دادەنێـت[(٣)]. یـەکێك لـه کاریگەریـیـەکانی ئـەم بارودۆخـه بـۆ هەڵکەوتەی شوێنەکەی دەگەڕێتەوه، که هاوسنوره لەگەڵ وڵاتی دەیلەمدا[(٤)].**

## ٤- هەرێمی(أرّان/ ئاران):

**ئەم هەرێمه بەشێکه له هەرێمی ئەرمینیای گەوره[(٥)]. یاقوتیش ئەمه دەخاته ڕوو[(٦)]. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا به ناوچەیەکی سەربەخۆ باسی کردووه.**

**سەرەتا ناوەکەی بۆ بنەچەی ناوێکی عەجەمی دەگەڕێنێتەوه[(٧)]. لەسەردەمی یۆنان و ڕۆمانیش به (ئەلبانیا[(٨)]) ناسرابوو، هاوکات واتا (نەتەوەی ئەرمەن) [(٩)].**

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨. دەربارەی هەموو شارەکانی ئەم هەرێمه بڕوانه: النقشبندي، اذربيجان، ص ص ٥١-٨٢.

(٢) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨.

(٣) - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣؛ مج٣، ص ٢٠٤.

(٤) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٦١.

(٥) - اليعقوبي، المصدر السابق، ص ٢٠٨؛ ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٨٤.

(٦) - معجم البلدان، مج١، ص ١٦٠.

(٧) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٦. لەبەرئەوەی ئاماژه بەوه کراوه، ناوەکـەی ووشـەیەکه عەجـەمی بـووه، بۆیه دوورنیه کوردی بێت، بەجۆرێك لەکوردی بەمانای کوێستان دێت.

(٨) - سنووری ناوچەی ئەلبانیا، له باشووری ڕووباری ئاراس و له باکووری زنجیره چیاکانی قـەوقاز، ئیبریـا لـه ڕۆژهەڵاتی و ڕووباری ئازان له ڕۆژئاواکەی. محمود عباس، المرجع السابق، ص ١٦.

(٩) - جمال رشيد احمد، لقاءالكرد في بلاد الباب و الشروان، (اربيل: ٢٠٠١)، ص ٤٧، ص٥١.

لە رووی رێزمانییەوە لەلای یاقوت بە ( اران) هاتووە[١]. بەلاّم لە هەندێ سەرچاوەی تر بە (الران) باسیان كردووە[٢] . سەبارەت بە شوێنە جوگرافیەكەی لەلای ناوبراو دەكەوێتە باكووری رۆژئاوای رووباری ئاراس، ئەو رووبارەی هەرێمی ئاران و ئازەربایجان لێك جیا دەكاتەوە[٣].

بەلاّم سنووری بەگشتی لەگەلّ دەوروبەرەكەی، كە یاقوت دیاری نەكردووە بەم شێوەیەیە، لەلای رۆژهەلاّتی دەریای قەزوینەو باشوورەكەشی هەرێمی ئازەربایجانە لە باكووریدا زنجیرە چیاكانی قەوقاز(قبق) لەبەری رۆژئاواكەشی ئەرمینیا و بەشێك لە گورجستانە(بلادكرج)[٤].

ناوبراوشارەكانی ئەم هەرێمە بەگەنجە(جنزه)و بەرزەعە و، شەمكور و بەیلەقان و، دەست نیشان دەكات[٥]. بەلاّم لەكاتی باسكردنی ناوچەكان شاری تریش دەخاتەسەر ئەم هەرێمە [٦]، وەكو شاری تەفلیس[٧].

## ٥- هەرێمی (إرْمِينِيَة/ئیرمینیە-ئەرمینیا) :

یاقوت ناوەكەی لە رووی رێزمانییەوە بە (ئیرمینیە) چەسپاندووە، رەچەلّەكی بۆ ناوی(ارمینابن لنطا بن اومربن یافث بن نوح)، یەكەمین دانیشتووی ئەم شوێنە، گەراندۆتەوە[٨].

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٦. هەروەها بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٨٤.

(٢) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١٠٨؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٨٧.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٦.

(٤) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١١٠؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٨٥؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٨٦.

(٥) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٣٦. بۆ زانیاری دەربارەی ئەم شارانە بڕوانە: اسماعيل شكررسول، المرجع السابق، ص ص ٣٩-٤٤.

(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٨٢، ص ٤٩١.

(٧) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٣٥.

(٨) - معجم البلدان ، مج ١، ص ١٦٠. بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٨٣.

**لە ڕووی جوگرافیشەوە دابەشی کردووە بۆ ئەرمینیای گەورە وئەرمینیای بچوك [١] بە جۆرێك سنووری ئەرمینیای بچووك لەشاری بەرزەعە وە بۆ دەربەند لەلایەك و لاکەی تری وڵاتی ڕۆم و چیاکانی قەوقاز(قبق) و ناوچەی وڵاتی سەریر (بلاد السریر)[٢] دەست نیشان دەکات[٣]. بەڵام سنووری ئەرمینیای گەورە بە ناوچەکانی شاری خیلات (خلاط)و دەوروبەری ئەرمینیای بچووك، تاکو شاری تەفلیس دەست نیشان دەکات[٤]. پاشان ناوچە و شارەکانی ئەم هەرێمە دەکاتە چوار بەشەوە[٥]. بەڵام هەندێ لە وڵاتناسان دەیکەن بە سێ بەشەوە.[٦]**

**سنوورە گشتییەکەی ئەم هەرێمە لەگەڵ دەوروبەریدا، وڵاتی گورجستان و ڕۆژهەڵاتی ئازەربایجان دەکەونە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەم هەرێمە، بەری ڕۆژئاواکەی سنووری وڵاتی ڕۆمە، لە باکوورییەوە وڵاتی کەرەج و لەگزوچیاکانی قەوقازە، بەشێك لە سنووری هەرێمی جەزیرەش لەلای باشوورییەوەیە [٧].**

**ئەم هەرێمە ژمارەیەکی زۆر لە نەتەوە جیاوازەکان تێیدا ژیاون، هەروەکو یاقوت ناوی چەند نەتەوەیەك دێنێت، وەك سوغد و فارس، کە دەسەڵاتداری ئەم ناوچەییە بوونە[٨].**

---

[١] - معجم البلدان، مج ١، ص ١٦٠؛ رشيا برهوش، مختصر تواريخ الارمن، ترجمه من الارمنية الى العربية:انطوان خانجي، (اورشليم: ١٨٦٨)، ص ٨ .

[٢] - بلاد السرير: مەملەکەتێکی فراوانە لە نێوان ئالان و (باب الابواب) دەربەندە. معجم البلدان، مج ٣، ص ٢١٩.

[٣] - المصدر نفسه، مج١، ص ١٦٠.

[٤] — معجم البلدان، مج١، ص ١٦٠..

[٥] - یەکێکیان (بەیلەقان وقەبەلەو شەروان)، دووەمیان(جورزان وصغدەبیل و دەربەندەو فەیرو زقوباد ولەکز) بەشی سێیەمیان(بەسفرجان ودەبیل وسراج وبغروند ونەشەوی)چوارەمیش(شمشاط، قالیقلا، ئەرجیش، باجنیس، لەگەل کورەی ئاران)بەم شێوەیە دابەش کراوە. معجم البلدان، مج ١، ص ١٦٠. هەروەها بڕوانە: ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٠٨؛ ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ص ٥٨٣-٥٨٤.

[٦] - اليعقوبي، المصدر السابق، ص ٢٠٨.

[٧] - حمدالله مستوفي قزويني، نزهة القلوب، (تهران:١٣٤٢)، ص ١١١" القلقشندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٣٥٤" سباهي زادة، المصدر السابق، ص٣٣٠.

[٨] - معجم البلدان، مج١، ص ص ١٦٠-١٦١.

**هەربۆيەش بە هەرێمێكی خاوەن چەندەها سەركردە وەسفكراوە[١].**

## ٦- هەرێمی(خوزِسْتان/ خوٚزستان)- الاهواز:

**ئەم هەرێمە بە يەكێك لە هەرێمـە كوردنشـينەكان دادەنرێـت[٢]، كـەوا سـنوورەكەی بەشـێوەيەكی روون لەلايـەن لێكۆڵـەران ديـاريكراوە، لـەلای رۆژهـەڵاتی ئـەم هەرێمـە ئەسفەهان و هەرێمی فارسە، رۆژئاواكەی كورەی (واسط)ی سەر بەعێراقە، باكووريشـی هەردوو كورەی (صيمرە) و (لور)ی سەر بە هەرێمی چياكانە. هەروەها ئەو هێڵەی كە لە (واسط) بۆ عەبادان دەچێت لەلای باشووريەتی[٣].**

**بەشێكی ئەم هەرێمە بە پێگە و مەقامی كوردی دانراوە، بەتايبەتی لای باكووری، كە هۆزی (لور[٤])ی تێدا نيشتەجێ بووە، كەوا ياقوت بەخاوەن نيـــشتمانی داناون[٥].**

**لەرووی رێـزمانيەوە نـــاوی هۆزەكـەی (اللـــــر[٦])، شـوێنی هۆزەكـەش، بـە (لـور) دەرخستووە[٧].**

---

(١) - المصدر نفسه و الصفحه.

(٢) - بڕوانە: ل٥١، پەراوێزی ژمارە (٥)

(٣) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٢٥؛ القلقشندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٣٣٨.

(٤) - لـور: هۆزێكی گەورەی كوردی يە، لە هەرێمی لوڕستان نيشتەجێ بوون .المسـعودي، المصـدر السـابق، ص ٩٤؛ ابن العبري، تاريخ الزمان، نقلة الى العربيـە : اسـحاق ارملـة، (بـيروت: ١٩٨٦)، ص ٢٩٤ ؛معجم البلـدان، مـج٥، ص ١٦. بـۆ زيـاتر زانيـاری بڕوانـە: رمضـان شـريف زيـر، لورسـتان الكـبري (٥٥٠-٨٢٧هـ/١١٥٥-١٤٢٤م)، رسالة ماجستير، كليـة الاداب، جامعـة صـلاح الـدين، (اربيـل: ١٩٩٤)، ص ١٧، ص ص ٣٦-٣٧؛بڕوانە: بەشی چوارەمی ئەم لێكۆڵينەوەيە.

(٥) - معجم البلدان، مج ٥، ص ١٦.

(٦) - المصدر نفسه و الصفحه.

(٧) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٢٥. مانای ئەم وشەيە لە زمانی كوردی ئەو چـيايەی كـە بـە جەنگـەڵ دەورە درابێت. پێ دەگوترێت( لـوڕ). حمـدالله المسـتوفي القـزويني، تـاريخ گـزيـدة: باهتمـام:: عبـدالحسـين نـوائي، (تهران: ١٣٨١)، ص ٥٣٨.

لەرووی جوگرافییەوە بە (لورستان)ی[1] ناوبردووە[2]. وە بە یەکێك لە ولایەتەکانی هەرێمی کوردستان دەژمێردرێن[3]. ناوبراو سنوورەکەی لە نێوان ئەسفەهان و خوزستان داناوە[4].

ئەگەرچی سەر بە هەرێمی خوزستانە[5]. بەلآم شوێنەکەی پەیوەستە بە هەرێمی چیاکانەوە[6]. چونکە راستەوخۆ دەکەوێتە ئەم هەرێمە.

ئەوەتا لە دیاریکردنی شوێنی هۆزی خۆزییەکان، کە خوزستانە، لوری خستۆتە لایەکی ناوچەکەیان[7]، جگە لەمەش چەند بیروڕایەکی خستۆتەڕوو، کە ئاماژە بەوە دەکەن خوزستان ناوچەی چیایی لێ نییە[8]. واتا لەم هەرێمە کورد لەبەشی باکووری زیاتر بووە.

---

(۱) - لورستان: ئەو هەرێمە سنوورەکەی لەلای رۆژهەلآتی ئەسفەهان و فارسە، لەباکووری کرماشان و هەمەدانە، لە رۆژئاواکەی رۆژئاوای هەرێمی چیاکانە، لە باشووریشی خۆزستانە. رمضان شریف زبیر، المرجع السابق، ص ۱۹.

(۲) - معجم البلدان، مج ٥، ص ۱٦.

(۳) - ویلایەتی کوردستان: ئەو هەرێمە سنوورەکەی لەسەردەمی سولتان سەنجەری سەلجوقی (٥۱۱-٥۲۲ك/۱۱۱۷-۱۱۷٥ز) دیاری کراوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: رمضان شریف زبیر، المرجع السابق، ص ۱۹. بەلآم وشەی کوردستان بۆ یەکەمجار لەلایەن گەشتیاری ئیتالی مارکۆپۆلۆ (۷۳٤ك/۱۳۲۷ز) هاتووەو چەند جارێك دووبارەی کردۆتەوە لە کتێبەکەی بە چەشنێ هەریەك لەکوردستان و لور بەیەکێك لە هەشت مەملەکەتەکەی ولآتی فارسی هەژمار کردووە.

- Marco polo, travels of Marco polo (London: 1927),pp 37,53.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ۱٦.

(٥) - المصدر نفسە، مج ٥، ص ۲٥.

(٦) - المصدر نفسە، مج ۲، ص ٤۰٥

(۷) - المصدر نفسە، مج ۲، ص ٤۰٤

(۸) - المصدر نفسە، مج۲، ص ٤۰٥.

## تەوەرەی سێیەم:

## کورد له هەرێمەکانی تردا

یاقوت دوای ئەوەی باس لەو ناوچانه دەکات و به شوێنی گرنگی کوردی دانراون، جگه لەمەش باس له هەندێ هەرێم و ولآتی تریش دەکات، که سەردەمانێ کوردی تێدا ژیاوە، بۆیه بەپێی کتێبەکەی ناوبراو پێویسته ئاماژەیان بۆ بکەین:

### أ- له هەرێمی فارس دا:

یەکێك لەو فاکتەرانەی، که بۆته هۆی ئەوەی ئەم هەرێمه بەشوێنی نیشتەجێی کوردی دابنرێت هەبوونی ئەو زومه کوردییانەیه که لەم ناوچەیەدا دیاریکراون[١].

ئەگەرچی بەر لەناو هێنانی ئەو زومانه، کوردەکان لەم هەرێمه نیشتەجێبووینه، بەتایبەتی لەکاتی فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئەم ناوچەیه[٢]. بەهەمان چەشن یاقوت بۆچوونی ولآتناسانی وەك (ابن خرداذبة[٣]) (ابن الفقية الهمذاني[٤]) (الاصطخري[٥])، (ابن حوقل[٦])، (المقدسي[٧])دووباره کردۆتەوە، بەلآم تەنیا لەبری بەکارهێنانی زوم که به (رَم/

---

[١] - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ٥١؛ ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٤١٠؛ الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ٧٢؛ الانصاري، المصدر السابق، ص ١٧٩.

[٢] - ابن الاثير، الكامل، ج٢، ص ٤٢٢.

[٣] - المسالك و الممالك، ص ٥١.

[٤] - البلدان، ص ٤١٠.

[٥] - المسالك و الممالك، ص ٧٢.

[٦] - صورة الارض، ص ٢٣٦.

[٧] - احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص ٣٢١.

رەم[1])ی ناوی بردووە[2].

ناوی ئەو رەمانە بەشێوەی کۆکراوەیی (رموم)ە، ناوبراو سەرەتا ناوی چواریانی لەگەڵ شاری (شیراز[3]) هێناوە سنووریان بۆ دیاری دەکات[4]، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لە کتێبی (معجم البلدان)دا لەسەرەتای باسکردنی ئەو رەمە کوردیانە هەمان زانیاری کتێبەکەی (ابن خرداذبة)(المقدسی)ی دووبارە بۆتەوە[5]. جگە لەوە یاقوت بەشێوەیەکی فراوانتر باسی لەم ڕەمانە کردووە کە ئەمیش لەبۆچوونەکانی (الاصطخري)یەوە خۆی دەبینێتەوە، کەوا بۆ پێنج ڕەم دابەشی کردووە و ناوی یەکەیەکانی هێناوە، وەك (رم جیلویە- الرمیجان[6]) (رم شهریار- بازنجان[7]) (رم دیوان- حسن بن صالح[8]) (رم اللواجان- احمد بن للیث[9]) (رم کاریان[1])، سنوورە گشتییەکەی هەر یەکێکیانی لەگەڵ ئەم هەرێمە دیاریکردووە[2].

---

(1) - رەم: وشەیەکی کوردییە، لە زمانی عەرەبی گوزارشت لە (حی) واتا ئاوایی دەکات، لە زمانی فارسی هاومانای ماڵ و خانوو دێت. المشترك وضعا، ص ٢١١، معجم البلدان، مج ٣، ٧١.

(2) - المصدر نفسه و الصفحه.

(3) - شیراز: شارێکە لە هەرێمی فارس، دووری لەگەڵ ئەسفەهان (حەوتاو دوو فەرسەخە/٤٣٢کم). المهلبي، المصدر السابق، ص ١٢٧.

(4) - معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

(5) - المسالك و الممالك، ص ٥١؛ احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص ٣٢١.

(6) - رەمی رەیجان: دەکەوێتە دواوەی شاری ئەسفەهان لە لایەکی کورەی ئوستوخرە لاکەی تری کورەی شابوور یەکێك لە لایەکانی کورەی ئەرجانە، کەلەشاری (بە یضا) کۆتایی دێت. معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

(7) - شهریار: ئەم رەمە هاوسنورە لەگەڵ ڕەمی ڕەمیجان، کە چەند گوندێك و ناوچەیەك لەخۆوە دەگرێت. معجم البلدان، مج ٣، ص ٧١.

(8) - دیوان: ئەم ڕەمە دەکەوێتە کورەی سابوری هەرێمی فارس لەلای خوارەوەی سنوورەکەی کورەی ئەردەشیر خورەیە. معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

(9) - لەواجان: ئەم ڕەمە کەوتۆتە کورەی ئەردەشیر خورە. معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

جگە لەو ڕەمە کوردییانە، چەندان ئاوایی کوردی لەم هەرێمە بەدی کراون، کە نزیکەی لە (٥٠٠) هەزار خانووی چڕو جەنجاڵی لەخۆگرتبوو، کە خەڵکەکەی بە پیشەی ئاژەڵداری خەریك بوون و گەرمیان کوێستانیان دەکرد[٣]. ناوی هەندێ لەو ئاوایانە لەسەرچاوەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە وەك کرمانیە و ڕامانیە... هتد[٤].

هەر لەهەمان ئەم هەرێمەدا لە شاری (بیضاء)[٥]، گوندێك هەبوو بەناوی (کورد)[٦]، هەروەها یاقوت باسی قەڵایەکی ئەم هەرێمە لە ناوچەی (شهرستان[٧]) دەکات بەناوی (دنبلا[٨])، کە ئەمەش ناوی هۆزێکی کوردی نیشتەجێی وڵاتی شام بوون[٩]، کەواتە دوور نییە ئەم قەڵایە بۆ ئەم هۆزە بگەڕێتەوە.

## ب- لە هەرێمی خوراسان دا:

سەبارەت بە بوونی کورد لەم هەرێمەدا، ئەوا لە چەند ناوچەیەکی دیاریکراودا نیشتەجێ بوون، بەتایبەتی لە هەندێ شار و ناوچەکانی وەك (اشترج)[١٠]. (اندخذ[١])، شارۆچکەیەك بوو لە بیابانی ئەم هەرێمە[٢].

---

(١) - کاریان: ئەم ڕەمە کەوتۆتە ئەردەشیر خورە و لەلایەکی ڕەمی بازنجانە هەریەکە لە کرمان و ئەردەشیر خورە و کەنارەکانی دەریای فارسی(عەرەبی) سنوورەکانی تری ئەو ڕەمەن. معجم البلدان، مج ٣، ص ٧١.

(٢) - المصدر نفسه و الصفحه. هەروەها بڕوانە: الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ص ٧١-٧٢.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ٢٧٧. بڕوانە: ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٣٦.

(٤) - الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ٧٢؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٤٠.

(٥) - بیضاء: شارێکە لە هەرێمی فارس لە کورەی ئوستوخر، نێوانی لەگەڵ شیراز (هەشت فەرسەخە/ ٤٨کم) بووە. المهلبي، المصدر السابق، ص ٢٦؛ معجم البلدان، مج١، ص ٥٢٩.

(٦) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٤٥٠.

(٧) - شهرستان: مەڵبەندی کورەی سابوورە لە هەرێمی فارس. معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٧٦.

(٨) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٣٧٧. هەروەها بڕوانە: المقدسي، المصدر السابق، ص ٣٢٠.

(٩) - المسعودي، مروج الذهب و معادن الجوهر، تحقيق: يوسف البقاعي، (بيروت: د/ت)، ج٢، ص ٣٣٨.

(١٠) - ئەشترەج: شارێکی بچووك بوو، لە بەرزاییەکانی مەرو، ناسراو بووە بە ئەشترەنجی باڵا. معجم البلدان، مج١، ص ١٩٦.

**یاقوت دوای ئەوەی ئەم هەرێمە دەکاتە چوار چارێک[٣]، یەکەمینی چارێکی (ئێران شەهر[٤])ە. کە نیسابور و قوهستان و تەبەرستان )طبرستان) و هەرات(هراة) و بوشەنج و بادغیش و توس(طوس) و تابران، دەگرێتەوە، شوێنی کوردیشی لەم چارێکە داناوە، بەتایبەتی لەناوچەی (قوهستان) بە دیاری خستوون[٥]، کەوا کورەیەکی خوراسانە و کەوتۆتە ناوچە بیابانەکانی ئەم هەرێمە[٦].**

## ج- لە هەرێمی کرمان:

**یاقوت ئەم هەرێمە بە ناوچەیەکی پان و پۆر و ئاوەدانی هەمە چەشن وەسف کردووە، کە لە چەند گوند و شار پێك هاتووە، دەکەوێتە نێوان فارس و مەکران و سەجستان و خوراسان[٧].**

**وولاتناسان پەیوەندیی کورد بەم هەرێمەوە دەگەڕێننەوە بۆ ئەو حەوت هۆز و تیرەیەی کە لە چیاکانی (قفص) نیشتەجێ بوون، کەوا بەرەیەکیان بە کوردەکان دانراون[٨] و ژمارەشیان زۆر بووە[١]، سەرەڕای ئەوەی کە ئاواییان لەم شوێنەدا هەبووە[٢].**

---

(١) - ئەندخوز: شارۆچکەیەك بوو لە نێوان بەلخ و مەرو . معجم البلدان، مج١، ص ٢٦٠.

(٢) - الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ١٥٣.

(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٥١.

(٤) - ئیران شهر: ناوچەکانی نێوان هەرێمی فارس و عێراق و چیاکانی هەرێمی خوراسان لە ژێر ئەم ناوە، کۆ دەکاتەوە .معجم البلدان، مج١، ص ٢٨٩. (ابن رستە) ناوچەیەکی زۆر فراوانتر لەژێر ئەم ناوە کۆدەکاتەوە. الاعلاق النفیسە، ص ١٠٥.

(٥) - معجم البلدان، مج٤، ص ٤١٦.

(٦) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٤٤٤.

(٧) - معجم البلدان، مج٤، ص ٤٥٤. ئەم ناوچانەش بە شێوەیەك لایەکانی ئەم هەرێمە پێك دێنن: لە رۆژهەلاتی خاکی مەکرانە و رۆژئاواشی هەرێمی فارسە و لای باکوورەکەی بیابانی خوراسان و سجستانە و لای باشووریشی دەریای عەرەبیە. مؤلف مجهول، حدود العالم، ص٩٧؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٦٧؛ الحمیري، الروض المعطار في خبر الاقطار، حققه: احسان عباس، (بیروت: ١٩٨٤)، ص ٤٩.

(٨) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٦٩؛ المشترك وضعا، ص ٣٥٦؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٣٥. سەبارەت بەم چیایە، بڕوانە: تەوەرەی سێیەمی ئەم بەشە.

کەچی خودی تێبینیەکانی یاقوت ئاماژەی بەوە نەکردووە کە کورد یەکێك بێت لە هۆزەکانی ئەم ناوچەیە، بەڵکو هەردوو تیرەی (قفص) و (بلوص) بە هاوشێوەی کوردەکان دادەنێت، کەوا لەم ناوچەیەدا دەژیان[٣]، بەپێی ئەو بۆچوونەی یاقوتیش دەردەکەوێت ڕەنگە کورد لەم ناوچەیە هەبووبێت.

## د- کورد لە وڵاتی شام و میسر:

جێی وەبیرهێنانەوەیە کورد وەك هەر نەتەوەیەکی سەر ڕووی زەوی خاوەن مێژوویەکی تایبەتی خۆیەتی و ڕۆڵی بەرچاو و بێ وێنەی لە جموجۆڵی شارستانی و سیاسی وسەربازی و ئاییندا، لە ناوچەکانی خۆی و هاوسنوورەکانی و وڵاتانی تر بینیوە. وەکو وڵاتی شام و میسر بە حوکمی بەشداری کردنی لە بەرەنگاربوونەوە و بەرپەرچدانەوەی لەشکرکێشیەکانی دوژمنان، هەر ئەم فاکتەرانە بۆتە هۆی گیرسانەوەی کوردەکان لەم دوو وڵاتە[٤]، بەتایبەتی وڵاتی شام بە شوێنی نیشتەجێبوونی زۆر لەهۆزە کوردییەکان دانراوە، وەك هۆزی دونبولی و چەندینی تر[٥]. کە لە ناوچەی حەلەب و چیای (جبل السماق)[٦] دابوون، وڵاتناسانی سەدەی پێنجەمیش دان بە هەبوونی کورد لەم وڵاتەدا دادەنێن[٧].

هەروەها بە گوێرەی ئەو لێهاتوویەی سەرکردە و ئەمیرە کوردییەکان نیشانیان داوە لە وڵاتی میسر وشام، کە چەندین ڕۆڵی سەربازی وکارگێڕیان بینیوە، ئەمەش بۆتە

---

(١) - الانصاري، المصدر السابق، ١٧٦.
(٢) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٦٩.
(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ٤٩١؛ مج٤، ص ٤٠٤.
(٤) - سەبارەت بە گرنگترین ئەو هۆکارانە بڕوانە: قادر محمد حسن، اسهامات الكورد في الحضارة الاسلامية، دراسة عن الكرد الحضاري في مصر و بلاد الشام خلال عهد المماليك البحرية (٦٤٨-٧٨٤هـ/١٢٥٠-١٣٨٢م)، (اربيل : ٢٠٠٩) ص ص ٣٩-٥٥
(٥) - بڕوانە: ل٦١، پەراوێزی ژمارە (٤)؛ ابن فضل الله العمري، مسالك الابصار في ممالك الامصار، اصدار: فؤاد سزكين، (استانبول:د/ت)، ج٣، ص ١٢٦.
(٦) - چیای سماق: چیایەکی گەورەیە دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای شاری حلب. معجم البلدان، مج ٢، ص ١٠٢.
(٧) - البكري، المسالك و الممالك، ج١، ص ٢٦١.

**هۆکارێکی راستەوخۆی ئاشنایتی کوردەکان بەم ناوچانە[١]، لەدیدی یاقوتیشەوە هەمان ئەم هۆکارانە بەرچاودەکەون، بەجۆرێك ناوبراو رەچەڵەکی کەسایەتیی میرەکانی ولاتی شام، کە ئەیوبییەکان بوون، بۆ ناوچەی دوینی هەرێمی ئاران گەڕاندۆتەوە[٢]. هۆزێکی کوردیی بەناوی (کوردە شامیەکان) ئەم ولاتە کردووە[٣]، گرنگی دەسەلاتی سوپایی (سەلاحەدینی ئەیوبی)[٤] لە چەند قەلاّ و قولغێك وشارێك، وەك، (صیدا[٥]) لە ئەبی حەسەن و نەجم[٦] لە قولغی (برزویە[٧]) گوندی (حطین[٨]) و (شفرعم[٩]) بەدیاردەخات.**

**هەروەها کوردی بە یەکێك لە نیشتەجێبووانی ولاتی میسریش داناوە، بە پشت بەستن بە زانیارییەکانی ئەبو سەڵت ئەندەلوسی[١٠]، بەهەمان شێوە باس لە فەرمانڕەوایەتیی سەلاحەدین لەم ولاتە دەکات کە چۆن رۆڵی سەربازی و بیناسازی بینیوە، وەك لە**

---

(١) - گرنگترین ئەو کەسایەتییە کوردانە، کە رۆڵ و پۆستی سەربازی و کارگێڕیان بینیوە، هەروەکولە دەوڵەتی فاتیمیەکان (٢٩٧-٥٦٧ك/٩٠٩-١١٧١ز) لە ولاتی شام لەوانە (ابوالثریا) و (احمد بن ضحاك الكردي) هتد. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: مهدی عوسمان حسین، رۆڵی سەربازی کورد لە دەوڵەت و میرنشینە ناکوردییەکان لە سەردەمی عەبباسیدا (١٣٢-٦٥٦ك/٧٤٩-١٢٥٨ز)، (هەولێر:٢٠٠٨)، ل ل ٢٣٠-٢٦٠" خانزاد صباح محي الدين، علاقة الدولة الفاطمية بالكرد، دراسة السياسية الحضارية، مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠٩).

(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٩١.

(٣) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٢٣٦.

(٤) - بڕوانە: ابن خلكان، المصدر السابق، مج٧، ص ص١٢٩-٢١٨.

(٥) - صیداء: شارێکە لە کەنارەکانی ولاتی شام سەر بەشاری دیمشقە، لە رۆژهەلاتی شاری (صور)ە. معجم البلدان، مج٣، ص ٤٣٧.

(٦) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٨٩، ص ٣٩١.

(٧) - برزویة: قولغێکە لە ولاتی شام لەسەر رێگەی چیایەکی بەرز. معجم البلدان، مج١، ص ٣٨٣.

(٨) - حطین: گوندێکە لە نێوان ئەرسوف و قیساریە لە ولاتی شام. معجم البلدان، مج٢، ص ٢٧٣.

(٩) - شفرعم: گوندێکی گەورەیە بە دووری (یەك فەرسەخ/٦کم) لەگەڵ شاری عەکا. معجم البلدان، مج٣، ص ٣٥٣..

(١٠) - الرسالة المصرية، منشورة ضمن كتاب (نوادر المخطوطات)، تحقيق: عبدالسلام هارون، (القاهرة: ١٩٧٢)، ج١، ص ص ٢٣-٢٤؛ معجم البلدان مج٥، ص ١٤٠.

دروستکردنی گوندی (طـود[١]) و بنیاتنانی قـەڵا و شـورەی شـارەکانی (القـاهیرە[٢]) و (الفسطاط[٣]) بە دیار دەکەوێت[٤].



(١) - طود: گوندێکە لە شاری صەعیدی سەروو لەناوچەی (قوص) لە وڵاتی میسر. معجم البلدان، مـج٤، ص ص ٤٦-٤٧.

(٢) - شارێکە لەتەك (فسطاط) لەوڵاتی میسر. معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٠١.

(٣) - فسطاط: شارێکی وڵاتی میسرە و دەکەوێتە رۆژهەڵاتی رووباری نیـل .مؤلـف مجهـول، حـدود العـالم، ص ١٣١.

(٤) - معجم البلدان، مج٤، ص ٢٦٦. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: بەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

# تەوەری چوارەم:
# دیاردە سروشتی وئابووریەکانی هەرێمە کوردنشینەکان

یەکەم- ڕووی زەوی.
أ- چیاکان.
ب- ڕووبار و سەرچاوە ئاوییەکان.

## یەکەم: ڕووی زەوی:

تۆپۆگرافیای ناوچە کوردنشینەکان لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە، لە رووی بەرزی و نزمییەوە چیاو دەشتاییەکی تەخت، لەگەڵ چەندین گردوتەپۆلکە لەخۆوە دەگرێت. هەروەها خاکەکەی بە ئاو دەوڵەمەندە، ئەمەش بەدیار دەکەوێت لە ڕووبارە گەورەکان و سەروچاوە گرنگەکان، بەلاّم بەگشتی زیاتر لە نیوەی کوردستان بە ناوچە شاخاوییەکان داپۆشراوە[1].

هەروەکو چۆن ئەو هەرێمانەی کە ناوچە کوردییەکان لەخۆوە دەگرێت بەناوچەی شاخاوی و بەرز وەسف کراون، وەك هەرێمی چیاکان بەشێکی زۆری بریتییە لەچیاو لوتکەی بەرزو بڵند[2]، هەروەها هەرێمی ئازەربایجانیش بەهەمان شێوە[3] و لە هەرێمی

(1) - عەبدوڵلاّ غەفور، جوگرافیای کوردستان، (هەولێر: ٢٠٠٥)، ل ٢٥.

(2) - ابن حوقل: المصدر السابق، ص ٣١٥؛ الحميري، المصدر السابق، ص ٤٤٧؛ درك كنان، كرد و كردستان، ترجمه :جواد هاتفي، (تهران: د.ت)، ص ٥؛ علي اكبر وقايع نگار، جغرافيا و تاريخ كردستان، (تهران: ١٣٨٨)، ص ٦٩.

(3) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٨؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٨٦.

ئەرمینیاش بان و تەپۆلکەی چیاکان درێژ دەبنەوە وەکو سنورێکی سروشتی ئەم هەرێمە سەیر دەکرێت[١] .هەرێمی ئارانیش خۆی لە بەرزاییەکانی ئەرمینیا هەلکەوتووە[٢] .

شایانی باسە ئەو چیایانەی، کە لەلایەن یاقوت باس کراون [٣]، کەوا دەڕواننە سەر ئەو هەرێمانەی ئاماژەمان پێکرد ئەمانەن:

## أ- چیاکان

### ١- بارِما/ بارِما:

چـیایەکە لـە نێـوان تکریـت و موسل(موصـل) بـە چـیای (حـەمرین[٤]) و(مکحول)دەناسرێت، [٥] کە لای ڕۆژهەلاتی درێژ دەبێتەوە بۆ ناوەراستی هەرێمی جەزیرە، لەلای رۆژئاواکەشی تاکو ناوچەکانی کرمان کۆتایی دێت، لـە وێـدا بـە ماسەبەزان دەناسرێت. ڕووباری دیجلەش ئەم چیایە دەکات بە دوویەش[٦] .

### ٢- تِنین/تینین:

چیایەکی بەناوبانگە لە نزیك چیای جودی[٧] .

---

[١] - ابو الفداء، المصدر السابق، ص ٣٨٧. بۆ زیاتر زانیاری بروانە: صلاح الدین امین طـه، الحیـاة العامـة في ارمینیة (٣٠-٢٤٧هـ/٦٥١-٨٦٧م)، اطروحة دکتـورا، مقدمـة الی مجلس کلیـة الاداب، جامعـة بغـداد، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ص ٢٤-٢٦.

[٢] - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٦.

[٣] — بروانە: نەخشەی ژمارە(٢)، (٤)، (٨).

[٤] - چیای حەمرین: ئەم چیایە هاوکات لە ڕۆژئاوای شارۆچکەی مەندەلییـە. عەبـدوللا غـەفور، سەرچـاوەی پێشوو، ل ٣٦.

[٥] - معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٠.

[٦] - المصدر نفسه و الصفحه.

[٧] - المصدر نفسه، مج٢، ص ٥٤.

### ٣- جودی[١] _ (چیای سپی)[٢]:

ئەم چیایە کەوتۆتە نزیك جەزیرەی ئیبن عومەر، درێژ دەبێتەوە بۆ لای رۆژهەڵاتی دیجلە و ناوچەکانی دەوروبەری موسل(موصل)[٣]. بەردەوام دەبێت لە ئامێد و مەیافارقین هەتا وەکو ناوچە سنووریەکانی شاری حەلەب لەوێ بە (لکام) دەناسرێت[٤].

### ٤- داسِن/ داسین:[٥]

چیایەکی گەورەیە دەڕوانێتە باکووری شاری موسل(موصل) لە لای ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە، ناوەکەشی بۆ هۆزە کوردییە نیشتەجێ بووەکەی ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە[٦].

### ٥- ساتیدما:

چیایەکە لە نێوان مەیافارقین و سعرد کە شوێن و پێگەی مەلیکی رۆم هرقل بووە لە هۆنراوەیەکیش بەدیار دەکەوێت[٧].

---

[١] - ناوبانگی چیای جودی بۆ کەشتییەکەی نوح پێغەمبەر دەگەڕێتەوە، کە لەسەری لەنگەری گرتووە، لە قورئانی پیرۆزیش ناوی هاتووە. ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٠٦؛ المقدسي، المصدر السابق، ص ١٢٤؛ القزويني، عجائب المخلوقات و غرائب الموجودات، (مصر: ١٩٥٦)، ص ٩٩؛ الخزل و الدال، ق١، ص ٣١٣.

[٢] -هاوکات ناوی چیای جودی چیای سپیە، بەجۆرێك درێژدەبێتەوە لە شاری دهۆك ودەوروبەری ژمارەیەکی زۆرقەلاو شوێنەوارە مێژوویەکان لەخۆدەگرێت، بەرزیەکەشی(١٣٠٢م) دەبێت.درويش يوسف حسن، بلاد هكاري(٣٣٤-٧٣٧هـ)(٩٤٥-١٣٣٦م)، دراسة سياسية وحضارية، (اربيل:٢٠٠٥)، ص٢١.

[٣] - معجم البلدان، مج٢، ص ١٧٩.

[٤] - ابن فضل الله العمري، مسالك الابصار في ممالك الامصار، تحقيق: احمد زكي، (القاهرة: ١٩٢٧)، ج١، ص ٦٠.

[٥] -هاوکات ئەم چیایە دەڕوانێتە ناحیەکانی دەوروبەری ئەتروش.درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٢٢.

[٦] - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٣٢.

[٧] - وهرقلا يوماذي ساتيدما - من بني برجان ذي الباس رجع. معجم البلدان، مج٣، ص ١٦٩.

٦- چیای ئامەد:

چیایەکی بەناوبانگە، دەکەوێتە شاری ئامـەد[1]، سەرسـورهێنەری ئـەم چـیایە لەمەدایە، درزێکی تیایە ئەو درزەش شمشێرێکی لێ دانراوە، کـە هێزێکـی زۆری ڕاکێشانی هەیە، زیاتر لە هێزی موگناتیس[2].

٧- طُورعَبْدِین/تورعەبدین:

ئەم چیایە هەڵکەوتووە لەناوچەی (طور عبدین)[3]، کـە دەڕوانێتـە سـەر شـاری نەسێبین(نصیبین)، بەستراوەتەوە بە چـیای جـودی[4]، لـە شـاری دارا تـا شـاری بەلەدلەهەرێمی جەزیرە درێژ دەبێتەوە[5].

٨- حِبتُون/حیبتون (هفتون)[6]:

چیایەکە دەکەوێتە ناوچەکانی موسل(موصل)[7].

٩- سَلَق/سەلەق (لاهیجان)[8]:

چیایەکی بەرزە دەڕوانێتە سەر زێ، کە مەبەسـت زێـی گەورەیـە(زاب الاعلـی)، ناحیەکانی موسل(موصل) دەبەستێتەوە بەناوچەکانی شەهرەزوور(شارەزوور)[9].

---

(١) - معجم البلدان ، مج١، ص ١٩، ص ٥٦.

(٢) - المصدر نفسه و الصفحه. هەروەها بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ١٨١.

(٣) -تور عابدین(طور عابدین) یاخود (میدیات ) ناوچەیەکە سەر بەشاری نەسێبین لـە سـەر چـیایەك هەڵکەوتووە، چیاکەش هەر بەناوی ناوچەکە دەناسرێت. معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٨

(٤) -. المصدر نفسه والصفحه.

(٥) - سهراب، المصدر السابق، ص ١١٦.

(٦) -کورد بەهەفتون ناوی دەبات، کەلەحەفتاوە هاتووە، لەبەر ئەوەی هەندێ جار پیتی(ح) لەکوردی دەگۆڕێت بۆ (هـ)، وەکو حەریر بۆتە هەریر. فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص٥٦، هامش(*).

(٧) - معجم البلدان، مج٢، ص ٢١١.

(٨) - النقشبندي، الكرد في الدينور و شهرزور، رسالة ماجستير، ، كلية الاداب، جامعة بغداد، (بغداد: ١٩٧٥)، ص ٤٩.

(٩) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٣٨؛ عبدالحق البغدادي، مراصد الاطلاع، تحقيق: علي محمد البجاوي، (د/م:١٩٥٤)، ج٢، ص ٧٢٨.

**١٠- شَعْرَان/ شەعران چیای هەورامان:**

**چیایەكە لە نێوان ناوچەكانی موسل (موصل)و شەهرەزوور[(١)]، واتا لە نێوەندی ئەم دوو ناوچەیە دایە و درێژییەكەی (٣٠ میل، ١٠ فەرسەخ، )[(٢)] ە، لەگەڵ ئەمەشدا بە چیایەكی ناوچەی (باجرمق)[(٣)]، كە بە قەندیل ناسراوە، دادەنرێت[(٤)]، بۆیەش پێی گوتراوە شەعران لەبەر چڕی دارودرەختی سەر ئەم چیایە و بەتەمەنترین چیاو هەبوونی میوەجاتی زۆر و نەتوانەوەی بەفری لوتكەكەی بەناوبانگە[(٥)].**

**١١- مَتَی/ مەتا[(٦)]:**

**ئەم چیایە لە ڕۆژهەڵاتی شاری موسلە، بەرزە و دەڕوانێتە سەردەوروبەرەكەی[(٧)].**

**١٢-چیای سینجار(سنجار)/ژەنگار:**

**چیایەكی بەرزە، یاقوت دیسان بنەچەی وشەكەی بۆ زمانی عەرەبی دەگەڕێنێتەوە، كە گوایا كەشتی نوح خۆی پیاكێشاوە و كاتێ بە تەكی ڕۆیشتووە، وتوویەتی (سن جبل جار علینا)[(٨)]، ئەم چیایەكی سەختە و بەرزییەكەی( ١٤٦٣م)[(٩)]ە.**

---

(١) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٤٩، ص ٣٧٥.

(٢) - الخوارزمي، المصدر السابق، ص ٥٤؛ قدامة بن جعفر، المصدر السابق، ص ١٥٠.

(٣) - باجەرمق :كورەیەكە ی فراوانە داقوقیش بەشەكێكیەتی.معجم البلدان، مج١، ص٣١٣ .لەبەرئەوەی لەناوچەكانی نێوان موسل وشەهرەزوور زنجیرە چەند چیایەك درێژ دەبێتەوە، ڕەنگە ئەمەش یەكێك لەچیاكانی ئەم زنجیرەیە بێت، هەربۆیەش هاوكات ناتوانرێت بەشێوەیەكی ورد دەست نیشانی ئەوە بكرێت، كەئایا شەعران كام چیایە.، لەگەل ئەوەش چەند بۆچونێك هەن.

(٤) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٤٩. هەروەها بڕوانە: ابن الفقیە الهمذاني، المصدر السابق، ص ١٧٩.

(٥) - لەزمانی فارسیشدا، ناوی بە(تەخت شێروە) هاتووە. معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٤٩؛ الجوهري، الصحاح، (بیروت: ١٩٩٠)، ج٣، ص ٥٥.

(٦) -هاوكات ناسراوە بەمەتینە، لەلای ڕۆژهەلاتی پێی دەلێن (سەرێنامێدی).درویش یوسف حسن، المرجع السابق، ص٢٢.

(٧) - معجم البلدان، مج٢، ص ٥٣٢.

(٨) - المصدر نفسە، مج ٣، ص ٢٦٢؛ ابن بطوطة، المصدر السابق، ص ١٣٨.

(٩) - موسى مصطفى، سنجار، (اربیل: ٢٠٠٥)، ص ٢٦.

**(ابوالفدا) (م: ٧٣٢ك/١٣٣١ز) ش به پيتترين چيا، كه كەوتۆته باكوورى شارى سينجار، وەسفى دەكات[١].**

**١٤- چياى ماردين:**

**چيايەكى بەرزى له هەرێمى جەزيرەو شارى ماردين لەسەر هەلكەوتووە، دەڕوانێته سەر شارى دوونەيسەر و دارا و نەسێبين[٢]. بەرزيەكەى (دووفەرسەخ/١٨كم) دەبێت[٣].**

**١٥- چياكانى هەكارى[٤]:**

**دەكەوێته باكوورى شارى موسل(موصل)[٥] دەروانێته سەر ناوچەكانى سەر بەم شارەو گوندى جوزەى كەوتۆته سەر[٦].**

**١٦- أرْوَنْد /ئەروەند- ئەلوەند:**

**ئەم چيايە دەكەوێته شارى هەمەدان[٧]، درێژييەكەى (٣٠٠٠) پێيە(٢٤٠٠م)، [٨] كێوێكى سەوز و شوێن گەشت و گوزار[٩] وخاوەن سەرچاوەى ئاوييە[١٠]. بۆته جێى شانازى خەڵكى هەمەدان وشاعيرێكيش وەسفى دەكات دەڵێت:[١١]**

---

(١) - تقويم البلدان، ص ٢٨٣؛سباهي زادة، المصدر السابق، ص٣٩٨.

(٢) - معجم البلدان، مج٥، ص ٣٩. هەروەها بڕوانە: ابن حوقل، المصدر السابق، ص ١٩٤؛مؤلف مجهول، حدود العالم، ص ٣٠.

(٣) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص١٩٤؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٥٧٢.

(٤) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٨٤.

(٥) - سباهي زادة، المصدر السابق، ص٦٤٧.

(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٨٤.

(٧) - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٦٣؛ القزويني، عجائب المخلوقات، ص٩٨.

(٨) - احمد ميرزا ميرزا، غربي اقليم جبال في صدر الاسلام، رسالة ماجستير، كليةالاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٥)، ص ٢٨.

(٩) - معجم البلدان، مج١، ص ١٦٣. هەروەها بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٢٧٣.

(١٠) - شهاب الدين الابشيهي، المستطرف في كل فن مستطرف، تحقيق: درويش الجويدي، (بيروت: ٢٠٠٨)، ج٢، ص ٣١.

(١١) - معجم البلدان، مج١، ص١٦٣.

**تذكرت من اروند طيب نسيمه**

**فقلت لقلب بالفراق سليم**

**سقى الله اروندا و روض شعابه**

**ومن حلة من ضاعن ومقيم**

**((شنەی بۆن خۆشی ئەروەندم هاتەوە یاد، بەدڵێ جودابووی خۆم ووت بەئارامی، خودایە خاك ومێرگی ئاویدەی، خاکەشیرینەکەی لێێ وون نەکەی))**

**١٧- بَهِسْتون / بەهیستون- بێستوون:**

**چیایەکی بڵند و سەرکەشە، سەرکەوتنی بۆسەر لوتکەکەی سەختە[١]، دەکەوێتە نزیك شاری قەرمیسین(کرمانشا) بە دووری هەشت فەرسەخ (٤٨ کم) [٢]، ڕووەکەی لەسەرەوە بۆ خوارەوە داتاشراوە و لوسە، هۆکارەکەشی کیسراویەکان بەم جۆرە دایانتاشیوە، تاکو ببێتە شوێنی بازرگانی گەورەو دەسەڵاتیان تیا بنوێنن، سەروچاوەی ئاویشی پێدا تێپەڕ دەبێت[٣].**

**١٨- خُورَزْن /خورەزن :**

**چیایەکە لە دەروازەی شاری هەمەدان، لەسەر ئەم چیایە وێنەی شێرێکی لەسەر دروستکراوە، وەك پەنهانێك (تەلیسم/طلسم)، گوایە گوزارشت لە پاراستنی ئافاتەکان دەکات[٤].**

**١٩- تَین/ تەین :**

**چیایەکە لە نێوان حولوان و هەمەدان[٥].**

---

(١) – معجم البلدان، ، مج١، ص ٥١٥.

(٢) - الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ١١٥.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ٥١٥. هەروەها بڕوانە: ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٣١٦.

(٤) - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٠٠؛ مج٥، ص ٤١٥.

(٥)- المصدر نفسه، مج٢، ص ٦٩.

**٢٠- زَلَم/ زەلەم (گۆەی زەلم):**

چیایەكە لە نزیك شاری شەهرەزوور[١]، سەبارەت بە ناوەكەی یاقوت دەیگەڕێنێتەوە بۆ ناوی جۆرە ڕووەكێك كە لەم چیایەدا دەڕوێت[٢].

**٢١- چیای نەهاوەند(زاگرۆس):**

ئەم چیایە دەكەوێتە شاری نەهاوەند، سەروچاوەی ئاوێكی لێیە، كە دەبێت بە دوو لق[٣]، لقێكیان بۆ نەهاوەند، لقەكەی تر بۆ دینەوەر دەچێت[٤]. پەنهانێكی (طلسم) بەفرینی لەسەر شێوەی ماسی و مانگایەك بۆ پارێزگاری كردنی لەكەم بوونەوەی ئاوی سەر ئەم چیایە[٥]، بۆ دروستكراوە.

**٢٢- سِن سُمَيْرَة/ سِن سومەیرە[٦]:**

چیایەكە لە دواوەی شاری قەرمیسین(كرمانشا)[٧]، دەكەوێتە نێوان دینەوەر و قەرمیسین[٨].

**٢٣- چیاكانی هەمەدان:**

شاری هەمەدان، زنجیرە چیایەك لەخۆدەگرێت، كەچەندان قەڵا و ناوچەی دەكەوێتە سەر[٩].

---

(١) - معجم البلدان، مج٣، ص ٣٧٥.
(٢) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٤٦.
(٣) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٩٦؛ مج٢، ص ٣١٣.
(٤) - القزويني، عجائب المخلوقات، ص ١٠٧.
(٥) - معجم البلدان، مج١، ص ١٩٦؛ مج٥، ص ٣١٣. هەروەها بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٢٧.
(٦) - ناوی ئەم چیایە لەوە هاتووە، كاتێ سوپای موسڵمانەكان بۆ فەتح كردنی ناوچەكانی نەهاوەند گەیشتوونەتە چیایەك، كە بەرزتر بووە لە چیاكانی دەورویەری، بۆیە وتوویانە ئەم چیایە لە ددانی سومەیرە دەچێت، كە ئافرەتێكی بەنی معاویەی كوڕی كەعب بوو. معجم البلدان، مج٣، ص ٢٦٩.
(٧) - المصدر نفسه والصفحه.
(٨) - سهراب، المصدر السابق، ص ١١٤.
(٩) - معجم البلدان، مج٣، ص ٢٦٨؛ مج١، ص ١٦٩.

**٢٤- سَبَلان/ سەبەلان:**

**چیایەکی گەورەیە، دەڕوانێتە سەر شاری ئەردەبیل لەسەر خاکی ئازەربایجان[١]، بەدرێژایی ساڵ بەفر دایپۆشیوە[٢]، لە قەد پاڵەکانی سەرچاوەی کانزایی هەیە[٣].**

**٢٥- أبَرَشْتَوِیم-أرْشَق/ئەبرەشتەویم و ئەرشەق:**

**دوو چیان لە شاری (بذ)[٤] لە نزیک موقان لە هەرێمی ئازەربایجان[٥] وەك پێگەیەکی (بابەك خورەمی)[٦] بووە.**

**٢٦- الحارِث و الحوَيرِث /حارس و حوەیرس ( زنجیرە چیاکانی ئارارات):**

**ئەم زنجیرە لە هەرێمی ئەرمینیایە[٧]، کە هەمان چیای ئارارتی گەورە و بچووکن[٨]، لوتکەیەکی بەرزیان هەیە[٩]. وەکو مەزارگەی پاشاکانی ئەرمینیا بووە[١٠].**

---

(١) - معجم البلدان ، مج٣، ص ١٨٦؛ عبدالحق البغدادي، المصدر السابق، ج٢، ص ٦٩٠. هەروەها بڕوانە: مؤلف مجهول، حدود العالم، ص ٢٩.

(٢) - المهلبي، المصدر السابق، ص ١٣٩؛ معجم البلدان، مج٣، ص ١٨٦.

(٣) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٨٨.

(٤) - بذ: کورەیەکە یاخودشارێکە لە هەرێمی ئازەربایجان، . معجم البلدان، مج١، ص ٣٦١.

(٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ٦٥، ص ١٥٢.

(٦) - بابەك خورەمی: ئەو کەسایەتییە بوو سەرپەرشتی جموجۆڵی خورەمییەکانی دەکرد لەناوچەی ئازەربایجان و ئەرمینیا، لە دژی خەلافەتی عەباسی لە ساڵی (٢٠١-٢٢٢ك/٨١٦-٨٣١ز) بانگەوازی ئایینی خورەمی دەکرد دواتر لەلایەن خەلیفەلەساڵی(٢٢٣هـ/٨٣٢ز)کوژراوە. البغدادي، الفرق بين الفرق، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، (بيروت: ١٩٩٥)، ص ص ٢٦٦-٢٦٧.

(٧) - معجم البلدان، مج٢، ص ٢٠٥. هەروەها بڕوانە: الاصطخري، المسالك و الممالك، ص ١١٢.

(٨) - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: اسماعيل شكررسول، المرجع السابق، ص ٣٦.

(٩) - القزويني، اثار البلاد، ص ٤٩٦.

(١٠) - الاصطخري، المسالك والممالك، ص ١١٢؛ معجم البلدان، مج٢، ص ٢٠٥.

**٢٧- قَبْق / قەبق - قۆقاز :**

چیایەكە لەلایەك بەشاری دەربەند (باب الابواب) بەستراوە[١]، لەلاكەی تری بە ولاتی ڕۆم، درێژ دەبێتەوە بۆ سنووری ولاتی خەزەر و ئالان[٢]، یاقوت زانیاری لە كتێبەكەی (ابن الفقیه الهمذاني) وەرگرتووە، كە خەڵكانی ئەم چیایە خاوەن حەفتاو دوو زمانن[٣]، كەگوزارشتە لە فرەیی رەگەز و ئاین وزمان لەم ناوچەیە دا. درێژیەكەی( پێنج سەد فەرسەخە/ ٣٠٠٠ كم).[٤]

**٢٨- بُعال/بوعال:**

چیایەكە لە دەوروبەری ئەرمینیا[٥].

**٢٩- سنك اسفید/ سنك ئەسفید :**

چیای پتەوە لە نزیك شاری خیلات (خلاط)مەلازگرد (مەلازجرد)[٦].

**٣٠- نُقان/نوقان:**

ناوی چیایەكە لە هەرێمی ئەرمینیا[٧].

**٣١- چیاكانی لورستان(پشتەكوە):**

ناوچەی لورستان زۆرینەی خاكەكەی بە چیا داپۆشراوە[٨]، لە ڕوانگەی یاقوتیشەوە ناوچەیەكی چیایە، هەروەكوچۆن چیاكانیشی دەڕواننە سەر ناوچەكانی (اندامش[٩])

---

(١) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٠٦.بە(قیتق) ش ناوی هاتووە. سباهی زادة، المصدر السابق، ص١٠٩.
(٢) -. معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٠٦
(٣) - البلدان، ص ٥٩١؛ معجم البلدان، مج٤، ص ٣٠٦. بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب، مج ١، ص ٩١.
(٤) - معجم البلدان، مج٤، ص ٣٠٦.
(٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ٤٥٢.
(٦) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٢٦٨.
(٧) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٢٩٧.
(٨) - القلقشندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٣٤٥.
(٩) - ئەندامش: ناوچەیەكە لە نێوان چیاكانی لور و جندیسابور. معجم البلدان، مج١، ص ٢٦٠.

و (ایذج[١])، لوتکەشیان سەرکەشەو هەمیشە بەفری زۆری لێ دەبارێت[٢].

**٣٢- قُفْص/ قوفس:**

**ئەم چیایە دەکەوێتە هەرێمی کرمان[٣]، ناسراوە بە چیای کوردەکان[٤]، سەبارەت بە سنوورەکەی، یاقوت زانیاریی لەکتێبەکەی (المقدسی) وەرگرتووە، کەوا ناوچەکانی جروم و جیفرت و رۆزبار دەکەونە دواوەی ئەم چیایە، هەروەها ئەخواس و بیابانی نێوان قفس و مەکران دەکەونە لای ڕۆژهەڵاتی و لای ڕۆژئاواکەشی بەلوس و هورمزە[٥].**

## ب -ڕووبار و سەرچاوەی ئاوییەکان

**یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی رووی زەوی ناوچە کوردنشینەکان، هەبوونی پانتایی ئاوییە، کە بە چەشنێك لە ڕووبارو دەریاچە و سەروچاوەی گەورە و گرنگ بەدیاردەکەوێت، لەلایەن یاقوت ئاماژە بەمانەی خوارەوە کراوە.**

**١- دِجْلَة/ دیجلە.**

**بۆ ناوی ئەم رووبارە یاقوت زانیاریی لە هەمزە ئەسفەهانی وەرگرتووەو دەڵێت: لەشێکراوەکەی وشەی (دلید)ەوە هاتووە. بەناوی تریش ناوبردراوە وەك (ئەرنەکروز وکودەك دەریا) یا دەریای بچووك[٦]، ئەم ڕووبارە لە چیاکانی ئامێد هەڵدەقوڵێت[٧]، لە شوێنێك پێی دەڵێن:**

---

[١] - ئیزج: کورەیەکە لە نێوان خوزستان وئەسفەهان. معجم البلدان، مج١، ص ٢٨٨.
[٢] - المصدر نفسه، مج١، ص ٢٨٨.
[٣] - معجم البلدان، مج٤، ص ٣٨١.
[٤] - المشترك وضعا، ص ٣٥٦؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٣٥.
[٥] - احسن التقاسیم في معرفة الاقالیم، ص ٣٤١؛ معجم البلدان، مج٤، ص ٣٨١.
[٦] - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٤.
[٧] - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٤٩؛ البکري، المسالك والممالك، ج١، ص ص ١٧٦-١٧٧. کەچی لەهەندێ سەرچاوە دەرچەکەی لەولاتی رۆم دادەنێن. سباهی زاده، المصدر السابق، ص٨٢.

(هلــورس)[(١)]، یەكەمین ئاو كە دەڕژێتە ئەم ڕووبارە لــە خــاكی (شمشـاط)ە، لــە خاكی ڕۆم، پێــی دەڵـێن ڕووبــاری (كـلاب[(٢)])، هــەروەها ڕووبــاری (ذیـب) كـە سەروچاوەكەی لە ئەرمینیایە[(٣)]، ژمارەیەكی زۆر لە چەم تێكەڵی دەبێـت، وەكـو ساتیدما و زور، بەلاّم بەرەبەرە ئاوەكەی زیاد دەكات، كاتێ چەمی ڕەزمی دەڕژێتە ناو.

كاتێ دەگاتە شاری بەدلیس و دەوروبەری خیلات ئاوی تری تێكـەڵاّو دەبێـت، وە بەشارە كوردنشینەكان ئامەد و مەیافارقین و حیصن كەیفا و جەزیرەی ئیبن عومەر دا تێپەڕ دەبێت و دواتر بـۆ بەلـەد و موسـل درێـژ دەبێتـەوە بـۆ (حدیثـە)[(٤)] و سن(فتحە)[(٥)] بەردەوام دەبێت، تاكو دەگاتە شاری بەغدا[(٦)]، بەمجۆرە ڕووباری دیجلە بە ناوچەیەكی زۆری خاكی كوردستان تێپەڕ دەبێت[(٧)].

١- هِرْمَاسْ/ هیرماس:

ڕووبارێكە لە شاری نەسێبین بە جۆرێك دەرچە و سەرچاوەكەی هەر لەم شارەیە[(٨)]، كێڵگەكانی ئاودێر دەكات[(٩)]، لــە بــەر زۆری ئاوەكــەی ئــەم ڕووبــارە بەبــەرد و

---

(١) - معجم البلدان، مج٢، ص٤٤١.
(٢) - المصدر نفسه والصفحه.
(٣) - المقدسي، المصدر السابق، ص ١٣١؛ البكري، المسالك والممالك، ج١، ص ١٧٧.
(٤) - حدیثـە: شارۆچكەیەك بووە لەسەر دیجلە، جیاوازە لەگەل حدیسەلی شاری ئەنبار.معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٣.
(٥) - سن: ناوچەیەكە لەرۆژهەلاّتی دیجلە، معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٠.
(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٤١؛ الانصاري، المصدر السابق، ص ص ٩٥-٩٦؛ ابـن فضـل الله العمـري، المصدر السابق، تحقیق: احمد زكي، ج١، ص ٧٩.
(9) Kerim Yildiz, The Kurdistan Iraq, (London:2004) P.9.
(٨) - معجم البلدان، مج٥، ص ٣٣٩. هەروەها بڕوانە: المهلبي، المصدر السابق، ص ١١٢.
(٩) - سهراب، المصدر السابق، ص ١٢١.

پێکهاتەی کاریزن داخراوە، بۆ پاراستنی شارەکە لە ژێر ئاوکەوتنی[١]. ئاوەکەشی بەشێوەیەکی ڕێك و پێك لە نێوان (ثرثار) و (خابور) دابەش دەبێت[٢].
ئەو بەشەی کە بۆ ڕووباری (ثرثار) دەچێت، پێی دەڵێن ڕووباری نەسێبین[٣]، دواتر دەڕژێتە دیجلە[٤]، بەشەکەی تری بۆخابور لە (قرقیسیا)[٥] دەڕژێتە ڕووباری فورات[٦].

٢- ساتیدما[٧]:

ڕووبارێکە لە نزیك شاری ئەرزەن[٨]، دەرچەکەی لە وڵاتی ڕۆمە[٩]، ئاوی ڕووباری مەیافارقینیش لەخۆدەگرێت[١٠].

٣- خَابُور/ خابوور[١١]:

ناوی ڕووبارێکی گەورەیە لە نێوان شاری ڕەئسولعەین(راس العین)و فورات[١٢]، کە لە ڕەئسولعەین دەردەچێت واتا سەرەتای ئاوەکەی لەم شارەیە[١٣]، لە نزیك

---

(١) - معجم البلدان، مج٥، ص ٣٩٩؛ القزويني، اثار البلاد، ص ٣٦٨.
(٢) - محمد جاسم الحمادي، المرجع السابق، ص ٦٣.
(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ٧٥. بڕوانە: سهراب، المصدر السابق، ص ١٢١.
(٤) - معجم البلدان، مج٥، ص ٣٣٩؛ الحميري، المصدر السابق، ص ٥٩٥.
(٥) - قەرقیسا: شارێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات. المهلبی، المصدر السابق، ص ١١٢.
(٦) - معجم البلدان، مج٤، ص ٣٢٧؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٨١.
(٧)- ناسراوە بە(بطمان سو). لیسترنج، المرجع السابق، ص١٤٣.
(٨) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٦٩.
(٩) - المصدر نفسه والصفحه؛ مج٢، ص ٤٤١.
(١٠) - ئەو ڕووبارەی، کە دەرچەکەی لەمەیافارقینە بە (باسانفایە) ناوی هاتووە .سباهی زادە، المصدر السابق، ص٨٤.
(١١) - لقە گەورەکەی ئەم ڕووبارە هاوکات ناوی هیزلە. عەبدوڵڵا غەفور، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٨.
(١٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣٤.
(١٣) - المهلبي، المصدر السابق، ص ١١١.

قەرقیسیا تێکەڵاوی فورات دەبێت، بە گرنگترین ئاوی ڕووباری هرماس دەژمێردرێت[1].

٤- خَابُور الحسِنية/خابوور حسێنیە(زاخۆ)[2]:

ڕووبارێکە دەکەوێتە چیاکانی شاری موسل، سەرەتا ناوچە و گوندی چیاکانی موسل ئاودێر دەکات، دواتر دەڕژێتە دیجلە[3]، بەڵام لە ڕایەکی تردا یاقوت لە کتێبەکەی (المسعودی) وەرگرتووە بەشێوەیەك ئەم ڕووبارە دەرچەکەی لە خاکی ئەرمینیایە و دەڕژێتە دیجلە لە نێوان باسورین و فیشابور[4] لە ناوچەکانی باقردای لەخاکی موسل[5].

٥- ثَرثار/ سەرسار:

ڕووبارێکی گەورەیە لە هەرێمی جەزیرە، کاتێ لەگەڵ هرماس، ڕووباری نەسێبین پێك دێنن بە شاری حەزەر (حضر)[6] تێپەڕ دەبێت و دواتر دەڕژێتە ڕووباری دیجلە، لەوێوە دەگاتە (تکریت)[7]، بەڵام کاتێ ئاوەکەی کەم دەبێتەوە، تەنیا لەشێوەی گومێکی خوێاوی دەمێنێتەوە، لە وشکانییەکانی نێوان سینجار وتکریت[8].

---

(١) - ابن رسته، المصدر السابق، ص ٩٤؛ البكري، المسالك والممالك، ج١، ص ١٧٨.

(٢) - ئەم ڕووبارە بە شارۆچکەی زاخۆ لە باکووری ڕۆژهەلاتی موسل تێپەڕ دەبێت، دەڕوات لەگەڵ نەزیل سوو تێکەڵاو دەبێت و ئینجا لە ڕووباری دیجلە دەڕژێ، عەبدوللا غەفور، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٨؛درویش یوسف حسن، المرجع السابق، ص٥٤.

(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣٥.

(٤) - فیشابور: ناوچەیەکە لە ناحیەکانی موسل لە ڕۆژهەلاتی دیجلە.معجم البلدان، مج٤٠، ص ٢٨٤.

(٥) - المسعودي، مروج الذهب، ج١، ص ٧١؛ معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣٥.

(٦) - حەزەر: شارێکە لە نێوان تکریت و سینجار. القزويني، اثارالبلاد، ص ٣٤٥.

(٧) - تکریت: شارێکی بەناوبانگە لەنێوان موسل و بەغدا، نێوانی لەگەڵ شاری بەغدا (سی فەرسەخ/١٨٠کم)ە. معجم البلدان، مج٢، ص ٣٨.

(٨) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٧٥.

**٦- بَليخ/ بەليخ:**

**ڕووبارێکه لەسەروچاوەی (ذهبانية) له شاری حەڕان هەڵدەقوڵێ و دەڕژێته ڕووباری فورات[(١)] .هاوکات لەوولاتی سوريايه.**

**٧- خازِر/خازير:**

**ئەم ڕووباره به نێوان شاری هەولێر(ئيربلە) و موسل (موسل)تێپەڕ دەبێت، له نێوان زێی گەوره و بچووك درێژ دەبێتەوه[(٢)] . پێشی دەوترێت (بريشۆ)[(٣)] ، سەرەتای ئەم ڕووباره له (اربون)ی ناوچەکانی (نحلا-نەهلا)يه[(٤)] ، پاشان دەچێته چەند ناوچەيەکی چيايی[(٥)] ، دواتر دەرژێته زێی گەوره[(٦)] .**

**٨- زَاب الأعلى والأسفل/زێی گەوره و بچووك:**

**ئەم دوو زێيه له هەرێمی جەزيرەن، زێی گەوره له نێوان موسل و ئيربلە، دەرچەکەشی له سنووری نێوان (بابغيش) [(٧)] و ئازەربايجانه[(٨)] ، ياخود بەشێوەيەکی گشتی لەخاکی ئەرمينيا هەڵدەقوڵێت[(٩)] ، لەبەر تيژڕەوەی ئاوەکەی بەشێت ناسراوه[(١٠)] ، بەڵام زێی بچووك له چياکانی سلق(لاهيجان) له شەهرەزوور**

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ٤٩٣. هەروەها بڕوانه: ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٥٠.

(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣٧. بەريشو وشەيەکی ئاراميه بەمانای چۆمی سەرەکی دێت. درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٢٧، هامش رقم(٨).

(٣) - معجم البلدان، مج ١، ص ٤٠٦؛مج٢، ص٣٣٧.

(٤) - نەهلا ناوچەيەکه له ڕۆژهەڵاتی موسل له نزيك خازر، هاوکات دەکەوێته نێوان ئاکرێ و ئامێدی. معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٧٦؛درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٤٩.

(٥) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣٧.

(٦) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٢٧٦

(٧) - بابغيش: ناحيەيەکه لەنێوان ئازەربايجان و ئەردەبيل. معجم البلدان، مج١، ص٣٠٨.

(٨) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٢٣ ؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٨٤.

(٩) - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٥٠؛المسعودي، مروج الذهب، ج١، ص ٧١.

(١٠) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٢٤؛ القزويني، عجائب المخلوقات، ص١١٠؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٨٤.

هەڵدەقوڵێ، لەوێوە تێپەڕ دەبێت بە ئیربل(هەولێر)، ئینجا درێژ دەبێتەوە بۆ ناوچەكانی سن(فتحه)، پاشان دەڕژێتە دیجلە[1].

١٠- خَوْسَر/ خەوسەر

دۆڵێكە لە ڕۆژهەڵاتی موسل، ئاوەكە لە ڕووباری دیجلە بەتاڵ دەبێت و ئاوەڕۆكەشی بۆ گوندی باجەبارا لە ڕۆژهەڵاتی موسل دەڕوات[2].

١١- جُلاب/جولاب:

ناوی ڕووبارێكە لە شاری حەڕان دەرچەكەشی لە گوندێكە پێی دەڵێن (دب) دواتر دەڕژێتە بەلیخ[3].

١٢- حَشاك/حەشاك:

دۆڵێكە یان ڕووبارێكە لە هەرێمی جەزیرە لە نێوان دیجلە و فورات، ئاو لە هرماسەوە وەردەگرێت[4].

١٣- صَنْجِة/سەنجە

ڕووبارێكە لە نێوان دیارموزر و دیاربەكر، پردێكی بەناوبانگی لەسەربووە[5].

جگە لەمانە ئاوی ژێر زەویش یەكێكە لە سەرچاوە ئاوییەكانی ئەم هەرێمە، كە هەندێ ناوچەكان پشتی پێ دەبەستن، وەك لەشاری ئیربل(هەولێر)[6] و

---

(1) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٢٤.

(2) - معجم البلدان، مج١، ص ٣١٤؛ مج٢، ص ٤٠٦.

(3) - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٤٩. ڕەنگە ناوە ڕەسەنەكەی گولاو بێت، چونكە لەڕووی واتایەوە (جۆلاب) لەزمانی كوردی گولاوە واتا تەعریب كراوە. جگە لەمەش لەڕووی ڕێزمانییەوە لەوانەیە وشەی (گ) لەعەرەبی نیە گۆڕدرابێت بۆ (ج) وەكو گەلالیە بۆ جەلالیە.

(4) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٦٢. وەلەبەر ئەوەی ئاو لەهیرماسەوە وەردەگرێت بۆیە بە(حەشاك) ی عەرەبی ناوبردراوە، كە بەمانای دەمەوانە دێت لەكوردی، بۆیە دەتوانین بڵێن ڕەنگە ئەم ناوەش بەعەرەبی كرابێت.

(5) - معجم البلدان، مج٣، ص ٤٢٥. هاژەی ئاوی ئەم ڕووبارە بەرز بووە، لەبەر ئەوەی ئاوی زۆربووەو پردی بۆدروستكراوە، هەربۆیەش كاتێ ناوی بۆ عەرەبی گۆڕاوە بۆتە (صنجه) واتا دروستكەری دەنگ لەزمانی كوردیدا.

(6) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨.

**(برطلی)[١] و(برقعید)[٢]، جگـە لـەو سەروچـاوانە لـە ئامێـدو رەئسـولعەین دا هەیە[٣].**

**هەروەها دەریاچە و رووبارەکانی هەرێمی چیاکان بەشارو ناوچە کوردییەکانی ئەم هەرێمە تێپەڕ دەبن، وەکو لە گوندی (بالیوب)[٤]، دەریاچەیەکی بچووکی هەیـەو ئاوی تێدا زۆرە[٥].**

**رووبارێکی گەورە و فراوانیش دەرچەکەی لە چیاکانی شەهرەزوورە[٦] و لە شـاری هەمـەدانیش دەریاچـەی (فرهـان) بـە دووری (چوارفەرسـخ/ ٢٤ کـم) ە، کـە کێلگەکانی هەمەدان سوودی لێوەردەگرن[٧]. شاری بچووکی (جزدان) لـە شـاری شەهرەزووردا خاوەن دەریاچەیەکە[٨]، هەروەها شاری نەهاوەند خاوەن رووبارێکـە جۆرە قوڕێکی رەش لەسەر کەنارەکانییەتی بۆ خەتم دروستکردن بەکارهێنراوە[٩]. لە (مسعر بن مهلهل)ەوە وەریگرتووە، سەروچاوەیەك لە گونـدی (ولاسـجرد[١٠]) هەیە بۆ ناوچەکانی هەمەدان دەچێت[١١].**

**وە ئەوڕووبار و سەرچاوە ئاویانەی لە هەرێمی ئازەربایجان و ئاران و ئـەرمینیاش لەکتێبی (معجم البلدان)دا بە ناوچەکوردنشینەکان تێپەر دەبن، لـەخۆوە دەگـرن ئەمانەن:**

---

(١) –(برطلی) بەرتولی/بەرتلە:گوندێکە لەدەوروبەری موسل. معجم البلدان، مج١، ص ٣٨٥.

(٢) -بەرقەعید: شارە دێیەکە لەتەنیشت بقعائی موسل لەلای نسێبین. معجم البلدان، مج١، ص ٣٨٧.

(٣) - المصدر نفسه، مج١، ص ٥٦، مج٣، ص ٢٦٢.

(٤) - بائەیوب: گوندێکە لە نێوان کرماشان و هەمەدان، معجم البلدان، مج١، ص ٣٠٢.

(٥) - المصدر نفسه و الصفحه.

(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ٧.

(٧) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٢٥٨.

(٨) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٣٧٥. هەروەها بڕوانە: مسعر بن مهلهل، المصدر السابق، ص ١٩.

(٩) - معجم البلدان، مج٥، ص ٣١٣.

(١٠) -ولاسجرد: لە ناحیەکانی دەوروبەری هەمەدانە. معجم البلدان، مج٥، ص ٣٨٣.

(١١) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٣٨٣.

**١٥- رَس/رەس- ئاراس:**

**ئەم ڕووبارە دەرچەکەی لە شاری قالیقلایە، بە هەرێمی ئەرمینیا تێپەڕ دەبێت و بەرەو شاری (ورثان)[١] و بەیلەقان تاکو دەگاتە ڕووباری (الکر)، بەیەکەوە دەریای خەزەر پێك دێنن[٢]. شاری (برزند)[٣] و بەرزەعە دەبڕێت[٤].بەشێوەیەکی گشتی دەکەوێتە نێوان ئازەربایجان وئەرمینیا.[٥]**

**١٦- کُر/ کور:**

**ئەم ڕووبارە لە نێوان ئەرمینیا و ئارانە، شاری (تفلیس)[٦] شەق دەکات، نێوانی لەگەڵ بەرزەعەش (دوو فەرسەخە/١٢ کم)[٧]. ڕووبارێکی سازگارە و زانیاری لە (الاصطخري)یەوە وەردەگرێت، کە چۆن ئەم ڕووبارە بە هێمنی و بەڕوونشینش بە ولاتی (جرزان)[٨] و ئینجا (ابخاز)[٩] و ناوچەکانی ئالان تێپەڕ دەبێت[١٠].**

**١٧- کَلان رُوذ/ کەلان روز:**

---

(١) -کۆتایی سنوری لای باکووری هەرێمی ئازەربایجانە، نێوانی لەگەڵ ڕووباری ئاراس (دووفەرسەخە/١٢کم). معجم البلدان، مج٥، ص ص٣٧٠- ٣٧١.

(٢) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٤٤. هەروەها بڕوانە: ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٦٩.

(٣) -بەرزەند: شارێکە لەباکوری ڕۆژهەلاتی هەرێمی ئازەربایجان، بەڵام یاقوت بەشارێکی دەوروبەری تەفلیس لە ئەرمینیا دادەنێت، ڕەنگە مەبەستی بەرزەنجی هەرێمی ئاران بێت، چونکە ئەو نزیکترە لەشاری تەفلیس. ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣٠٠، معجم البلدان، مج١، ص٣٨٢. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە :النقشبندی، اذربیجان، ص ص٧٣-٧٤.

(٤) - مسعر بن مهلهل، المصدر السابق، ص ١٣؛ معجم البلدان، مج٣، ص ٤٤.

(٥) - القزوینی، اثار البلاد، ص٢٨٥، ص ٤٩٥.

(٦) -تەفلیس: بەپێی بیروڕای یاقوت شارێکی کۆنە یا دەکەوێتە ئاران یان ئەرمینیا، لەبەرئەوەی ئاران بەشێك بووە لەئەرمینیا، کەواتە هەردووەدەستنیشان کردن یەك شوێنی شارەکەیە.معجم البلدان، مج٢، ص٣٥.

(٧) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٤٥١؛ القلقشندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٤٠٠.

(٨)- ناحیەیەکی فراوانی هەرێمی ئەرمینیایە، وەکو ئاران بەشێکی فراوانی ئەرمینیا پێکدێنێت ومەڵبەندەکەشی تەفلیسە.معجم البلدان، مج ٢، ص ١٢٥.

(٩) - ناوی ناحیەیەکە لەچیای قۆقاز لەتەك شاری دەربەندە. معجم البلدان، مج١، ص٦٤.

(١٠) - المسالك و الممالك، ص ١١١؛ معجم البلدان، مج٤، ص ٤٥١.

ڕووبارێکە لە ئازەربایجان لە نزیك شاری بە ز[١].

١٨- إسبيذروز/ ئیسبیزرووز (سبیدروز)

بە ڕووباری سپی بەناوبانگە لە هەرێمی ئازەربایجان[٢].

١٩- ڕووباری کورد:

ئەم ڕووبارە لەشاری دوینە و مێرگەکانی ئەم شارە ئاودێر دەکات[٣].

*** هەروەها دەریاچەش لە ناوچە کوردنشینەکان لە کتێبی معجم البلداندا بەدی دەکرێت.**

أ- أُرْمِيَة / دەریاچەی ئورمیە:

ئەم دەریاچەیە دووری لە شاری ئورمیە (دوو فەرسەخ/١٢کم)ە[٤]، کە بەناوی جۆراوجۆر باسکراوە، وەك (طروج[٥]) (تلا[٦]) (کبوذان) وچیچست .[٧] ئاوەکەشی بەوە وەسف کراوە کە تاڵە و هیچ گیاندارێکی تێدا ناژیت[٨].

ب- زَرَاوَنْد/ دەریاچەی زەراوەند:

دەربارەی ئەم دەریاچەیە یاقوت زانیاری لە (مسعر بن مهلهل) وەرگرتووە، کە لەشاری سەلماسەوە درێژ دەبێتەوە بە ئورمیەش تێپەر دەبێت وبۆ شوێنێك دەچێت کە بە (وادی الکرد)ناسراوە[٩].

---

(١) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٤٧٥.

(٢) - المصدر نفسه، مج١، ص ص ١٧٢-١٧٣.

(٣) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٤٦.

(٤) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٥٩.

(٥) - حمدالله المستوفي القزويني، نزهة القلوب، ص ص ٢٢٣- ٢٢٤، ص ٢٤١.

(٦) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٩٧؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٦٧.

(٧) - احمد عبد العزيز، المرجع السابق، ص٣٩.

(٨) - معجم البلدان، مج١، ص ١٥٩.

(٩) - الرسالة الثانية، ص ١٤، معجم البلدان، مج٣، ص ١٣٦.

**جـ- أرْجِيش /دەریاچەی ئەرجیش [(١)]:**

**ئەم دەریاچەیە بە خیلاتیش(خلاط) ناسراوە[(٢)]، كەوتۆتە بەشـی رۆژهـەلاتی ئـەم شارە[(٣)]، هاوكات ناسـراوە بـە دەریاچـەی (وان[(٤)]) وە بـە یـەكێك لـە دەریاچـە سەرسوڕهێنەرەكانی ئەرمینیا دەژمێردرێت[(٥)].**

**لەهەرێمی فارسیشدا یاقوت زانیاری لە (المقدسی) وەردەگرێت، كە ڕەمە كوردییەكان ڕووباری تێدا بووە[(٦)]، بەڵام لە بیابانی خوراسان سەرچاوەی ئاوی كوردەكان لـە بیرەكـان بووە[(٧)].**

**ڕووی زەوی كوردنشینەكان، جگە لەو دوو پێكهاتەیەی كە ئاماژەمان پێكرد، ناوچەی دەشتاییش زۆر پانتایی خاكی پێك هێناوە، بەتایبەتی ئەگەر بەشێوەی گشتی سەیری ئەم هەرێمانە بكەین لە چوارچێوەی سنووری جوگرافیكەیدا.بە جۆرێك لە هەرێمی جـەزیرەدا شاری حەران (لەسەر پانتایی زەوی دروستكراوە[(٨)]) (شـاری ئەربلیش(هـەولێر) كـەمێك لەئاست زەوی بەرزترە[(٩)])، لە هەرێمی چیادا ناوچـەكانی ئاریۆجـان (پانتاییـە[(١٠)]) لـە هەرێمی ئاران شاری بەرزەعە (لەسەر زەوی بنیاتنراوە[(١١)])، لەگەڵ ئەمەشدا خوزستان بە**

---

(١) - معجم البلدان، مـج١، ص ٣٥٠. هەروەها بڕوانە: الاصـطخري، المسـالك والممالـك، ص ٨٢؛ ابوالفـداء، المصدر السابق، ص ٤٢.

(٢) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٥٠. هەروەها بڕوانە: ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٩١.

(٣) - سباهي زادة، المصدر السابق، ص٦٦.

(٤) - دەریاچەی وان بە گەورەترین دەریاچە لە كوردستان دادەنرێت. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانـە: حكيم عبـدالرحمن زبير، مدينة خلاط، (اربيل: ٢٠٠٥)، ص ٣٤.

(٥) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٥٠؛ حكيم عبدالرحمن زبير، المرجع السابق، ص ص ٣٤-٣٥.

(٦) - احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص ٣٢١؛ معجم البلدان، مج٣، ص ٧١.

(٧) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٤١٦.

(٨) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٣٥.

(٩) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٧.

(١٠) - ئاریوجان: كورەیەكی ماسەبەزانە لەلای ڕاستی حولوان .معجم البلدان، مج١، ص ١٦٧.

(١١) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٧٩.

**خاکێکی مسی وەسف کراوە[1]. پشت بەستنی خەڵکی ناوچەکان بە ئاوی بیرەکان بەڵگەیە بۆ دەشتایی خاکی کوردستان[2].**

## دووەم- ئاو وهەوا:

**لە کتێبەکەی یاقوت زانیاری دەربارەی ئاو و هەوای ناوچەکوردنشینەکان بێ کەموکورتی نییە، لەبەر ئەوەی لە وەسفی هەر ناوچەیەکدا بەشێوەیەکی تایبەتی ئاوو هەواکەی دیار ناکات، بەڵام لە بەدەرخستنی هەندێ لەو باسانەی، کە کاریگەریی راستەوخۆی لەسەر پلەی ساردی و گەرمی هەیە، ئێمە دەتوانین ئاووهەوای ناوچەکوردنشینەکانی تێدا بەرجەستە بکەین و هەندێ لەو هۆکارانەی، کە کاریگەری، لەسەرئەم بارە سروشتیەی ناوچەکان هەیە، ( وەکو ڕووی زەوی و چیاکان و ڕووبارەکان و سەرچاوە ئاوییەکان و ڕێژەی بەفر و باران بارین)، هەروەکو لە هەرێمی جەزیرە، لەسەر لوتکە چیای شەعران بەفرێکی زۆری لێدەبارێت و ناتوێتەوە[3]. چیاکانی ئامێدیش سەروچاوەی ئاوی لێ هەڵدەقوڵێت[4]، لەگەل ئەمەشدا (المقدسی) ئاماژە بەساری ئاووهەوای شاری ئامەددەکات. [5] بوونی کارێز و بیر لە هەندێ ناوچەی ئەم هەرێمە[6]، ئەوانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە ئەم ناوچەیە بەفروبارانی زۆری لێ دەبارێت.**

**هەروەها هەندێ ناوچەش ئاوو هەوای مام ناوەندییە، وەك لە شاری موسل، زستانی سارد و هاوینی گەرمە[7]، تەنانەت زستانی ئەم شارە بەزستانێکی سەخت و هەوای**

---

(١) – معجم البلدان، مج١، ص ٢٨٦.

(٢) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٧، ص ٣٨٥، ص ٣٨٧.

(٣) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٣٤٩.

(٤) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٤٤١.

(٥) - حسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٢٩.

(٦) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٨، ص ٣٨٥، ص ٣٨٧.

(٧) - معجم البلدان، مج٥، ص ٢٢٤. هەروەها (ابن الاثير) ئاماژە بەئاوهەوای ناوچەکانی سەربەشاری موسل دەکات، کەچۆن باران تا کۆتایی وەرزی بەهار بەردەوامە. الكامل، ج١٠، ص٤٠٦.

دژواروسارد وەسف کراوە. [١] هەروەهادوو کەژەکەی تر کەشەکە مام ناوەندییـە، لەبـەر ئەوەی هەندێ ناوچەی ئەم هەرێمە بە شوێنی گەشتوگوزار وەسف دەکات، وەك باقردا[٢]، بۆیە دەبێت ئاووهەواکەی نەسارد و نەگەرم بێت.

هەروەها لە هەرێمی چیاکاندا ڕشتەی شاخەکان کاریگەرە بۆ سەختی ئاووهەواکـەی، لەکتێبەکەی یاقوتیشدا بە هەمان شێوە کوشندەی هەواکەی و ڕێژەی بـەفر بـارینی زۆر بەدیار دەکەوێت[٣]. هەروەکو چۆن حولوان و نەهاوەنـد و هەمـەدانیش بـە ناوچـەیەکی هەواسارد و نالەبار وەسف دەکات[٤]. هەرێمەکانی وەك ئازەربایجان و ئاران و ئەرمینیاش ئاوو هەوای زستانەیان بەسەردا زاڵە لەبەر ئەوەی یاقوت هەندێ ناوچەی بە ئاوی سازگار و هەوای سارد وەسف دەکات[٥]، جگە لەوەی ناوچەکانیان شاخاوییە.

## سێیەم- سەرچاوە ئابوورییەکان:

ئەگەر بە وردی کتێبی (معجم البلدان)بخوێنیتەوە ئەوا بـارودۆخی ئـابووری هەنـدێ ناوچە کوردنشینەکانمان بۆ روون دەبێتەوە، کە تیایدا بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و بەرهەمە ئاژەڵییەکان و کانزاکانی باس کراوە.

بە چەشنێك یاقوت تیشکی خستۆتەسەر ئەم لایەنە، جا چ بە زانیاری وەرگرتن بێت یان وەسف کردنی شوێنەکان، کە خۆی چاوی پێکەوتبن، تەنانەت گرنگی دان بەم لایەنـە ڕوون دەبێتەوە کاتێ سەردانی شاری ئەردەبیل دەکات، ئاماژەی بەوە کردووە کە ئاوەکەی سازگارە و هەواکەی پاکە و کەچی هیچ بەرهەمێکی چاندراوی لێ ناڕوێت[٦]. یاخود لـە

---

[١] - القزويني، اثار البلاد، ص٤٦١.
[٢] - معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٧.
[٣] - المصدر نفسه، مج٢، ص ٩٩.
[٤] - المصدر نفسه، مج١، ص ١٩٦، مج٢، ص ٢٩١، مج٥، ص ٤١٢.
[٥] - المصدر نفسه، ص١٢٨، ص ١٤٥ .
[٦] - معجم البلدان، مج١، ص ١٤٥.

هەندێ شوێندا بەگشتی بارودۆخی ئابووری ڕوون دەکاتەوە، ئەمیش بە دەربڕینی ئـەوەی کە خێرو بێری تێدا زۆرە[١]، یا چێندراوی تێدا زۆرە[٢].

## ا- بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و ئاژەڵی:

یاقوت باس لە کشتوکاڵ و بەرهەمەکانی دەکات لە هەندێ ناوچەدا و ڕوونی دەکاتەوە، کە خاوەن بێستانن[٣]. بەتایبەتی لە ناوچەکانی پەیوەست بە شاری موسل[٤]، چینی جوتیار لە ناوچەکان و دەستی کاریان لـە بـواری ئابوورییـەوە هۆکارێکـە بـۆ ئـەوەی سەرچـاوەی کشتوکاڵی لێوەبەرهەم بێت[٥]، هەندێ شاریش تایبەت دەکات بەیەك جۆر بەرهەم، هەروەك شاری خیلات بە میوەجات[٦]، شاری سینجار بە مزرەمەنییـەکان[٧]، شـاری بـەدلیس بـە سێو[٨]، هەندێ بەربووم وەك زەیتون لە (باعشیقا[٩]) پاقلەمەنییەکان لە بەرتلـە، [١٠] لـە (باصفرا) ڕەزی ترێی دەست نیشان کردووە[١١] و لەگەل لە (شقلاباذ[١٢]).

---

[١] – مجم البلدان مج١، ص ٢٨٣؛ مج٢، ص ٤٥، ص ١٣٤، ص ٤٨٠.
[٢] – المصدر نفسه، مج٢، ص ١١٥ ص، ١٣٨، ص ٥٤٥.
[٣] – المصدر نفسه، مج١، ص ٥٦، ص ١٣٨ ؛ مج٢، ص ١٣٨، ص ٤١٨؛ مج٥، ص ١٠٠.
[٤] – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤، مج٢، ص ٣٢٨.
[٥] – المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٨، مج٣، ص ٢٠٧.
[٦] – المصدر نفسه، مج٢، ص ٣٨٠.
[٧] – المصدر نفسه، مج٣، ص ٢٦٢.
[٨] – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٥٩.
[٩] – باعشیقا: گوندێکی موسلە و پەیوەستە بە ناوچەکانی نەینـەوا لـە ڕۆژهـەڵاتی موسـل. معجـم البلـدان، مج١ ص ٣٢٤.
[١٠] – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٨٥.
[١١] – باسفرا: گوندێکی گەورەیە لەرۆژهەلاتی موسل .معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٤.
[١٢] — شەقلاباز(شەقلاوە): گوندێکی گەورەیە لە دەوروبەری ئیربل، نێوانیشیان (٨ فەرسەخ/٤٨کـم)ە. معجـم البلدان، مج٣، ص ٣٥٥.

بەڕوو لەحیزان[١] و بەرزەعە بە تووە خۆر سکەکەی و هەنجیریش بەناوبانگ بـووە[٢]، بەروبوومی خورما لە (سـلامیە[٣]) و بەعشـیق و حولـوان و تەلەعفـەر[٤] قەیسـی لـە تەبرێز[٥]، هەروەها هەنجیر لەناوچەکانی دەوروبەری ڕووباری ئاراس و حولوان[٦]، هەناریش لە (قوریشییە[٧]) و هەرێمی ئازەربایجان و قەڵای شوش[٨]، برنج لە ناوچەکانی (جوجر[٩])، حولوان کونجیشی لێ هەبووە[١٠]. زافەران(زعفران)ش لە(روزراور) [١١] ونهاوند[١٢]

یاقوت باسی هەندێ بەرهەمی کشتوکاڵی لە ئەرمینیا و (دیرجرجیس)[١٣] دەکـات، دڵنیا نییە کە چ بەرهەمێکە، بەڵام بە (باوی) دەچووێنێت[١٤].

یەکێك لەو پیشانەی کە کوردەکان خەریکی بوونە، بەخێوکردنی مەڕوماڵات بـووە، کە یاقوت تیشکی خستۆتە سەر، بەتایبـەتی لەناوچـەی (سیسـر[١٥]) و وڵاتـی فـارس، کەخاوەن کێڵگەی ئاژەڵی بوون[١٦]، لـە دەریاچـەی ناوچـە کوردنشـینەکانیش ماسـی و جۆرەکانی هەبوون[١٧]، وەك لە ڕووباری کوڕ جۆرە ماسییەکی لێ دەژیا، کە بە (دواقن-

---

(١) – معجم البلدان ، مج ٢، ص ٣٣١.
(٢) – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٧٩.
(٣) – سلامیە: گوندێکی گەورەیە لە ناوچەکانی موسل. معجم البلدان، مج٣، ص ٢٣٤.
(٤) – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤، مج٢، ص ٣٩، ص ٢٩٠.
(٥) – المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣.
(٦) – معجم البلدان، مج٢، ص ٢٩٠، مج٣، ص١٤٤.
(٧) – قوریشیە: گوندێکی نزیك جەزیرەی ئیبن عومەرە. معجم البلدان، مج٤، ص ٣٣٧.
(٨) – المصدر نفسه، مج٣، ص ٤٤، ص ٣٧٢.
(٩) – جوجر: گوندێکی پەیوەستە بە قەڵاکانی (عەقرەی حەمیدی). معجم البلدان، مج٢، ص ١٧٨.
(١٠) – المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٩٠.
(١١) – روزراور:کورەیەکە نزیك لەنەهاوەند لەهەرێمە چیاکان.معجم البلدان، مج٣، ص١٣٦.
(١٢) – المصدر نفسه، مج٥، ص٣١٣.
(١٣) – دێری جەرجیس: ئەو دێرە لە جەزیرەی ئیبن عومەر. معجم البلدان، مج٢، ص ٥٣٥.
(١٤) – المصدر نفسه و الصفحه، مج١، ص ١٦٠.
(١٥) – سیسیر: ناوچەیەکە لە نێوان هەمەدان وئازەربایجان. معجم البلدان، مج٣، ص ٢٩٧.
(١٦) – المصدر نفسه والصفحه، مج٤، ص ٢٢٧.
(١٧) – معجم البلدان، مج١، ص ٣٦٠، مج٣، ص ٤٤.

عشب) ناسراو بوو[١]. کە وەك دەسکەوتێکی ئابووری سەیر دەکرێت، یاقوت لە وەسفی وەرەن (کبش)ی وڵاتی میسر دەچوێنێت بە وەرەنی کوردی[٢]، کەدیارە بەناوبانگ بووە.

## ٢- کانزا و بەرهەمە پیشەسازییەکان

کانزا و بەرهەمەکانی لە ناوچە کوردنشینەکان بەدی کراون، بەتایبەتی کبریت[٣]، بەشێوەیەك یاقوت وەسفی چەند ناوچەیەك دەکات بەوەی خاکەکەی یا ئاوەکەی کبریتیە[٤]، یا کانزاییە[٥]، جگە لەسەرچاوەی نەوت بەرهەمێکی گرنگی خانیقین[٦] و سن، [٧] و (باکویە)یە[٨].

کانزای زێرِیش وزیوەوهاڵاوی زیو زرنیخ(مەرگەمووش) لەشاری (شیز[٩]) و زێر(الران[١٠]) و (صرعون[١١])ە، ئاسنیش لە (حانی[١٢]) و(هرور) [١٣] (بالو[١٤]) و ئاریوجان، [١٥] قیریش لە ماسەبەزان[١]، کانزای زەراوند لە دەریاچەی زەراوند هەبووەو بە(البورق الزراوندی)ناسراوە. [٢]

---

(١) – معجم البلدان، مج١، ص ٣٧٩.

(٢) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٥٩.

(٣) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٤١.

(٤) - معجم البلدان، مج٢، ص ٢٢، ص ٢٩٠، ص ٢٩٩.

(٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٨.

(٦) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٣٤٠.

(٧) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٠.

(٨) - باکویە: شارێکە لە ناوچەکانی دەربەند. معجم البلدان، مج١، ص ٢٣٨.

(٩) - شیز: ناحیەیەکی ئازەربایجانە لە نێوان مەراغە و زەنجان و شەهرەزوور و دینەوەر. معجم البلدان، مج٣، ص ٣٨٣.

(١٠) - الران: شارێکە لە نێوان مەراغە و زنجان. معجم البلدان، مج٣، ص ١٨.

(١١) - صرعون: شارێکی کۆنە لە ناوچەکانی دەوروبەری موسل. معجم البلدان، مج٣، ص ٤٠١.

(١٢) - حانی شارێکی ناسراوی دیاربەکرە. معجم البلدان، مج٢، ص ٢٠٨.

(١٣) - هرور: قولغێکی پتەوە لەباکوری شاری موسل.معجم البلدان، مج٥، ص.٤٠٣

(١٤) - بالو: ناوچە و قەڵایەکە لە خاکی ئەرمینیا، معجم البلدان، مج١، ص ٣٣٠.

(١٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٦٧.

ئەو بەرهەمە ئابوورییانەی لە بواری پیشەسازی بەکار هاتوون، وەك پیشەسازی دەرمان لەو ناوچانەی کە خاکەکەی کبریتی بووە، وەك لە شاری حولوان[٣]. جگە لەبەرهەمی پەمۆکە بۆ جل وبەرگ بەکارهاتووە، لەناوچەی (حزە[٤]) و قامیشی شەکر لە (غیضة[٥])، پیشەسازی دروست کردنی جلوبەرگیش، شاری تەبریز پێوەی بەناوبانگ بووە[٦].

## ٣- بازرگانی:

شوێنە کوردنشینەکان هەڵکەوتۆتە ناوچەیەکی جوگرافی ستراتیژی بازرگانی، بەهۆی بەیەك بەستنەوەی هەموو ئەو رێگاوبانە جیاوازانەی کە دەورێکی بالآیان هەبووە لە جموجۆڵی بازرگانی و بۆتە تۆرێکی فراوان لە نێوان رێگا وشکانییەکانی نێوان وڵاتان و هەرێمەکان لەناوخۆو دەرەوە، بەمەبەستی بازرگانی دەستکەوتە زێدەکانی کشتوکاڵی و پیشەسازی و بەرهەمهاتووەکانی گیانەوەری[٧]. ئەگەر تەنیا لە روانگەی بازرگانی سەیری کتێبی یاقوت بکەین، ئەم بابەتە چەند خاڵێك کۆی کردۆتەوە، یەکێك لەو خاڵە گرنگانە بوونی بازاڕە، کە پەیوەستییەکی پتەوی بە بازرگانییەوە هەیە، یاخود دیاریکردنی هەندێ ناوچە بەشوێنی بازرگانان[٨]، هەروەها ئەو بەرهەمە ئابوورییانەی کە لەناوچەکان

---

(١) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٤١.
(٢) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٣٦.
(٣) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٩٠.
(٤) - حزە: ناوچەیەکە لە نزیك شاری هەولێر. معجم البلدان، مج٢، ص ٢٥٦.
(٥) - غیضة، ناحیەیەکە لە رۆژهەڵاتی موسل. معجم البلدان، مج٤، ص ٢٢١.
(٦) - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣.
(٧) - بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی بازرگانی لە وڵاتی کوردستان بڕوانە: اکو برهان محمد، التجارة والنظم المالیة في کردستان (٤-٧هـ/١٠-١٣م)، اطروحه دکتورا، مقدمة الی مجلس کلیة العلوم الاجتماعیة، جامعة کویە، (کۆیە: ٢٠٠٧).
(٨) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٣٠.

ئاماژەیان پێدەکات، زێدەی بەرهەمەکان بازرگانی پێکراوە لەگەڵ دیاریکردنی هەندێ رێگای ناوچە ستراتیژییەکانی بازرگانی.

## أ- بازاڕ:

گرنگترین ئەو بازاڕانەی کە یاقوت ئاماژەی بۆ کردوون لە ناوچەکانی وەك (دۆغان[1])، کە بازاڕی تێدا هەبووە و خەڵکەکەی لە مانگێ جارێك تێیدا کۆدەبوونەوە، لە بەرتولی بازاڕەکەی کڕین و فرۆشتنی تێدا دەکرا تەنانەت داهاتی ساڵانەی بیست هەزار دینار بوو[2]، لە بازاڕەکانی (باشزا[3]) رۆژانی دوشەمە و پێنج شەمەش دادەخرا، لە باعشیقا دا بازاڕ و قەیسەری هەبوو[4]، لە (اذرمة[5]) نزیکەی دووسەد دوکانی تێدا هەبووە، شاری بەرزەعەش، کە بە بازاڕی (کرکی) بەناوبانگ بوو، تەنیا رۆژانی یەکشەمە بازرگانەکان تێیدا کۆدەبوونەوەو هەموو جۆرە خەڵکێك ڕووی تێدەکرد[6].

## ب- کالاّ هەناردەو هاتووەکان:

ئەو بەرهەمانەی، کە کالاّی زێدە بەرهەمهاتوو بوون بازرگانی پێدەکرا، بەرهەمە کشتوکاڵییەکان وەك هەرمێ لە ئوشنۆ(شنۆیە)[7]، سێو لەشاری بەدلیس[8]، چەند میوەجاتێك لە بەرزەعە دەکرا بە هەناردە بۆ فارس و خوزستان(اهواز)[9]، هەروەها بەرهەمی ئاژەڵی وەك ماسی لە دەریاچەی ئەرجیش زۆر بوو، دەناردرا بۆ ناوچەکانی

---

(١) - دوغان: گوندێکی گەورەیە لە نێوان رەئسولعەین و نسێبین. معجم البلدان، مج٢، ص ٤٨٤.
(٢) — المصدر نفسه، مج١، ص ٣٨٥.
(٣) -باشزا: شارە دێیەکە لە کورەی بقعائی موسل نزیك بەرقەعید. معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٢.
(٤) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤.
(٥) - ئەزرەمە: گوندێکە لە دەوروبەرەکانی شاری موسل. معجم البلدان، مج١، ص ١٣١.
(٦) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٧٩.
(٧) - المصدر نفسه، ، مج١، ص ٢٠١.
(٨) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٥٩.
(٩) — معجم البلدان، مج١، ص ٣٧٩.

دەوروبەر و تاكو هندستان[١]، بەرهەمە پیشەسازییەكان وەك جل و بەرگ لە تەبرێز بۆ ناوچەكانی دەوروبەری بازرگانی پێدەكرا[٢]، خوێ لە دەریاچەی فرهان لەهەمەدان كوردەكان بۆ ناوچەی جیاجیان دەبرد[٣]، كانزای ئاسن بۆ دەوروبەری (حانی) و جیهانی ئیسلامی رەوانەدەكرا[٤]، جگە لەمەش هەندێ جار ناوچە كوردنشینەكان، بەرهەمەكانی دەوروبەر دەبوون بە هاوردە بۆ شارە كوردییەكان، وەك ئەربیل پشتی بەبەرهەمی دەوروبەری دەبەست[٥].

ج- ماوەی نێوان ناوچەكان بە دیار دەخات، جگە لە تیشك خستنە سەر هەندێ رێگا كە رێڕەوی بازرگانی بوون وەك:

١- رێگای ناوەخۆی ناوچە كورد نشینەكان:

ئەربل (هەولێر) ← ئورمیە (ورمێ)[٦]
ئەربل (هەولێر) ← ئوشنۆ(شنۆیە)[٧]
ئەربل (هەولێر) ← ئازەربایجان[٨]
موسل(موصل) ← نەسێبین(نصیبین)[٩]
نەسێبین (نصیبین) ← رەئسولعەین[١٠]
هەمەدان ← قەرمیسین( كرماشان)[١]

---

[١] - معجم البلدان ، مج١، ص ٣٥٠.
[٢] - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣.
[٣]- المصدر نفسه، مج٤، ص ٢٥٨.
[٤] - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٠٨.
[٥] - المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٨.
[٦] - المصدر نفسه، مج١ ص ١٥٩.
[٧] - المصدر نفسه، مج١، ص ٢٠١.
[٨] - المصدر نفسه، مج٢، ص ٤٥.
[٩] - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٨٧.
[١٠] - المصدر نفسه ، مج٤، ص ٩٢.

**هه‌مه‌دان ← حولوان**[٢]

**٢- رێگای ده‌ره‌کی شاره کوردنشینه‌کان:**

**ئیربل (هه‌ولێر) ← به‌غداد**[٣]

**هه‌مه‌دان ← به‌غداد**[٤]

******

(١)- معجم البلدان، مج١، ص ٥١٥.

(٢) - المصدر نفسه و الصفحه.

(٣) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٤٥٩؛ مج٤، ص٣٥.

(٤) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٣٤٠؛ مج٤، ص ٣٥٨.

# بەشی سێیەم

## شارو ئاوایی و ڕوالەتە تەلارسازیەكانی ناوچە كوردنشینەكان لەكتێبی (معجم البلدان)دا

**تەوەری یەكەم:**

**شار و دەوروبەرەكانی.**

**تەوەری دووەم:**

**سیماكانی( قەڵاكان، قوڵغەكان، شورەكان، دەزگا دامەزراوەكانی تر)**

# شارو ئاوایی و ڕواڵەتە تەلارسازیەکانی ناوچە کوردنشینەکان لەکتێبی (معجم البلدان)دا

ئاوەدانی و تەلار سازی دوو هۆکاری پەیوەست بە یەکن لەهەر وڵات و شوێنێکدا بن، گوزارشت لە بەرەو پێشەوەچوونی ئەقڵ و لێکدانەوەی دانشتوانی ئەو شوێنە دەکات، واتە هەموو ئەو کارانەی لەمەڕ بیناسازیدا بۆ ئاوەدانکردنەوە هاتوونەتە کایەوە، ڕەنگدانەوەی پلەی زیرەکی و شارستانێتی ئەوشوێنەیە، بۆیە هەر میللەتێك گرنگە ڕادەی توانایی خۆی بزانێ لە ڕووی بیناسازییەوە، تا بزانێ ئاستی ڕابردووی تا چ ڕادەیەك دەتوانێ کاریگەر بێت بۆ سەر ژیانی ئایندە، کتێبی (معجم البلدان) یەکێکە لەو سەرچاوە گرنگانەی کە بەشێکی گرنگی پەیوەستە بە لایەنی بیناسازیی کوردستان و ناوچە کوردنشینەکان، کەتیایدا بەشێوەیەك ئەم دیاردانە لێکدراونەتەوە، وەك بڵێی ڕووێکی گشتی شارستانییەتی ئەم ناوچانە بن، شارستانییەکەش لەوەداخۆی دۆزیوەتەوە کە بریتی بێ لەبوون و بونیات نانی شارودێهات و قەڵا و قوڵغ و شورە و کاروانسەراکان ودامەزراوەکانی تر، هەموو ئەو شتانە بەم شێوەیە خۆی لە (معجم البلدان)دا نواندووە، کە ئێمە لە خوارەوە یەکە یەکە باسیان دەکەین:

# تەوەری یەکەم

## شار و دەوروبەرکانی(اعمال)[١]

یاقوتی حەمەوی لە کتێبی (معجم البلدان) دا بەهەمان ئەو تایبەتمەندییەی کە زانیارییەکانی خۆی پێ خستوونەتە ڕوو، بەهەمان شێوە باس لە ناوچە کوردی و کوردنشینەکانیش دەکات[٢]، هەروەکو ئاماژەمان بۆ کردووە، کە چۆن ناوی زۆربەی ناوچەکان بۆ زمانی عەرەبی دەگەڕێنێتەوە، لەگەڵ تێبینی و شیکردنەوەی زمانەوانە عەرەبەکان، جگە لەمە کاتێ باسی هەندێ شار دەکات بەتەواوی شوێنی هەڵکەوتنی دیاری نەکردووە، کە ڕاستەخۆ دەکەوێتە چ هەرێمێك واتا هەندێ جار لە نێوان دوو هەرێم دەستنیشانی دەکات، وەلەبەر ئەوەی شوێنی کورد تەنها لە هەندێ ناوچەی دیاریکراودا بەدیار دەخات . بۆیە لێرەدا پشتمان بە هەندێ توێژینەوەی زانستی بەستووە، لە گەڵ چەند دەقێکی مێژوویی لەمەڕ دیاریکردنی شارە کوردنشینەکان[٣]، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەوە نەوەستاوە کە تەنیا باس لە بارودۆخی ناوەوەی ناوچەکە بکات، بەڵکو باس لە هەموو ئەو دێهات و شوێن و شارۆچکە و کورە و ناحیەکانی دەوروبەری دەکات، کە لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە شارە کان بوون:

---

[١] - یاقوت (اعمال)ی بۆ ئەو دەوروبەرانە بەکارهێناوە، کە پەیوەستن بە شارەکە، واتە هەر شارێکی گەورە چەند شاروشارۆچکە و تاخ وگەڕەك لەخۆوە دەگرێت.

[٢] - بۆ زیاتر زانیاری بگەڕێوە سەر بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

[٣] - لێکۆڵینەوەکانیش وەکو : فائزه محمد عزت، المرجع السابق ؛ النقشبندی، الکورد فی الدینور و شهرزور، اذر بیجان.؛ حکیم احمد مام بکر، المرجع السابق؛ صلاح الدین امین طه، المرجع السابق؛ احمدمیرزامیرزا، المرجع السابق. بۆ دەقە مێژوویەکانیش لە باس کردنی هەر شارێك بەرچاو دەکەوێت .

## یەکەم// شارەکانی هەرێمی جەزیرە:

### ١- أمد/ ئامەد - دیاربەکر:

بۆ پێناسەکردنی ئەم شارە یاقوت یەکەم جار هەوڵی داوە بنەچەی وشەی ناوی شارەکە لە ڕووی زمانەوانییەوە لێکبداتەوە و ڕەگەزی دروستبوونی ناوەکەی بۆ دیار بخات[١]. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ لە سەرچاوەکان هەمان ئەم وشەیە دەبەنەوە سەرناوی ئەو کەسەی کە ئەم شارەی دروست کردووە[٢]. کە یەکێکە لە شارە کۆنەکانی هەرێمی جەزیرە و گەورەترین شاری دیاربەکری ئەوکات بووە[٣]. دەکەوێتە سەر چیا لە رۆژئاوای ڕووباری دیجلەدا[٤]. هەمان ئەو ڕووبارە لە شێوەی دەمەداس (هلال) لە سێ لاوە دەورەی داوە[٥].

### ٢- میافارقین/ مەیافارقین:

بەناوبانگترین شارە لە دیاربەکری هەرێمی جەزیرەدا[٦]. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم شارە کەوتۆتە سنووری نێوان هەرێمی جەزیرە و ئەرمینیا[٧]. هەندێ جار شوێنەکەی بەخاکی ئەرمینیا ژمێردراوە[٨]، یاقوت ناوەکەشی بۆ دوو بڕگە شی دەکاتەوە. بڕگەی یەکەم (میا) کە ناوی کچی بنیاتنەری شارەکەیە و (فارقین) بەمانای جیاکردنەوە دێت واتا (بارجین) بە

---

(١) - بڕوانە: ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل٢٤.

(٢) - ئامێدی کوڕی مالك یان ئامێدی کوڕی سەمید کە یەکەمین کەس بووە ئەم شارەی بنیات ناوە. ابن شداد، المصدر السابق، ق١، ج٣، ص ٢٥٣؛ الهروي، الاشارات الى معرفة الزيارات، تحقيق: جبانيت سورمل، (دمشق: ١٩٥٣)، ص ٦٦.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ٥٦؛ مج٢، ص ١٣٤.

(٤) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٠١؛ الحميري، المصدر السابق، ص ٣.

(٥) - معجم البلدان، مج١، ص ٥٦.

(٦) - المصدر نفسه، مج٢، ص ١٣٤؛ مج ٥، ص ٣٥.

(٧) - الحميري، المصدر السابق، ص ٥٦٧.

(٨) - الادريسي، نزهة المشتاق في ذكر الامصار و الاقطار والبلدان، (د/م:د/ت)، ص ٢٨٤.

زمانی فارسی[(١)] بەچەشنێك یەکێك شوێنەکەی جیا بکاتەوە و یاخود پتەوی بکات. بەڵام (الانصاری) (م:٧٢٧ك/١٣٢٦ز) لەسەرەتا بەفارقینی داناوە، دواتر بۆتە عـەرەبی واتـە بۆتە (مەیافارقین) [(٢)]. لەگەڵ ئەمەشدا یاقوت ناوێکی تریشی خستۆتە ڕوو، کە بریتیە لە (مدود صالا) کە بەزمانی عەرەبی مانای شاری شەهیدان دێت[(٣)]. کوردە شامییەکان بە یەکێك لەپێکهاتەی دانیشتوانی شارەکە دادەنێت[(٤)].

## ٣- جَزِیرَةُ إبنِ عُمَر / جەزیرەی ئیبن عومەر-بۆتان:

یاقوت وای بۆ دەچێت کە یەکەمین کەس بنیاتی نابێ (حسـن بـن عمـر بـن الخطـاب التغلبی)(م.٢٥٠ ك -٨٦٥ز) بووە[(٥)]. بەڵام لە رایەکی تردا هاتووە کە ئەم کەسایەتییە دووبارە بنیاتی ناوەتەوە[(٦)]، کە بۆچونێکی پەسـەند تـر دروسـت تـرە، چـونکە هەنـدێ سەرچـاوە دروسـت بـوونی ئـەم شـارە بـۆ سـەردەمی دوای لافـاوی (طوفـان )ی نـوح دەگەڕێننەوە[(٧)]. ناویشی (جَزَرْتاد کَرْدو) بووە[(٨)].واتا (جەزیرەی کوردەکان)[(٩)].

کاریگەری ئاوی ڕووباری دیجلە یان بوونی دۆڵ و خەرەند و چاڵ لەم شـارە کـە بـەئاو

---

(١) - معجم البلدان، مج ٥، ص ص ٢٣٥- ٢٣٦.

(٢) - نخبة الدهر، ص ١٩١.بروانە: لسترنج، المرجع السابق، ص١٤٣.

(٣) - ئەم ناوە ڕۆمەکان لێیان ناوە، لەبەر ئەوەی کاتێ ناکۆکی لەگەڵ مـەلیکی فارسـی (سـابورذو الاکتـاف) لەم ناوچەیە ڕوویداوە، ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی مەسیحی تێداکوژراوە، بۆیە ئەم ناوەی پێ ووتراوە. معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٣٧.

(٤) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٢٣٦.

(٥) — ڕەنگە مەبەستی ئەوە بووبێت، ناوەکە بۆ زمانی عەرەبی بگەڕێنێتەوە. المصدر نفسه، مج ٢، ص ١٣٨.

(٦) - ابن شداد، المصدر السابق، ق١، ج٣، ص ٢١٣ ؛ الانصاري ، المصدر السابق ، ص ١٩١ .

(٧) - الهروي، المصدر السابق، ص ٦٨. بۆ زانیـاری زیاتربڕوانـە: سـلام حسـن طـه، جزیـرة ابـن عمـر (بۆتـان)، (هەولێر: ٢٠٠٦)، ص ص ٢٥-٣١.

(٨) - هارتمان، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة (جزیرة ابن عمر)، مج ١١، ص ٤٤٦.

(٩) - ابن شداد، المصدر السابق، ق١، ج٣، ص ٢١٣

دەورە دراوە، بۆیە بە جەزیرە ناوبراوە.[1] شوێنەکەی لە باکووری شاری موسل(موصـل) دایە[2].

## ٤- حِيزَانُ/حيزان -هيزان[3] :

شارێکە لە دیاربەکری هەرێمی جەزیرە و لە نزیك شاری (سعرد/سعرت)[4] دایە[5]. لە کۆنەوە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە، بە تایبەتی هۆزی حاربوختی کوردی[6].

## ٥- حِصْن كَيفا/ حیصن کەیفا:

یاقوت ناوی ئەم شارەی بۆ وشەیەکی ئەرمـەنی گەڕاندۆتـەوە، کـە (کـەیبا) یـە[7]. ئەرمەنییەکانیش بەم قولَّغەیان وتووە (کیڤی)[8] پێشی وایە دەکەوێتە نێوان جزیرەی ئیبن

---

(١) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٨.

(٢) - المصدر نفسه و الصفحه؛ المشترك وضعا، ص١٠٢؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٠٧.

(٣) — لەهەندێ سەرچاوە ناوەکەی بۆ(حيزان بن انوش بن شيت بن ادم عليـه السلام)دەگەڕێننەوە.سـباهی زادە، المصدر السابق، ص٣٠٣. وەلە رۆژگاری ئەمڕۆدا بە (هیزان) ناسراوە، کە وشەیەکی کوردیـیە وبـە مانـای هۆز دێت. عبدالرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ( بغداد:١٩٧٢)، ج١، ص ٢٢.

(٤) - سعرد: شارێکی گەورەیە لە دیاربـەکر نزیـك ئـەرزەن. الشابشـتي، الـديارات، تحقيـق: كـوركيس عـواد، (بيروت: ١٩٨٦)، ص ١٩٨.

(٥) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٣١.

(٦) - الفارقي، تاريخ الفارقي، حققه وقدم له: عبد اللطيف عوض، راجعه:محمد شفيق غربـال، (القـاهرة:١٩٥٩) ، ص ٤٩ ، ص ٥٩ .

(٧) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٦٥. (حمداللة مستوفى قزويني) بنياتنـانی ئـەم شـارە بـۆ پاشـای فارسـی ئەردەشیر بابکان دەگەڕێنێتەوە. نزهة القلوب، ص١٠٣.

(٨) - بڕوانە: سیپان حسن علي، حصن كيفا، (اربيل: ٢٠٠٥)، ص ص ٢٥-٢٧.

عومەر و شاری ئامێد[1]. ناوبراو وەسفی پردەکەی ئەم شارە دەکات، کە لەلایەک کەوتۆتە سەر ڕووباری دیجلە، ئەم پردە هاوشێوەی نییە لە هیچ شوێنێک[2].

## ٦- دارا:

ناوەکەی بۆ پاشای فارسی (دارا بن دارا بن قوباذ)[3] دەگەڕێتەوە[4]. کەوتۆتە بناری چیاکانەوە[5]، مەبەست لەچیای ماردینە[6] لە نێوان شاری نەسیبین و ماردین[7] بە دووری (پێنج فەرسەخ/ ٣٠ کم) لە شاری نەسیبین[8]. نیشتەجێبووانی کورد لە دەوروبەری ئەم شارە بەدی کراون[9].

(١) - معجم البلدان، ج ٢، ص ٢٦٥. کەچی لە هەندێ سەرچاوە لە نێوان مەیافارقین و جەزیرەی ئیبن عومەر دانراوە. القلقشندي، المصدر السابق، ج ٤، ص ٣٢٠؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٢٩٥.

(٢) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٦٥.

(٣) - دارا کوڕی دارا وەلەلای فارسەکان بەدارای سێیەم ناسراوە لەنێوان (٣٣٦-٣٣٠پ.ز) حوکمی کردووە، دواتر ئەسکەندەری مەکدۆنی کووشتویەتی.المسعودی، مروج الذهب، ج١، ص١٥٦.

(٤) - معجم البلدان، مج ٢، ص.٤١٨ ؛ المشترك وضعا، ص ١٦٧.

(٥) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٤١٨. بەهەمان شێوە (الاصطخري) باسی کردووە. المسالك و الممالك، ص ٥٣.

(٦) -المشترك وضعا، ص١٦٦ ؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٢٨١؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٣٢٣.

(٧) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٤١٨.

(٨)- الحميري، المصدر السابق، ص ٢٣٠

(٩) - ابن جبير، رحلة ابن جبير، المعروف ب(تذكيرة باخبار عن اتفاقات الاسفار) ،( بيروت : ١٩٥٩)، ص ٢١٥.

## ٧- الرُها / روها - ئورفە:

یاقوت ناوی ئەم شارە بۆ( رها بن الروم بن لنطی بن سام بـن نـوح)دەگەڕێنێتـەوە[(١)]. لەلایەن رۆمەکانیش بە (اذاسا) ناوبردراوە[(٢)]. دەکەوێتە نێوان موسل و شـام بـە دووری (شەش فەرسەخ ٣٦ کم)، لە هەریەکێکیان[(٣)].

## ٨- زوزان / زۆزان[(٤)]:

یاقوت سەرەتا بە کورەیەکی بەناوبانگ لـە نێـوان چـیاکانی ئـەرمینیا و خـیلات و ئازەربایجان و دیاربەکر و موسـلی دادەنێـت[(٥)]، بـەڵام دواتـر زانیـاری لـە (ابـن الاثـیر) وەردەگرێت، کەوا ناحیەیەکی فراوان بووە لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە لە نزیـک جـەزیرەی ئـیبن عومەر، سەرەتای سنوورەکە یشی بە دووری دوو ڕۆژ لەشاری موسل دەست پێدەکات و تا شاری خیلات و لەئازەربایجان کۆتایی دێت[(٦)]. خەڵکەکەی ئەرمەنی بووە و کـوردیش بەخاوەن قەڵا و مەملەکەت لەم ناوچەیە ناسراوە[(٧)].

---

(١) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٠٦

(٢) - المصدر نفسه، مـج ١، ص ١٢٧ ؛مـج ٣، ص ١٠٦؛ ابـن عبـدالحق البغـدادي، المصـدر السـابق، ج١، ص٤٦ .

(٣)- معجم البلدان، مج ٣، ص ١٠٦

(٤) - زۆزان وشەیەکی کوردیە وبەناوچەیەکی ئاووهەوای سەخت وسارد دەڵـێن، واتـا کوێسـتان.حکیم احمـدمام بکر، المرجع السابق، ص١٦٢، هامش رقم (٢).

(٥) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٥٨.

(٦) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٥٨

(٧) - المصدر نفسه و الصفحه

## ٩- سِنْجار / سینجار-شەنگار:

سەبارەت بەناوەكەی یاقوت له دوو رادا چڕی دەكاتەوە. یەكێكیان بۆ نەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم (سلاوی خوای لێبێ)، كه یەكەمین دروستكاری شارەكه بووە[١]. بەلام لـه راكـەی تردا بۆ كەشتییەكەی نوح (سلاوی خوای لێبێ)، كه بەتەك چیای سینجار رۆیشتووە[٢].

شوێنەكەشی دەكەوێتە بناری چیا و له ڕۆژهەلاتی هەرێمی جەزیرە و ڕۆژئاوای شاری موسل ولەباشـووری نەسـێبین دایـه [٣]، كـه دووری نێوانیـان سـێ ڕۆژەرێ یـه.[٤] هـەر لەكۆنیشەوە بەشاری نیشتەجێبوانی كورد دانراوە[٥].

## ١٠- ماردین :

یاقوت ناوی ئەم شارەشی بۆسەر زمانی عەرەبی گەراندۆتەوە، گوایه وشەكه كۆیەو بۆ چاوگی یان كاری (مارد) دەگەرێتەوە، كه بەمانای سەركەش٠دێوەزمە) دێـت، رەنگـه لەبەر ئەوە بێت هەلكەوتنی شارەكه لەسەرچیایەكی بەرزدایە[٦].

بەلام هەندێ سەرچاوەش دەگەرێننەوە بـۆ نـاوی (ملـودین)، كـه نـاوی یـەكێك لـه كورەكانی پاشایێكی فارسه كه لەم ناوچەیه نیشتەجێ بووە[٧].

---

(١) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٢٦٢

(٢) - المصدر نفسه والصفحه ؛ القزويني، اثار البلاد، ص ٤٩٣.

(٣) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٦٢؛ سباهى زادة، المصدر السابق، ص٣٩٨.

(٤) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٦٢.

(٥) - ابن بطوطه، المصدر السابق، ص١٣٨.

(٦) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٩. هەروەها بروانه : ابـن جـبير، المصـدر السـابق، ص٢١٥؛القزوينـى، اثـار البلاد، ص ٢٥٩ ؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٢٧٩.

(٧) - پاشای فارسی دوای نەوەی كورەكەی نەخۆش دەكەوێت، پزیشكەكان چیایەكی بەرزی بۆ دەسـت نیشـان دەكەن، تاكو چاك بێتەوە كه شوێنی شاری ماردین بـووە. الـمارديني، تـاريخ مـاردين في كتـاب (ام العـبر) تحقيق: حمدي عبدالمجيد السلفي، تحسين ابراهيم الدوسكي، (دهوك: ٢٠٠٢)، ص ١١.

ناوچە پتەو و قایمەکەی لە هەرێمی جەزیرە دەڕوانێتە سەر شاری نەسێبین و داراو دونەیسەر[١]. بەڵام یەکێك لەو خاسییەتانەی ئەم شارە کە یاقوت ئاماژەی پێ دەکات، خانووەکانی چین لەسەر چین گونجاوە بە جۆرێك هەر چینێك وەستاوە لەسەر ئەوەی ژێرەوەی خۆی[٢].

## ١١- دُنَیْسر / دونەیسەر_قزل تەپە(خوسری):

شارێکی گەورەیە لە هەرێمی جەزیرە لە نزیك شاری ماردین، نێوانیان (دوو فەرسەخە/ ١٢ کم) یاقوت دووجار سەردانی ئەم شارەی کردووە، سەرەتا لە گوند چووە، دواتر گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا هاتووە دوای تێپەڕبوونی سی ساڵ ژمارەی دانیشتوانی زیادی کردووە و بازاڕی فراوانی لێ دروستبووە[٣].

## ١٢- نَصِبِین/ نەسێبین:

شارێکی هەرێمی جەزیرەیە لەسەر ڕێگای نێوان موسل و شام، دووری لەگەڵ شاری موسل شەش ڕۆژە ڕێیە[٤]. دەکەوێتە باکووری شاری سینجار[٥]و، نێوانیشیان (نۆفەرسەخە/٥٤ کم)[٦].

بەیەکێك لەشارە کوردنشینەکان دادەنرێت[١]، بەتایبەتی لەیەکیك لەو ناوچانەی، کەسەر بەم شارەبووە[٢].

---

(١) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٩

(٢) - المصدر نفسه و الصفحه

(٣) - معجم البلدان ، مج ٢، ص ٤٧٨.هەروەها (ابن جبیر) بەهەمان شێوە وەسفی دەکات، جگە لەوەی کاروانە ڕێی بازرگانان بووە. رحلة ابن جبیر، ص٢١٦؛سوادی عبد محمد، الاحوال الاجتماعیة والاقتصادیة فی بلاد الجزیرة الفراتیة خلال القرنین السادس الهجری الثانی العشر المیلادی، (بغداد:١٩٨٩)، ص ص٦٢-٦٣.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٨٨.

(٥) - ابو الفداء، المصدر السابق، ص٢٨٣؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٦٢٥.

(٦) - معجم البلدان، مج٥، ص٢٨٨؛ القزوینی، اثار البلاد، ص ٤٦٧.

## ١٣- مَوْصِل/ (مەوسیل)موسل:

یاقوت ناوی ئەم شارە بۆ هۆکاری شوێن هەڵکەوتنەکەی گەڕاندۆتەوە، کەچۆن شوێنی بەیەك گەیاندنی ناوچەکانی هەرێمی جەزیرە و عێراقە، یاخود لەنێوان ڕووباری دیجلە و فورات، [٣] لەگەڵ ئەمەشدا بەنێوەندێکی نێوان سینجار و حەدیسە یە[٤]. هەروەها بەناوچەیەکی نێوان جەزیرە و شامیش دادەنرێت[٥]. هەر سەبارەت بە ناوەکەی ئاماژە بەناوی پاشایەك دەکات کە ناوی (موسل) بووە[٦]. کەڕەنگە بۆ ئەو بگەرێتەوە. بەڵام ڕای یەکەمی کەزیاتر بەپەسەند زانیوە، ئەمیش بۆ واتای وشەکە لەزمانی عەرەبی بەدیار دەکەوێت. جگە لەو ناوە جیاوازانەی بۆ شاری موسلی داناوە[٧].

لە دیدی یاقوتدا کەوتۆتە سەر لایەکی ڕووباری دیجلە[٨]، بەشێوەیەك لەبەرە ڕۆژئاواکەی هەڵکەوتووە[٩]، ڕووە ڕۆژهەڵاتەکەی بە نەینەوا ناسراوبووە[١٠]. لەبەر ئەوەی

---

(١) - ابن جبير، المصدر السابق، ص٢١٥.

(٢) -بەتایبەتی (طور عابدين-ميديات) کەکوردەکان هەندێ لە هۆزی عەرەبی شەیبانی لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوینە.الهمداني، المصدر السابق، ص٢٤٧.

(٣) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

(٥) - ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ١٧٦.

(٦) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣. بەڵام (المقدسي ) ئاماژە بەوە دەکات کەناوەکەی خۆڵان بووە، ، بەڵام کاتێ عەرەب لێی نیشتەجێ بوون گۆڕیویانە بۆ موسل . احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص١٢٦.لەوانەشە وشەی خۆلان کوردی بێت، لەبەر ئەوەی لەوشەی خولانەوە نزیکە ومانای موسلیش لەوەسفە جوگرافیەکەی گوزارشت لە بەیەکگەیاندن و خولانەوەی ناوچەکان دەکات.

(٧) - وەکو ناوی (أثور) لەسەردەمی فارسەکان بە نوارد شێرو ناوی هاتوە، (حدبا) ی بۆ ناوی شاری موسل گەڕاندۆتەوە.معجم البلدان، مج١، ص ٩٢، مج ٥، ص ٢٢٣، مج٢، ص ٢٢٧؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص١٣٠.

(٨) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

(٩) - القزويني، اثار البلاد، ص٤٦١؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٦١١.

(١٠) -. معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

پێش ئیسلام ئەم شارە لە دوو قولّغ پێکهاتبوو ڕۆژهەلاّتەکەی نەینەواو ڕۆژئاواکەی موسل بووە[1].

هەروەها ناوبراو ئەم شارە بەیەکێك لـە پایتەختـەکانی دەولّـەتی ئیسـلامی وەسـف دەکات[2]. لەبەر ئەوەی شوێن و پێگەی گرنگی موسولّمانانی جەزیرە بووە و بـە جۆرێـك مولّك و مالّی دەولّەتی تێدا کۆ دەکرایەوە[3].

یاقوت لەباسی زۆر ناوچەکانی سەر بەم شارە، واتا دەوروبەرەکانی کـوردی لێبـەدیار دەخات [4]، جگە لەوەی هەرلەسەدەی چوارەمی کۆچی دەیـەمی زاینیـدا ئـەم ناوچـەیە بەشوێنی راستەوخۆی کوردی دانراوە[5].

## ١٤- إرْبِل/ ئیربل-هەولێر:

یاقوت ناوی ئەم شارە بۆ ئەم شی کردنەوە، کە زمانەوانانی عەرەب بۆیان کـردووە، دەگەڕێنێتەوە[6].

پاشان بە یەکێك لە ناوچەکانی موسلی ژماردووە[7].

---

[1] -الانصاري، المصدر السابق، ص ٤٠؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ٢٨٥.

[2] - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٢٣.

[3] - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ١٩٤.

[4] - معجم البلدان، مج١، ص١٣٨؛مـج٢، ص٤٣٢.هەروەها مـارکۆ لەگەشـتـەکەی ئامـاژەی بـەوەکردووە، کەچۆن خەلّکی ئەوشارە کوردیان پێ وتراوە. travels of Marco polo, p 37

[5] -المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ٣٣٨ ؛ابـن حوقـل، المصـدر السـابق، ص١٩٥.بـۆ زیـاتر زانیـاری بروانـە: لسترنج، المرجع السابق، ص ص١١٥-١١٨.

[6] -. بروانە ئەم لێکۆلّینەوەیە، ل٢٥.

[7] - معجم البلدان، مج ١، ص ١٣٨؛ الانصاري، المصدر السابق، ص ١٩٠. بەلاّم (ابن خرداذبة) بـە یـەکێك لە ناحیەکانی (طسوج) ی (سواد/ رەشەخاك) ی داناوە. المسالك والممالك، ص١٨.بەبنکەیەك (قاعیـدە)ی گرینگی شەهرەزووریش ژمێردراوە. . ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤١٣؛سـباهي زادة، المصـدر السـابق، ١٣٦.

ناوبراو باس لەخەڵکی شارەکە دەکات، کە کورد بوونە دواتر بەعەرەبی کراوە(استعربوا) [1]. بەلاّم بەشێوەی گشتی بەعەرەب نەکراوە، بەلکو ناوبراو لەگەل چینێك قسەی بەعەرەبی کردووەو ئەوانیش بەهەمان زمان وەلامیان داوەتەوە بۆیە وایزانیوە هەموو خەلکەکە بەعەرەبی قسەیان کردووە.، ڕەنگە ئەم توێژەش چینی ڕۆشەنبیرو زاناکان بووبن، چونکە یاقوت لەگەشتەکانی بۆ هەرناوچەیەك وویستوویەتی چاوی بە زاناکان بکەوێت، وزانیاریان لێوەربگرێت، جگە لەمەش خوێندن بەگشتی لەوکاتە بۆ خوێندەواران بەعەرەبی بووە زیاتریش خوێندنێکی ئاینی بوو.

بەلاّم بۆ باسکردنی سروشتی قەومی ئەم شارە کە کوردە هۆنراوەیەکی بەنموونە دەهێنێتەوە کەبەشێوەیەکی خراپ وەسفیان کراوە، ئەگەرچی ئاماژە بەوەدەکات کە شعێرێکی گالتەوگەپی(نوشیروان البغدادی)ناسراو بە (شیطان العراق الضریر)[2] و وەهۆنراوەیەکەیشی بەلگەیەك نیە بۆ دیارکردنی ئاکارخەلکی ئەم شارە چونکە هەر ئەم شاعیرە پەشیمان دەبێتەوەو لەهۆنراوەیەکی تردا بەسەر یان داهەلدەلێت.[3]

## ١٥- بَلَد- بلط[4] / بەلەد:

ئەم شارە لەسەردەمی فارسەکان (شهرأباد)ی پێی وتراوە[5]. دەکەوێتە باکووری شاری موسل و لە ڕۆژئاوای دیجلەدایە: یاقوت بەیەکێك لە ناوچەکانی سەر بەشاری موسلی داناوە، کە دوورییەکەی لەگەڵ ئەم شارە (حەوت فەرسەخ/ ٤٢کم) بووە، لەگەڵ شاری نەسێبین (بیست و سێ فەرسەخ/١٣٨ کم) بووە[6]. ئەگەر چی یاقوت ئاماژە بەوە ناکات

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨؛ الانصاری، المصدر السابق، ص١٩٠.

(٢) - سەرچاوەی بەردەست باس لەژیانی ناکەن

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص١٣٩.

(٤) - معجم البلدان، مج١ ص ٤٨٤.

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٤٨١. لەسەردەمی ئاشوورییەکان بە (بلدای یان بلطای) هاتووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالله امین اغا، بلد (اسکي موصل)، (موصل: ١٩٧٤)، ص ١٣.

(٦) - معجم البلدان، مج ١، ص ٤٨٨.

كەئەم شارەو ناوچەی تر كوردی تێدا ژیاوە، بەلاّم هەرێمی جەزیرە بەهەرێمێكی كوردی دادەنرێت، بۆیە رەنگە كورد لەو ناوچانەی كە ناوبراو كوردی لێبەدیار نەخستووە هەبووبێت،

### ١٦- حَران/ حەران:

یاقوت ناوی ئەم شارەش بۆ زمانی عەرەبی دەگەڕێنێتەوە، بەلاّم ئاماژە بە رایەك دەكات كە یەكەمین كەس (هاران) بووە دروستی كردووە، كە رەنگە بۆ ئەم ناوە بگەڕێتەوە[1]. شارێكی بەناوبانگی جەزیرەیەو سەرە ڕێگای موسل و شام و ڕۆم بووە[2].

### ١٧- سَرُوج/سەروج:

شارێكە لە نزیك حەران لە هەرێمی جەزیرە[3].

### ١٨- الرَقَة- (رەقە):

ناوی ئەم شارە بە رۆمی كالینكوس بووە[4]، دەكەوێتە هەرێمی جەزیرە لە سەر فورات، نێوانی لەگەڵ حەران سێ رۆژە ڕێیە[5]. یاقوت ئاماژە بە لەناوچوونی ئەم شارە دەكات و ناوەكەی خستۆتە سەر ڕافقە، هەردوو ناوچە بەگشتی پێی وتراوە ڕەقە[6].

---

(١) - معجم البلدان ، مج ٢، ص٢٣٥
(٢) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٢٣٥.
(٣) - المصدر نفسه ، مج ٣، ص ٢١٦
(٤) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٤٣٢
(٥) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٥٩.
(٦) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ١٥.

### ١٩- رَأسُ عَيْن/ ره‌ئسوعه‌ین(سه‌راكانی):

شارێكی گه‌وره‌یه و به‌ناوبانگه لـه مێـژووی كـۆن، لـه نێـوان حـه‌ران و نه‌سـێبین و دونه‌یسه‌ره، كه دووری له نه‌سێبین (بیست و پێنج فه‌رسه‌خ/١٥٠ كم) بووه، سه‌روچاوه‌ی ئاوی زۆر لێبووه[١]. هه‌ندێ جار پێی گوتراوه (عين الورده) [٢].

### ٢٠- تَل موزن/ گردۆله‌ی موزون:

شارێكی كۆنه له نێوان ره‌ئسوعه‌ین و سروج دایه، نێوانی له‌گه‌ڵ یه‌كه‌میان ده میلـه (نزیكه‌ی سێ فه‌رسه‌خ/ ١٨ كم) و به به‌ردی ره‌ش بونیات نراوه[٣].

دووه‌م// هه‌ندی له‌و شاره كوردنشـینانه‌ی هاوسـنوری هـه‌رێمی جـه‌زیره‌و چـیاكانن، یاقوتیش ده‌یانژمێرێت به‌شـاره‌كانی( هـه‌رێمی عێـراق)[٤]، كه‌ڕاسـته‌وخۆ ده‌كه‌ونـه لای باكووری ڕۆژهه‌لاتی:

### ٢١- دَقُوقاء/ داقوقا[٥]:

شارێكه له نێوان ئه‌ربل و به‌غدا[١]، یاقوت باس له‌وه ده‌كات كه ئه‌م ناوچه‌یه هه‌واڵ و فتوحات و رووداوی خه‌وارجه‌كانی تێدا زۆر بـووه[٢]. ئـه‌م باسـه‌ش لـه‌وه‌وه سه‌رچـاوه‌ی

---

(١) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ١٤.

(٢) - المصدر نفسه، مج ٤، ص ١٨٠

(٣) - معجم البلدان ، مج ٢، ص ٤٥.

(٤) -یاقوت به‌ناوچه‌كانی ره‌شه‌خاكی ناو بردووه، معجم البلـدان، مـج ٣، ص ص ٢٧٢-٢٧٥. سـنووری لای باكووری شاری حه‌دیسه‌یه له‌سـه‌ر ڕوویـاری فـورات وتكریـت له‌سـه‌ر ڕوویـاری دیجلـه، لای بـــاشووریش عه‌بادان وده‌ریای فارسیه(خليج العربی)، له‌رۆژئاواكه‌شی قادسـیه‌و كوفـه، وه‌شـه‌هره‌زووروحولوان وسـیروان سه‌یمه‌ره له‌لاڕۆژهه‌لاتیه‌وه‌یه.الاصطخری، المسالك والممالك، ص٥٦.

(٥) —داقوق توێژه‌رێك پێـی وایـه وشـه‌یه‌كی كوردیـه‌و لـه‌دوو بڕگـه پێـك دێـت(ده واتـا دێ )و(كـوك واتـا گه‌وره).محمد جميل ملاحمد رۆژبیانی، داقوق في التاريخ، (السليمانية:٢٠٠٤)، ص٧. هاوكات دووریه‌كـه‌ی له‌دوزخورماتو(٣٩كم)له‌گه‌ڵ كه‌ركوك (٣٧كم)ده‌بێت. فائزه محمد عزت، المرجـع السـابق، ص٦٠، هـامش، رقم(٤).

گرتووە، کە ژمارەیەك لە خەوارجەکان لەسنوری نێوان جەزیرەو چیاکان وعێراق دا چالاکیەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد[٣]، ئەم شارەش لەنێوان هەرسێ ناوچەدا هەلکەوتووە، جگە لەمەش لەبەر ئەوەی دوور بووە لەناوچەی دەسەلاتی ئەمەویەکان.

٢٢- بَنْدَنِيجَين/ بەندەنیجەین- مەندەلی:

سەبارەت بە م شارە یاقوت لە زانیاری (حەمزە ئەسفەهانی)یەوە وەرگرتووە کە ئەم شارە ناوچەیەکە لە هەرێمی عێراق و لەپال چیا وکاروبارەکانی سەر بە شاری بەغدا بووە[٤].

بەلاّم (المقدسی) لە ریز شارەکانی حولوانی داناوە[٥]. هەروەها یاقوت لەزاری(العماد بن کامل البندنیجی)یەوە گێراویەتیەوە، کە بەندەنیجین چەند گەرەکێکی ئاوەدانی لەیەك دوور، کەهیچ کامیان لەتەك یەکەوە نەبوون، دەگرێتەوە.

بەلاّم سەبارەت بەناوەکەی ناوبراو لەسەرەتادا ئاماژەی بەناوی(وندینکان) کردووە، پاشان هەر ئەم ناوە بۆ عەرەبی( بەندەنیجین) گۆردراوە[١]

---

(١) -معجم البلدان، مج٢، ص٤٥٩؛ حمد اللة مستوفی قزوینی، نزهة القلوب، ص٤١.بەلام لەهەندێ سەرچاوە لەریزشارەکانی هەرێمی جەزیرە دانراوە. ابو الفداء، المصدر السابق، ص٢٨٧؛سپاهی زادة، المصدر السابق، ص٣٢٨.

(٢) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٤٥٩.

(٣)- یەکێك لەو بزووتنەوانە (شیبان بن عبد العزیز الحروری الخارجی) لەسەردەمی دواخەلیفە ئەمەویەکان(مەروانی کوری محمد) لەسنوری ئەم ناوچانە بەرێوە دەبرد. خلیفة بن خیاط، تاریخ خلیفه ابن خیاط، راجعه و ضبطه و صححه و حواشه و فهرسته، مصطفی نجیب.، حکمت کشلي، (بیروت، ١٩٩٥)، ص ص٢٤٥-٢٤٦؛ ابن الاثیر، الکامل، ج٤، ص ص٣٥٦-٣٥٨. بۆ زیاتر زانیاری بروانە: احمد میرزامیرزا، المرجع السابق، ص ص١١٤-١٢١.

(٤) - معجم البلدان، مج ١، ص ٤٩٩.هاوکات سنورەکەی لەباکووری رۆژهەلاتی شاری بەغدایە، بەدووری( ٥١)کم وە بەشی رۆژئاواشی چیای پشتکوە، لەسەر سنوری نێوان عێراق و ئێرانە. محمد جمیل بندی رۆژبیانی، مدن کوردیة قدیمة، (السلیمانیة:١٩٩٩)، ص٨٩.

(٥) - احسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم، ص ١٠٧.

## ٢٣- خانِقِن/ خانيقين:

شارێکە لە ناحیەکانی رەشەخاك لە کورەی (شاه فیروز)(٢) لە رێگـای هەمـەدان بـۆ بەغدا،(٣) بەلاّم سەرچاوەکانی پێش یاقوت بەگەورە گوندێکی سەر بە حولوان(٤)، یاخود گوندێکی هەرێمی عێراقیان داناوە(٥)، لەگەل ئەمەشدا بەیەکێك لە ناوچەکانی سـەر بـە هەرێمی چیاکانی نزیك شەهرەزووریش ژمێردراوە(٦).

## ٢٤- جَلُولاء/ جەلولا:

یاقوت ناوەکەی بۆ رووداوی (جەلولا)(٧) دەگەرێنێتەوەوە، واتا دیسانەوە خۆی دەخاتە ناو هەلەی زانستی، بەشێوەیەك پێی وایە ئەم ناوچەیە وەکو گۆرەپانی لاشەی دوژمنانی ئیسـلام بـووە، واتالـە وشـەی(جللها)هاتووە(٨). ئـــەم شــــارە بەناحیەی(گســوج-

(١) - معجم البلدان، مج ١، ص ٤٩٩.توێژەران لەپاڵ راو و راڤە کردنی ناوی ئەم شارە رایی خۆیان دەردەبـرن، بەجۆرێك نـاوی بەنـدەنیجین لە(بەنـدەنیگان)گۆراوە بـۆ عـەرەبی بۆتە(بنـدنیجین)، کـە چـەند بەنـداوێکی لێوەدروست کراوە بەمانای(بەربەستی گلدانەوەی ئاو) دێت. محمد جميل بندی رۆژبیانی، مدن كرديه قديـه، ص ص٨٤-٨٥.

(٢) - شاه فیروز: کورەیەکە لە ناحیەی سـەواد، کـە هەندێلەشـارە دێیـەکانی چـیای بەسـەرەوەن، وبەشـوێنی کوردەکان دانراوە. ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٨، ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٣٨٧.

(٣) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٤٠؛المشترك وضعا، ص ١٥١؛سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٠٧.

(٤) - ابن خرداذبة، المصدر السابق، ص١٨.

(٥) - المهلبي، المصدر الصابق، ص ١١٤.

(٦) - الحميري، المصدر السابق، ص ٢١٠.

(٧) - رووداوی جـەلولا:کاتێ پرۆسـەی فتوحـات دەگاتـە ئـەم ناوچـەیە، لەسـالّی(١٦ك/٦٣٧ز) روویـەرووی فارسەکان دەبنەوە، بۆ موسولّمانان سەرکەوتنێکی گەورە بووە. البلاذری .المصـدر السـابق، ص ص٢٦٧-٢٦٥.

(٨) - معجم البلدان، مج٢، ص١٥٦.

دێهستان)[1] ڕەشـــەخـــاك ژمـــــاردووە، ( ڕێــــگای خوراسـان) [2]ی پێدا تێپـەر دەبێت[3]، ماوەی نێوانی لەگەڵ شاری خانیقین (حەوت فەرسەخ-٤٢/کم )ی داناوە[4].

## سێیەم// شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان:

### ٢٥- شَهْرَزُور/ شەهرەزوور(شارەزوور):

یاقوت ناوی ئەم کورەیەی بۆ وشـەیەکی فارسـی گەڕاندۆتـەوە، بڕگەکانیشـی شـی کردۆتەوە کـە (شـەهر) بـەمانای شـار یـان ناوچـە و (زور) نـاوی پاشـا فارسـییەکەی دەسەلاتداری ناوچەی شەهرەزوور بووە[5].

کورەیەکی فراوانیشە لە نێوان ئەربل و هەمەدان[6]، یاخود بەشێوەیەکی تر لە نێـوان

---

(١) -طسوج : یاقوت لە ئاست ناحیەی داناوە.معجم البلدان، مج٣، ص٢٧٣.

(٢) - ڕێگای خوراسان:ئەو ڕێگایە بوو، کەبازرگانان بەکاریان دەهێنا لە کـاتی گەشـتەبازرگانیەکانیان لەخۆراسانەوە بۆ ناوچەجیاجیاکانی تر تاکودەگەیشتەوولاتی صین . وەناسراویشە بـە(طریـق الحریـر العظیم).قحطان عبد الستار الحدیثی، خراسان فی عهد السامانی، ، دراسـة في الاحـوال السیاسـیة والادارية والاقتصاديةمن سنة٢٠٤ه/٨١٩م)الى(٣٨٩ه/٩٨٨م)، اطروحه دکتورا مقدمة الى کلیـة الاداب، جامعة بغداد، (بغداد:١٩٨٠م)، ص٤٨٥

(٣) - معجـم البلـدان، مـج ٢، ص ١٥٦؛المشـترك وضـعا، ص١٠٦؛ ابـو الفـداء، المصـدر السـابق، ص٣٥٧؛سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٧٥.

(٤) -معجم البلدان، مج٢، ص١٥٦؛ ابوالفدا، المصدر السابق، ص ٣٠٧. کەچی هەندێ سەرچاوە (نۆفەرسـەخ/ ٥٤ کم)یان داناوە. قدامة بن جعفر، المصدر السابق، ص ٩٢.

(٥) - معجم البلدان، مج ٣، ص٣٧٥؛ الانصاری، المصدر السابق، ص١٨٤. بۆزیاتر زانیاری دەربـارەی نـاوی ئەم شارە بروانە: النقشبندی، الدینور وشهرزور، ص ص٥١-٥٥. وە لەبـەر ئـەوەی کـورە بـووە کەشـاری زۆروناوچەی فراوان لەخۆوە دەگرێت، بۆیە لەوانەیە ناوەکەی ووشەیەکی کوردی بێـت بـەمانای شـاری زۆر بێت.

(٦) - معجم البلدان، مج ٣، ص٣٧٥؛ القزوینی، اثار البلاد، ص ٣٩٧. هاوکات باشووری ڕۆژهـەلاتی ناوچـە شاخاویەکانی شاری سلێمانیە، لەنزیك سنووری عێراق و ئێران دەگرێتەوە. النقشبندی، الـدینور وشـهرزور، ص٥٠.

موسل و هەمەدان[١]، كـــە هەمان مەبەستی شوێنی یەكەمــە، بـەڵام لەسەرچـاوەكان دەبینین، لەهەنـدێ كاتـدا بەناوچـەیەكی بچـوك وەسـف كـراوە[٢]، كەڕەنگـە ئەمــەش بۆكاریگەری بارودۆخی ڕامیاری و كارگێڕی بگەڕێتەوە.

خەڵكەكەی ئەم شارە لەسەردەمی یاقوت هەمووی كورد بـوون[٣]. هـەروەها لەسـەر زانیاری (مسعر بن مهلهل[٤]) ئەم ناوچەیە چەندشارۆچكە و گوندی لە خۆ گرتووە[٥].

## ٢٦- الصَیْمَرة و سِیرَوَان/ سەیمەرە و سیروان:

سەبارەت بە باسكردنی ئەم دوو شارە، یاقوت زانیاریی (الاصطخری) دەخاتـەڕوو[٦]، كەوا دووشاری بچوكن[٧]، شاری سـەیمرە دەخاتـە نێـوان هـەرێمی چـیاكان و هـەرێمی خوزستان[٨]. بە شارێكی كورەی (مهرە جان قذف)[٩] ی داناوە[١٠].

---

(١) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٤١٣.

(٢) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣١٤؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤١٣؛سباهی زادة، المصدر السابق، ص ٤٢٧.

(٣) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٧٥. بەر لەچاخی یاقوت ئەم شارە بـەكوردی دانـراوە. مسـعر بـن مهلـهل، المصدر السابق، ص١٠؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣١٤.

(٤) - الرساله الثانیة، ص ص ١٨- ١٩.

(٥) - وەك دیلمستان(دیلمان) وپیرو دزدان .معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٧٥.

(٦) - المسالك و الممالك، ص ١١٨.

(٧) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٤٣٩

(٨) -. المصدر نفسه، مج ٣، ص ٤٣٩.

(٩) - مهرجان قنق(مهر گان گچكه) ناوەكەی بەعەرەبی كـراوە: كورەیـەكی فراوانـە نزیـك لـە سـەیمرە لـە هەرێمی چیاكان لەلای ڕاستی ڕێگای حولوان بۆ هەمەدان، چەندان شار و گونـد لـەخووە دەگرێـت. معجـم البدان، مج ٥، ص ٢٣٣. هـەروەها بڕوانـە: ابـن خرداذبـە، المصـدر السـابق، ص٤٧؛ الیعقـوبی، المصـدر السابق، ص٧٢.

(١٠) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٤٣٩. كورد یەكێك بووە لەپێكهاتـەی دانیشـتوانی ئـەم شـارە لـە كۆتـای سەدەی سێیەمی كۆچی نۆیەمی زاینیی. الیعقوبی، المصدر السابق، ص ٧٢. تەنانەت توێـژەرێك ناوەكـەی بۆ وشەیەكی زمانی كوردی وفارسی (سەد- مەرە) دەگەڕێنێتەوە . النقشبندی، الدینور وشـهرزور، ص٣٠، هامش رقم (٢).

واتا بەگشتی کەوتۆتە سنوری هەرێمی چیاکانەوە[1]. هەروەها شاری سیروانیشی بە کورەیەکی یان گوندێکی کورەی ماسەبەزان لە هەرێمی چیاکان ژماردووە[2].

## ٢٧- ماسَبَذَان/ ماسەبەزان[3]:

سەبارەت بە ناوەکەی یاقوت بۆدوو برگە (ماه- سبۆان) شیدەکاتەوە، برگەی یەکەم بەمانای مانگ (القمر) دێت، [4]بەڵام برگەی دووەم ناوی مەملەکەتێکە، کەفارسەکان دەستیان بەسەر داگرتووە، چونکە وشەی (ماه) دەخرایە سەر ناوی مەملەکەتەکانی فارسی.[5]

ناوبراو بە کورەیەکی هەرێمی چیاکان وەسفی دەکات[6]، کەچی هەندێجار بەشارێکی شوێن پتەو باسکراوەولەگەڵ ئەمەش بەیەك ناوچە لەگەڵ شاری سیروان دانراوە[7]. بەڵام دوو شوێنی جیاوازن، وەئەم باسەش ڕەنگە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت، چونکە لەتەك یەك بوونە[8].

---

(١) -المشترك وضعا، ص٢٨٩؛الانصاري، المصدر السابق، ص١٨٤.

(٢) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٩٦؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٤٠٩.

(٣) - ماسبەزان: کورەیەکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، هاوسنورە لەگەڵ خاکی عێراق لەلای ڕۆژئاواکەی لەبەرەی باشووریشەوە هەرێمی خوزستانە. احمد ميرزاميرزا، المرجع السابق، ص ٤٠.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١. لەبیرورای لێکۆلەرەوان (ماه) وشەیەکی کوردیە یان بەمانای شار دێت یاخود ڕێگای سەخت ودژوار بەڵام لەشیکردنەوەی وشەی ماهی کوفەو بەسرە نزیکترە لەوەی بەمانای شار بێت. النقشبندي، الدينور وشهرزور، ص١٥؛ محمد جميل بندي رۆژبياني، مدن كوردية قديمة، ص٢٠٩، هامش، رقم (٢٧).

(٥) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤٩.

(٦) - المصدر نفسه والصفحة.

(٧) - اليعقوبي، المصدر السابق، ص٧١؛الانصاري، المصدر السابق، ص١٨٤؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤١٥.

(٨) -المشترك وضعا، ص٢٩٤؛ القزويني، اثار البلاد، ص٢٦٠.

**هەروەها یاقوت باس لەپێکهاتەی دانیشتوانەکەی ناکات، هەرچەندە لەسەدەی سێیەمی کۆچی نۆیەمی زاینی کورد لەدانیشتوانی وێندەری بوون.[1].**

## ٢٨- حُلْوان/ حولوان:

**یاقوت، حلوانی عێراقی ناو ناوە، چونکە بەلاپاڵی چیا بەسەر عێراقدا دەڕوانێت، بەجۆرێك شوێنەکەی لە سنووری ناوچەکانی ڕەشەخاك لە دواوەی چیاکان دەستنیشان دەکات[2]. لەگەڵ ئەمەشدا بەشارێکی هەرێمی چیاکان ژمێردراوە[3]، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئەم هەرێمە[4]. بەلاّم ناوبراو ئەوەی چەسپاندووە کە کەوتۆتە سنوری عێراق، ئەمەش بەوەستان لەسەر ڕایەکەی (ابو زید البلخی)، کە ئەمە ڕوون دەکاتەوە، کە حولوان دەچێتە سەر ناوچەکانی عێراق و تاکە شاریەتی کەچیای لێبێت[5]**

**دەربارەی بنە چەی ناوەکەی بۆ (حلوان بن عمران بن الحاق بن قضاعة)ی دەگەڕێنێتەوە، کە سەرپەرشتیاری ئەم ناوچەیە بووە[6]. بەلاّم نازانرێت خاوەنی چ پلەیەکی ئیداری بووەو، کەی دەسەلاّتی لەم ناوچەیە هەبووە، بۆیە بەڕایەکی دەمارگیریانە سەیردەکرێت، چونکە لەوانەیە ئەم کەسایەتیە ناوی شارەکەی وەکو نازناو وەرگرتبێت.**

---

(1) -اليعقوبي، المصدر السابق، ص٧٢؛ الاصطخري، المسالك والممالك، ص٢٨٢.

(2) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٩٠ ؛ المشترك وضعا، ص١٤٢؛ ابن الاثير، الباب في تهذيب الانساب، (بيروت: ١٩٨٠)، ج١، ص٣٨٠؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٢٩٧.

(3) -اليعقوبي، المصدر السابق، ص٧٥؛ابن حوقل، المصدرالسابق، ص٣١٧.

(4) - قدامة بن جعفر، المصدر السابق، ص ١٧٣ .واتا لەو بەشەی خاکی کوردستانە، کەدەکەوێتە هەرێمی چیاکان، جگە لەوەی بەشارێکی کۆنی نیشتەجێبوانی کورد دادەنرێت ویاقوتیش هۆزێکی کوردی بۆئەم شارە دەگەڕێنێتەوە. اليعقوبي ،المصدر السابق، ص٧٥، معجم البلدان، مج ٢، ص٢٨٤.

(5) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٢٩١ .تەنانەت بە ناوەندی کورەی( شاذ فيروز قباذ)دانراوە.ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص١٨.

(6) - معجم البلدان، مج٢، ص٢٩١ .لەگەڵ ئەمەشدا (البكري)ش بۆ وشەی عەرەبی دەگەڕێنێتەوە بەلاّم لەڕووی واتای وشەکەوە، کە مەبەست لە پاراستنی ناوچە دەشتاییەکانە.معجم ما استعجم، مج١، ج٢، ص٩٦.

## ٢٩- دِینَوَرُ/ دینەوەر[1]:

**شارێکە لە هەرێمی چیاکان، یاقوت بە (ماه کوفة)[2] ش ناوی دەبات[3]، نزیکە لە قەرمیسین و لەباکووری ڕۆژئاوای هەمەدانە[٤]، نێوانیشیان (بیست فەرسەخ/ ١٢٠ کم) زیاترە، لە گەڵ شەهرەزووریش چوار قۆناغە[٥].**

**بەڵام پێکهاتەی نەتەوەکانی دیار نەکردووە، کە لەهەندێ سەرچاوەی تر بەعەجەم و عەرەب یان دادەنێن [٦]، عەرەبەکانیش لەکاتی پرۆسەی فتوحات لەم شارە نیشتەجێ بوون، مەبەست لەعەجەمیەکانیش کوردیش دەگرێتەوە، چونکە شوێنی هۆزی کۆنی کوردی بووە[٧].**

---

(١)- یاقوت ناوەکۆنەکەی بەدیناوەران دادەنێت، بەجۆرێك خەڵکەکەی لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون. تەنانەت محەمەدمەلاجمیل رۆژبیانی ناوی (دینهور) بۆ سەردەمی ئاشوریەکان دەگەڕێنێتەوەو لەدووبڕگە پێکهاتووە (دین-ور)واتا (دین زادە). .معجم البلدان، مج٥، ص٤٩، مدن كردية قديمة، ص٢٠٤.

(٢) - (ماه كوفة) کورەیەکی فراوانە لە چەند شارۆچکە و قەزا و ناحیەیەك پێك هاتووە، لە سنووری سەرووی شاری دینەوەرە لە بەرەی رۆژئاواشی کورەی حولوانە، کورەی ماسبەزان لەباشووری رۆژهەڵاتی شاری هەمەدان و باکووری هەرێمی ئازەربایجان. قدامة بن جعفر، المصدر السابق، ص ١٧٣؛ النقشبندي، الدينور و شهرزور، ص ١٩.

(٣) - لەبەر ئەوەی ئەو ناوەی بۆدانراوە چونکە ئەو داهاتەی واتا باج وسەرانەی ئەم ناوچەیە بۆ خەڵکی کوفە ڕەوانە دەکرا. سەرچاوەکانی بەر لەیاقوتیش بەمە ناوزەدیان کردووە. ابن رستە، المصدر السابق، ص ١٦٦؛المقدسي، المصدر السابق، ص٢٩٠ ؛ معجم البلدان، ج٢، ص ٥٤٥.

(٤) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣٠٥؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٣٤٠.

(٥) - معجم البلدان، ج٢، ص ٥٤٥.

(٦) - اليعقوبي، المصدر السابق، ص٧٦.

(٧) - وەکو هۆزی شوهیجانی کوردی. المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨؛ البكري، المسالك والممالك، ج١، ص٢٦٢.

## ٣٠- قَرْمِيسين/قەرميسين- كرماشا:

نـاوە بنچـینەیەکەی (کرمانشـاهان) ە و یـاقوتیش ئامـاژەی بـەوە کـردووە، بـۆ (قەرمیسین)ی عەرەبی گۆڕاوە[1]. بونیاتنەری ئەم شارە( قوباژ بن فیروز) (٤٨٨-٥٣١ز) پاشای فارس بووە[2].

هەروەها بە شارێکی بەناوبانگی نزیك دینەوەر لە نێوان هەمەدان و حولـوان وەسـفی دەکات. ئەگەرچی لەکاتی باسکردنی ئەو سەکۆیە بەردینیەی کەلەم شارەدا هـەبووە بـە شوێنی دەسەڵاتداری پاشاکانی چین و تورك و ڕۆمی دادەنێت[3]. ئەمـە ئەوەناگەیـەنیت کەئەم شارە لەدێرزەمانەوە شوێنی نیشتەجێی کوردی حوکمڕانانی نەبووە، لەبەرئـەوەی هەر لەسەدەی سێیەمی کۆچی نۆیەمی زاینیدا زۆربەی خەڵکەکەی لەکوردو عەجەم پێك هاتوون[4].

## ٣١- هَمَذَانُ/ هەمەدان:

کاتێك سەیری کتێبی (معجم البلدان)، سەبارەت بەم شارە دەکەین، دەبینین دانـەری کتێب چەند لاپەڕەیەکی بۆ تەرخان کردووە، کەوا هەندی لایەن و بارودۆخی ئەم شارە بە دیار دەخات، بگرە هەر لەناوەکەیەوە کەبۆچـی دەگەڕێتـەوە[5]. لەگـەڵ ئـەو جیـاوازی بیروڕایانەی سەبارەت بە م شـوێنە هـەبووە خسـتوویەتیە ڕوو، بەشـێوەیەك جارێـك بـە چاکترین و ڕەفاهیەت و پتەوترین ناوچەی مەلیکەکان دانراوە. جارێکی تر بە ناقۆڵاترین

---

[1] - معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٣٠؛ الحميري، المصدر السابق، ص ٤٥٦.

[2] -ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص٤٢٢؛ معجم البلدان، مج٤، ص٣٣٠.بـەلام لەهەنـدێ سەرچـاوە پاشا (بهرام بـن سـابوورذو الاكتـاف)بـە بنیاتنـەری ئـەم شـارە دادەنرێـت.مؤلـف مجهـول، مجمـل التـواريخ والقصص، ص٦٨.

[3]- معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٣٠.هەروەها (ابن الفقيه الهمذاني) ئاماژەی بە شوێنی سـەکۆی مەلیکـەکان کردووە. البلدان، ص٤٢٩.

[4]- اليعقوبي، المصدر السابق، ص٧٦.

[5] -بروانە ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل٢٦.

**(اقبح) شار و (دۆزەخ درە) واتا دەرگای جەهەنەم وەسفی دەکات[١].**

**لە ناوەراستی هەرێمی چیاکان هەلکەوتووەو، بە گەورەترین ناوچەی ئەم هەرێمەدادەنرێت[٢]. لە چەندین شارۆچکە و گوند و ناوچە پێك دێت و، بە نزیکەی شەش سەد و شەست گوند دەخەملێنرێت[٣]. هەروەها بەگرینگترین شارەکوردیەکانی هەرێمی چیاکان دادەنرێت[٤]، یاقوت کوردەکان لەم شارە بەدیار دەخات [٥].**

## ٣٢- نِهَاوَنْد/ نەهاوەند:

**سەبارەت بە ناوەکەی یاقوت دوو بیروڕا دەخاتە بەرچاو یائەوەتا ناوی بنیاتنەری شارەکە نوح (سلاوی خوای لێبێ) بووە[٦]. یان بۆ سروشتی بارودۆخی شارەکە کە خێروبێری زۆر بووە، بۆیە بە (نیوهاوند) واتا (چەندەها خێر) هاتووە[٧]. هەروەها بە(ماە بصرە)[٨] و (ماە دینار)ش[٩] ناوبردراوە. کەوتۆتە باشووری شاری هەمەدان[١٠]، واتا لای باکوورەکەی ئەم شارەیەو و نێوانیان( چوار فەرسەخ/ ٢٤ کم) بووە[١١].**

---

(١) - معجم البلدان، مج ٥، ص ص ٤١٢- ٤١٣.

(٢) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٣٧؛ السمعاني، المصدر السابق، ج٥، ص٦٤٩؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص ٤١٧؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٦٤٨.

(٣) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١٠.

(٤) — البكري، المساللك والممالك، ج١، ص٢٦٢.

(٥) - هەروەکو لەدەریاچەی فرهان ئەمە بەدیار ردەکەوێت.معجم البلدان، مج٤، ص٢٥٨.

(٦) - المصدر نفسە، مج ٥، ص ٣١٣. هەروەها بروانە:السمعاني، المصدر السابق، ج٥، ص٥٤١؛القزويني، اثار البلاد، ص٤٧١.

(٧) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤٩، ص ٣١٣.

(٨) -لەبەر ئەوەی هەروەکو شاری دینەوەر ئەودەسکەوتەی کەلەخەلکی شاری نەهاوەند کۆ دەکرایەوە بۆ شاری بەسرە دەناردرا. معجم البلدان، مج٥، ص٤٨؛ الانصاري، المصدر السابق، ص١٨٣.هەربۆیەش ڕەنگە ناوی شارەکە بۆ سروشتی بارودۆخەکە بگەرێتەوە.

(٩) -بۆ ناوی ئەوپیاوە فارسە دەگەرێتەوە، لەکاتی فەتحکردنی ئەم ناوچەیە دەستگیر کراوە، دواتر موسولّمانان لەگەلّی رێك کەوتوون بەسەپاندنی باج و سەرانە .معجم البلدان، مج٥، ص٤٩.

(١٠) -ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣٠٥؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤١٧.

(١١) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٣١٣.

## ٣٣- أَسَدَآباذ/ ئەسەد ئاباد- شێراوە[(١)]:

ئەم شارە دەكەوێتە سەر ڕێگای نێوان هەمەدان و عێراق و ماوەی نێوانیان قۆناغێكە لەگەڵ هەمەدان[(٢)]، بەلاّم (المهلبی) ماوەی نێوانیان (نۆفەرسەخ/ ٥٤كم)ی داناوە[(٣)].

## ٣٤- بَرُوجِرْد/ بەروجیرد:

شارێكە لە نێوان هەمەدان و( كەرەج)[(٤)] وماوەی نێوانی لەگەڵ یەكەمیان (هەژدە فەرسەخە/١٠٨كم )و لەگەڵ كەرەجیش( دە فەرسەخ/٦٠كم)ە[(٥)]. وە ئەو جیاوازییەی لەنێوان كتێبەكەی یاقوت و زانیاری تر دەبینرێت ئەوەیە ناوبراوكە ئاماژە پێدەكات، سەرەتا گوندبووە دواتر بۆتە شار[(٦)]. بەلاّم لەهەندێ سەرچاوەدا بەمەڵبەندێكی گرینگی كورەی (ماه البصره)باسكراوە[(٧)].

## ٣٥- كَنْكِوَرَ/ كەنكیور[(٨)]:

گوندێكە لە نێوان هەمەدان و قەرمەسین[(٩)]، یاقوت هەمان ئەو شوێنە بە (قصر اللصوص)شی وەسف كردووە.[(١)]

---

(١) -لەبەر ئەوەی دەكەوێتە بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاكان وئەویەشەش زۆربەی كورد بوون، هەرلەبەر ئەمە توێژەرێك پێی وایە لەسروشتی گێرانەوەكانی یاقوت زۆربەی ناوی ناوچەكانی بۆ زمانی عەرەبی گەراندۆتەوە ورەنگە ئەمەشی كردبێتە عەرەبی. حكيم احمد مام بكر، المرجع السابق، ص١٨٠.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٧٦، بەلاّم (ابن رستە) لەسەر ڕێگای نێوان هەمەدان بۆ ناوچەی رەشەخاك دەربڕیوە، كەهەمان مەبەستی شوێنەكەی یاقوتە.، الاعلاق النفيسة، ص ١٦٧.

(٣) - المسالك و الممالك، ص ١٤٥.

(٤) - كەرەج: شارێكە لە نێوان هەمەدان و ئەسفەهان، لە هەمەدانەوە نزیكترە، نێوانیشیان (سێ فەرسەخ /١٨كم) بووە، .معجم البلدان، مج٤، ص ٤٤٦.

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٤٠٤، مج ٤، ص ٤٤٦.

(٦) - المصدر نفسه والصفحه .

(٧) -قدامة بن جعفر، المصدر السابق، ص١٧٣.

(٨) -هاوكات گوندێكی گەورەیە لەلای باشووری قەدپاڵەكانی لوتكەی چیای ئەڵوەند. النقشبندی، اذربيجان، ص١٢٢.

(٩) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٦٣؛ القزوينی، اثار البلاد، ص٤٨٨؛ سباهی زاده، المصدر السابق، ص٥٢٢.

سەبارەت بە ناوی ئەم شوێنە ناوبراوئەوە ڕوون دەکاتەوە، ئەوکاتەی لە ژێر دەسەڵاتی فارسەکان بووە بە کەنکیور ناوبردراوە [٢]. بەڵام دوای هاتنی سوپای ئیسلام بۆ ئەم و نیشتەجێبوونیان لەم ناوچەیەدا ماڵاتەکەیان توشی ڕاوڕووتی هاتووە. لەو کاتەوەش بە (قصر اللصوص) ناوبردراوە[٣].

## ٣٦-سابور خُواسْت/ سابورخواست(شابور خواست)- خورەم ئاباد[٤]:

یاقوت ئەم شارە جارێك بە ویلایەتێکی نێوان خوزستان و ئەسفەهان وەسف دەکات،[٥] هەندێ جاریش بەشار ناوی دەبات[٦]. دەکەوێتە باشووری شاری نەهاوەند[٧]، کە ماوەی نێوانیان (بیست و دوو فەرسەخ/ ١٣٢ کم) بووە[٨]. ناوەکەشی بۆ بنیاتنەرەکەی گەڕاندۆتەوە[٩].

---

(١) - معجم البلدان، مج٤، ص ٣٦٣.
(٢) - معجم البلدان، مج٤، ص ٣٦٣.
(٣) - المصدر نفسه و الصفحه.
(٤) -هاوکات شارێکی گرینگی هەرێمی لوڕستانەو دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای وڵاتی ئیران.النقشبندی، الدینور وشهرزور، ص٣١.
(٥) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٦٧.
(٦) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٤٥٤.
(٧) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٣٠٧.
(٨) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٦٧.
(٩) - لەدووبرگە پێك هاتووە (سابور یاخود شاپوری کوری ئەردەشێری پاشای فارسی) و برگەی دووەم پاشا کاتێك خۆی لەخەلك بزرکردووە خەلکانێك لەم ناوچەیە دا داوای ئەم پاشایەیان کردووەو بەدوای گەڕاون. معجم البلدان، مج ٣، ص ١٦٧.

## چوارەم// شارە كوردنشینەكانی هەرسێ هەرێمی ئازەربایجان و ئاران وئەرمینیا:

### ٣٧- أُرْمِيَة/ ئورمية- ورميَ:

ئەو زانیاریانەی كە یاقوت خستویەتیەڕوو، بەشارێكی كۆن لە هەرێمی ئازەربایجاندانراوە [(١)]، بەشێوەیەك كە دەكەوێتە كۆتا بەشی ڕۆژئاوای ئەم هەرێمە[(٢)]. هەروەها ناوبراو ماوەی نێوانی لەگەڵ دەریاچەی ئورمیە (فەرسەخێك و نیو/ ١٢ كم) دادەنێت[(٣)]، وەدوای ئەوەی لەساڵی(٦١٧ ك/ ١٢٢٠ ز) سەردانی ئەم شارەی كردووەو بەناوچەیەكی خاوەن خێرو بێری هەوا پاك وئاوی زۆر وەسفی دەكات، هەر لەوێوەوگەڕاوەتەوە ئیربل وماوەنێوانیشیان حەوت ڕۆژە ڕێ ی داناوە[(٤)]. لەمێژووشدا بەشارێكی كوردی دادەنرێت[(٥)].

### ٣٨- أُشْنُه/ ئوشنۆ-شنۆیە:

دوای ئەوەی یاقوت ئەم شارەی بەوێرانی بینیوە، وەسفی شوێنهەلكەوتنەكەی دەكات، كە كەوتۆتە ئەو لایەی هەرێمی ئازەربایجان كە لەبەری شاری ئیربل دایە، واتا لەبەشی

---

(١) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٥٩.

(٢) - سباهی زادە، المصدر السابق، ص١٤٤.بڕوانە نەخشەی ژمارە(٧). لەگەڵ ئەمەشدا بەیەكێك لەشارەكانی ئەرمینیا ژمێردراوە المقدسی، المصدر السابق، ص٢٨٢

(٣) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٥٩.ئەم دەریاچەیە دەكەوێتە باكووری ڕۆژئاوای شاری ئورمیە.ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٨٩؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٣٩٧.

(٤) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٥٩.

(٥) -هەروەكو چۆن (مەسعودی ) هەرێمی ئازەربایجان بەشوێنی نیشتەجێبوانی هۆزی هەزبانی كوردی دادەنێت، مروج الذهب، ج٢، ص.٣٣٨ جگە لەمەش لەشاری ئورمیە دەسەلاَتی (ابی هیجاءبن ربیب الهذبانی) لەسەدەی پێنجەمی كۆچی یازدەهەمینی زاینیدا بەرچاو دەكەوێت. ابن خلدون، تاریخ ابن خلدون المسمی ب(دیوان المبتدا والخبرفی تاریخ العرب والبربر ومن عاصرهم الشان الاكبر)، ضبط المتن ووضع الحواشي والفهارس:خلیل شحادة، (بیروت، ٢٠٠٠)، ج٤، ص ص٦٧٦-٦٧٧.

ڕۆژئاوای ئەم هەرێمـە، دووریەكەشـیان پێـنج ڕۆژە ڕێ بـووە[1]. بـەڵام ئـەو بارودۆخـە وێرانكارییە هەروەكو خۆی نەماوتەوە، بەڵكو لە ڕۆژگاری (حمدالله المستوفی القزوینی) دا گۆڕانكاریی بەسەرداهاتووە و باردۆخێكی مامناوەندیی وەرگرتووە[2].

جگە لەوەی كەوتۆتە نێوان دوو شاری كوردی ئیربل و ئورمیە، بەڵكوخۆی بەشـوێنی هەرە گرینگی هۆزی هەزبانیەكان و زەرزاری كوردی دادەنرێت[3].

## ٣٩- تِبْرِیْز/ تیبریز-تەوریز:

یاقوت لایەنە جوگرافیەكەی ئەم شارەی یەكلا نەكردۆتـەوە، كـە كەوتۆتـە بـاكووری ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ئورمیە، نێوانیشیان نزیكەی (هەشت فەرسەخ/ ٤٨ كم) ە[4]، بەڵام لە ڕیز شارە ناسراوەكانی هەرێمی ئازەربایجـانی دانـاوە[5]. ئامـاژەش بـەو دەكـات كـە سەرەتا گوندێك بووە تا ڕۆژگاری خەلیفەی عەباسی متەوەكیل (٢٣٢-٢٤٧ك/ ٨٤٦-٨٦١ز) پاشان بنیات نراوە و قایكاری بۆ كراوە، لەئەنجامدا چڕی دانیشتوانی ئەم شـارە زیادی كردووە[6].

لەگەڵ ئەوەی هیچ دەقێكی ڕاستەوخۆمان نیە لەسەرچاوەكان، كە ئاماژە بەوە بكات كە ئەم شارە كوردی لێ ژیاوە بەڵام لەتێبینیەكانی مینۆرسكی و، كە باس لەدەسـەڵاتی

---

(١) – معجم البلدان، مج١، ص ٢٠١ .بەشێوەیەك لای باشووری ڕۆژئـاوای هـەرێمی ئازەربایجانـەو وەلەبـەری باكووری شاری ئورمیەیە.بڕوانە: نەخشەی ژمارە(٧)،

(٢) - نزهة القلوب، ص ٨٦.

(٣) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٨٩؛ ابن فضـل اللـة العمـری، المصـدر السـابق، مخطوطـة مصـورة، ج٣، ص١٢٥. بۆزیاتر زانیاری دەربارەی ئەم هۆزانە بڕوانە: بەشی چوارەمی ئەم لێكۆلینەوەیە.

(٤) - بارتولد، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة(تبریز)، مج٩، ص١٧٣؛ النقشبندي، اذربیجان، ص ٥٢.

(٥) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣.

(٦) - المصدر نفسە و الصحفة.(قدامة بن جعفر) و (ناسرخسرو) بەرلەیاقوت باس لەم گۆڕانكارییەی بارودۆخـە كە دەكـەن، بـەجۆرێك تووشـی بوومەلـەرزە هـاتووە. الخراج و صـناعة الكتـاب، ص ص ٣٨١- ٣٨٢؛ سفرنامە، ترجمة: یحي خشاب، (القاهرة: ١٩٤٥)، ، ص ١٠.

**(حسین كوری محەمەد) [١] لەسەدەی چوارەمی كۆچیەوە لەم ناوچەیە دەكات، كە هەستاوەبە بونیات نانەوەی ئەم شارە[٢] و بەراوردكردنی لەگەل تێبینیەكانی (مسكویە) (م :٤٢١ك/١٠٣٠ز)[٣] و ڕوونكردنەوەی لێكۆلەرانیش [٤]، ئەوەمان بۆ بەدیار دەخات دەسەلاتی میرنشینی كوردی لەسەدەی چوارەمی كۆچی دەیەمی زاینیدا گەیشتۆتە ئەم ناوچەیە، بۆیە لەڕیزی شارە كوردنشینەكانمان داناوە.**

**هەروەها ناوچەی (دشت) شوێنێكی نێوان ئەربل و تیبرێز بووە، دانیشتوانەكەی هەموولە كورد پێكهاتووە[٥].**

## ٤٠-سَلَماس/ شەڵماش[٦]:

**شارێكی بەناوبانگی هەرێمی ئازەربایجانە[٧]، لە نێوان شاری تیبرێز و ئورمیەیە[٨]. ئەگەرچی یاقوت بەوێران بینیویەتی، بەلام ڕەنگە ناوبانگی ئەو باسكردنەی بۆ سەرچاوەكانی تر و سەردەمی زووتر بگەڕێتەوە. هەروەكو چۆن (المهلبی) بە شارێكی**

---

(١) - حسین بن محمد: ناسراوە بە(ابو الهیجاء الروادی) لەسالی (٣٤٤ك/٩٥٥ز) دەسەلاتی ئەئازەربایجان هەبووە، ولە سالی(٣٤٥ك/٩٥٦ز) دەستی بەسەر تەوریز داگرتووە.ابن حوقل، المصدرالسابق، ص٢٨٩. بۆزیاتر زانیاری بروانە :قادر محمد حسن، الامارات الكوردیە فی عهد البویهی، ص ص٢٥-٢٦.

(٢) Minorisky, studies in Caucasian history, (London:1953), p, 168.

(٣) - كەهەر لەم سەدەیەدا ئاماژە بە دەسەلاتی حسین كوری محەمەدی ڕەوادی كراوە كە بە (ابی هیجاء الروادی)ش ناسراوە لەهەرێمی ئازەربایجان بەدیار كەوتووە .تجارب الامم، ج٢، ص ١٨٠؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٨٩.

(٤) - بۆزیاتر زانیاری بروانە: النقشبندی، اذربیجان، ص ص١١٣-١١٥؛ قادر محمد حسن، الامارات الكوردیة فی عهد البویهی، ص ص٢٥-٢٦.

(٥) - معجم البلدان، مج ٣، ص٢٤٥ ؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٣٢٧.

(٦) -بروانە: ابن خرداذبة، المصدر السابق، ص ص١٠٦-١٠٧؛ الیعقوبی، المصدرالسابق، ص٨٠؛ المقدسی، المصدر السابق، ٢٨٤؛سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٩١.

(٧) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٣٩؛ ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٩٧.

(٨) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٣٩؛ القزوینی، اثار البلاد، ص ٣٩١.

گەورە و شوێنێکی بازرگانی باسیکردووە[١].

بەشوینی هۆزە کوردیە کۆنەکان دادەنرێت و تەنانەت ئەو هۆزانە بەشداریان لە رووبەڕوونەوەی هێرشکاری (حەمدانیەکان) [٢] لەساڵی(٣٣٢ك/٩٤٣ز ) کردووە[٣].

## ٤١- مَرَنْد/ مەرەند:

ئەو زانیارییانەی کەیاقوت سەبارەت بەم ناوچەیە خستوونەتیەڕوو، بە شارێکی دیاروناسراوی هەرێمی ئازەربایجانی داناوە[٤]، سەرەتا گوندێك بووە[٥]، بەڵام گۆڕانکاری لە فراوان و چڕی دانیشتوانی بەدی کراوە[٦]. دواتر تووشی هێرشی داگیرکاری هاتووە، ناوبراو کاولکاریەکەی بینیوە[٧].

بەڵام بەبێ دیاریکردنی ناوچەکانی دەوروبەری، کەکەوتۆتە رۆژهەڵاتی شاری (خوێ)[٨]، لەگەڵ مێژووی ناوچەکە و نەتەوە نیشتەجێبووەکانی و دەسەلاتداری ناوچەکە کەوەکو (عصمت کوردی) لەسەدەی سێیەمی کۆچی نۆیەمی زایینی دەسەلاتی لەم ناوچەیە هەبووە[٩].

---

[١] - المسالك و الممالك، ص ١٤٢.

[٢] - حەمدانیەکان: ئەو بنەماڵەیە خاوەنی دەوڵەتی حەمدانی لەموسل (٢٩٣-٣٩٢ك/٩٠٥-١٠٠١ز) بووە، کەرەچەڵەکیان بۆ هۆزی تەغلوبی عەرەبی دەگەڕێتەوە. جرجي زيدان، تاريخ الادب اللغة العربية، (بيروت:١٩٦٧)، ج٢، ص٥٣٦؛ بۆزیاتر زانیاری بڕوانە: فيصل السامر، الدولة الحمدانية فى الموصل والحلب، (بغداد:١٩٧٠)، ج١، ص٤٠.

[٣]- مسكويه، المصدر السابق، ج٢، ص٦٥.

[٤] - معجم البلدان، مج ٥، ص ١١٠.

[٥] - البلاذري، المصدر السابق، ص ٣٢٥؛ معجم البلدان، مج ٥، ص ١١٠.

[٦] - معجم البلدان، مج ٥، ص ١١٠.

[٧] - المصدر نفسه و الصحفه.

[٨] - شاری خوی: لەرۆژئاوای شاری مەرەندی هەرێمی ئازەربایجانەو نێوانیشیان (دوانزە فەرسەخ/٧٢کم ).المهليي، المصدر السابق، ص ١٤١.

[٩] - ئەم کەسایەتیە پاڵپشتی بابەك خورەمی (٢٢٠ك/٨٣٥ز) ی کردووە بەیەکێك لەسەرکردە ی سوپاکانی دادەنرێت، تەنانەت بابەك لەم ناوچەیە پشتی پێبەستووە. الدينوري، الاخبار الطوال، تحقيق: عبد المنعم

## ٤٢- مَرَاغة/ مەراغە:

كۆنترین شاری هەرێمی ئازەربایجانە[١]، لەسەرەتا ناوی (افراز هروژ)[٢] بووە، بەلاّم لەو كاتەوە بۆتە مەراغە، كە وەكو لەوەڕگایەك بۆ لەوەڕاندنی مالاّتی سوپای سەربازانی خەلیفەی ئەمەوی (مەروانی كوری محەمەد) (١٢٧-١٣٢ ك/ ٧٤٤-٧٤٩ز)، كە ئەوكات والی ئەرمینیا و ئازەربایجان بوو، بەكارهاتووە، هەر لەبەرئەوە یە یاقوت بنچینەی ناوەكەی بۆ وشەی عەرەبی(تمرّغ) دەگەرێنێتەوە[٣].

بەلاّم لەتێبینیەكانی ناوبراودا دەسەلاّتی فارسەكان وعەرەبەكان بەتایبەتی بەدیار دەكەوێت، بەبیّ هیچ ئاماژەیەك بۆنەتەوەكانی تر، چونكە كوردەكان لەسەدەی پێنجەمی كۆچی یازدەهەمینی زاینیدا لەم شارە تووشی كوشتاری زۆر هاتوون لەلایەن هۆزی (غوز)[٤] كاتیّ هێرشیان كردۆتە سەرهەرێمی ئازەربایجان[٥].

## ٤٣- نَشَوي/ نەشەوی- نەخچەوان[٦]:

سەرەتا یاقوت بەشارێك لەدوورترین سنوری لای باكووری هەرێمی ئازەربایجانی

---

العامر، مراجعه :جمال الدين شيال، (القاهره:١٩٦٠)، ص٤٠٢؛كوثر اسماعيل حسين، الحياة الاقتصادية والاجتماعية في اقليمي اذربيجان واران خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين / العاشر وحادي العشر الميلاديين، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠٢)، ص١١٥.

(١) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٩٣.

(٢) - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٢٨.

(٣) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٩٣؛ سباهي زادة، المصدر السابق، ص٥٨٣.

(٤) - (الغز) هۆزێكی تورك بوون، بەسەلجوقیەكانیش ناسراون، كە ئەم ناوەش بۆ سەركردایەتی یەكەمی سەلجوق كوری تقاق باپیرە گەورەی توركەكان دەگەرێتەوە.ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص٣٦، تامار تالوت رايس، السلاجقة، ترجمة: لطفي خوری، ابراهيم داقوقي، (بغداد:١٩٨٦)، ص ص١٨-١٩.

(٥) - ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص١٥٧؛احمد خليل، تاريخ الكردفي الحضارة الاسلامية، (بيروت:٢٠٠٧)، ص١٨٨.

(٦) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٧٦.

دادەنێت[١] . لەگەڵ ئەمەشدا بەپێی خستنەڕووی ئەو ڕایانەی کە پشتی پێ بەستووە، شارێکە لە ئاران و دەکەوێتە کورەی (بسفرجان)[٢]، لکاوە بە ئەرمینیا[٣].

دەتوانین بەشارێکی کوردنشین دابینێن، ئەگەرچی یاقوت ئاماژەی بۆ نەکردووە، لەبەر ئەوەی بنەمالەیەکی کوردی بەناوی شەدادی لەزۆر ناوچە ی هەرێمی ئاران نیشتەجێبوونە، شاری نەخچەوانیش یەکێك بووە لەم شارانە[٤] .

## ٤٤- بَرْذَعَة/ بەرزەعە:

ناوی ئەم شارە لەلای یاقوت لە (بەردەدار)ەوە هاتووە، لە زمانی فارسی واتە ئەو شوێنەی کە دەستی بەسەردا دەگیرا، وەگەڕانەوەی ئەم ناوەش بۆفارسی لای ناوبراو، خۆی لەوەوە سەرچاوەگرتووە، کاتێ فارسەکان دەستیان بەسەر هەرێمی ئەرمینیاداگرت، لەم ناوچەی بەرزەعە نیشتەجێ بوون، تەنانەت ئاماژە بەوەدەکات (قوبادی پاشای فارسی) بونیاتی ناوە. بەلآم ڕایەکی تریش دەخاتە ڕوو کە گومانی لێ هەیە، ئەویش گەڕاندنەوەیە بۆ پیشەی (برذاع) واتا کورتان دروو، بەلآم ڕای یەکەم بەڕاستتر دادەنێت[٥]. بەلآم لەوانیە لەووشەی کورتان درووە وهاتبێت، بەجۆرێك خەلکی ناوچەکە خەریکی ئەم پیشەیە بووبن.

ئەم شارەی لە زەویەکی دەشتایی لە خالی کۆتایی لای باکووری سنووری هەرێمی ئازەربایجانی داناوە[٦]. بەلآم جیاوازی لەڕایەکانیشی بەدیار دەخات، بەجۆرێك کە (ابن

---

(١) - المصدر نفسة والصفحة.

(٢) - بسفرجان، کورەیەکە لە زەوی ئاران. معجم البلدان، مج ١، ص ٤٢٢.

(٣) -المصدر نفسه، مج٥، ص٢٨٦ .بەلآم سەرچاوەکانی بەر لەیاقوت ودوایی بەشارێکی سنوری هەرێمی ئارانیان داناوە. ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٩٥؛ السمعانی، المصدر السابق، ج٥، ص٤٩٠؛القزوینی، اثار البلاد، ص٤٩٣؛ الانصاری، المصدر السابق، ص١٨٩.

(٤) - اسماعیل شکر رسول، المرجع السابق، ص٤٥.

(٥) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.کەچی لەهەندێ سەرچاوە ناوەکەی بۆیەکەمین نیشتەجێبووی کە (برذعة بن اران بن یافث بن نوح) بووە دەگەڕێننەوە. الانصاری، المصدر السابق، ص١٨٩؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٠٠.

(٦) -. معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٠٠.

الفقيه الهمذاني) به شارێكی هه‌رێمی ئـارانی دانـاوه[1]. جگـه لـه‌وه‌ی خـۆی ناوچـه‌ی (لصوب) به نزیكی به‌رزه‌عه له زه‌وی ئاران وه‌سف ده‌كات [2]. دووری نێوانی له‌گه‌ڵ شاری گه‌نجه (نۆ فه‌رسه‌خ /٥٤كم)بووه[3]. هه‌روه‌ها له‌گه‌ڵ رووباری (سه‌رسـور) یشـه‌وه (یـه‌ك فه‌رسه‌خ/ ٦ كم)[4] بووه.

به‌لاَم بۆ وه‌سفكردنی شاره‌كه پشت به زانیاری ( الاصطخري) ده‌به‌ستێت، كه‌وا چۆن به شارێكی گه‌وره‌و جوان و به پیت، ئاوه‌دان وخاوه‌ن بازار، كه‌كورده‌كان ده‌وره‌ی بازاره‌كه‌یان داوه‌و، یه‌كێك له‌ده‌رگای ئه‌م شاره‌یان به‌ناو بووه، به‌جۆرێك دوای شاری ره‌ی و ئه‌سفه‌هان به‌ناوبانگ بووه، ته‌نانه‌ت بگره له‌عێراقه‌وه بۆ خوراسان هیچ شارێك به وێنه‌ی به‌رزه‌عـه نه‌بووه. ئه‌گه‌رچی یاقوت ئه‌مه‌ی به سیفه‌تێكی كۆنی داناوه. چونكه كاتێ ئه‌م ناوچه‌یه‌ی بینیوه ته‌نیا پاشماوه‌ی وێرانكاری به‌رچاوكه‌وتووه و بارودۆخی خـه‌ڵكی ناوچـه‌كه خـراپ بووه[5]. كه‌ئه‌مه‌ش بـۆ بـارودۆخی ئـه‌وكاتی جیهـانی ئیسـلامی ده‌گه‌رێتـه‌وه تووشـی هێرشكاری دوژمنان هاتووه. [6]

## ٤٥- بِيْلَقَان/ به‌یله‌قان (فیداكاران) [7]:

ده‌رباره‌ی ئه‌م شاره یاقوت ئاماژه به‌وه ده‌كات، یه‌كێك له‌پاشاكانی فارسـی دوویـاره ئاوه‌دان كردۆته‌وه[1]. به‌مه‌ش دێرینی ئه‌م شاره به‌دیار ده‌كه‌وێ، كه‌پێش ئه‌وه‌ی فارسه‌كان له‌و ناوچه‌یه بووبن ئه‌م شاره هه‌بووه.

---

(1) -البلدان، ص ٥٨٣؛ معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.هه‌روه‌ها بروانه: المقدسي، المصدر السـابق، ص٢٨١؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤٠٣.

(2) - معجم البلدان، مج ٥، ص ١٧.

(3) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٣٧٩. هه‌روه‌ها بروانه: ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٢٩١.

(4) - المسالك و الممالك، ص ١٠٨، معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.

(5) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٧٩.

(6) - بروانه ل ل١٦٦-١٧٣، ئه‌م لێكۆلینه‌وه‌یه

(7) - بروانه: اسماعيل شكر، المرجع السابق، ص٤٤.

دەكەوێتە ئەرمینیای گەورە لەنزیك شاری دەربەند[٢]. سەبارەت بە جیاوازی رایەكان رای خۆی دەخاتەروو، پەنجە دەخاتەسەر ئەوەی كە لە هەندێ باسكراوكان بەیەكێك لەشارەكانی هەرێمی (ئاران)یان ژماردووە[٣].بەلاّم نازانرێت ئایا مەبەستی ناوبراولەئەرمینیای گەورە لێرەدا چیە، چونكە ئاران بەشێك بووەلەئەرمینیای گەورە. رەنگە وەكو تەنها جیاوازیەك لەچۆنیەتی دەربرین بۆ وەسف كردنی ئەم ناوچەیە بێت.

لێرەدا دەتوانین ئەم شارەش لەریز شارە كوردنشینەكان دابنێین چونكە دەسەلاتی میرنشینی شەدادی كوردی(٣٤٠-٥٩٥ك/٩٥١-١١٩٨ز) گەیشتۆتە ئەم ناوچەیەو بنەمالەكەی لێ نیشتەجێبوونە[٤].

## ٤٦- جَنْزَة- كَنْجَة/ گەنجە:

یاقوت بەشارێكی گەورەی هەرێمی ئارانی دادەنێت[٥]. كەوتۆتە نێوان (شمكور)[٦] و بەرزەعە[٧]، و نێوانی لەگەڵ دووەمیان(١٦ فەرسەخ/٩٦كم)بووە[٨]. لەبەر ئەوەی لەلای خەڵك بەگشتی كەنجە بووە كەئەمەش وشەیەكی كوردیەو لێرەدا بەمانای نوێ

---

(١) - معجم البلدان، مج ١، ص ٥٣٣.بەلام یەكەمین بنیاتنەری ئەم شارە بۆ(بیلقان بن ارمینی بن لنطی بن یونان)دەگەرێتەوەكە تیایدانیشتەجێ بووە.السمعانی، المصدر السابق، ج١، ص٤٣٥؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤٠٣.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ٥٣٣.

(٣) - ئەگەرچی یاقوت ناویان ناهێنێت، بەلاّم بۆ بەلگە وتەكەی هەریەكە لە (البلاذري) و (ابن حوقل) شوێنی بەیلەقانیان لە سنوری هەرێمی ئاران داناوە. فتوح البلدان، ص ١٩٨؛ صورة الارض، ص ٢٩٤.

(٤) - بۆ زیاتر زانیاری بروانە: اسماعیل شكرسول، المرجع السابق، ص٤٥.

(٥) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٧١؛مج ٤، ص ٤٨٢؛القزوینی، الثار البلاد، ص٥٢٢.

(٦) -شەمكور: شارێكی كۆنی هەرێمی ئارانەو نێوانی لەگەل بەرزەعەدا(یازدە فەرسەخ/٦٦كم )بووە.معجم البلدان، مج٣، ص٣٦٤.

(٧) - الاصطخری، المسالك والممالك، ص١١٣.

(٨) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٧١.

وتازەپێگەیشتوو دێت  کە دەتوانین کورد نشینی شارەکەی پێوە بسەلمێنین . [(١)]

بەڵام ناوبراو  بەشێوەیەك لەگەڵ سنوری دەرەوەی هەرێمەکەی سەیری کردووەولە نێوان شەروان و ئازەربایجانی داناوە، لەلای خەڵکی نووسەر و ئەدیب زیاتریە (جنزە) ناوبردراوە[(٢)]. کە هاوکات ئەم ناوچە یە (کەنوئاباد)ی پێدەڵێن[(٣)].

## ٤٧- باب الأَبْواب– الدَرْبَنْد/دەربەند:

شارێکە لە کەنارەکانی ڕووباری خەزەر، لەباکووری هەرێمی ئارانە[(٤)]، وەکو پێگەیەك بۆ خەڵکی هەرێمی ئاران و ئەرمینیا و ئازەربایجان سەیر کراوە، پێویستی بە بەرگری کردن نییە، کە ئەمەش بۆ چۆنیەتی دروست کردن وشوێنی هەڵکەوتنی شارەکە دەگەڕێتەوە. یاقوت تیشك دەخاتە سەر ئەم بارودۆخە و هۆکاری دروستکردنی ئەم شارەو نەتەوە و حوکمڕانانی ئەم ناوچەیە.  بە وەرگرتنی زانیاری لە  کتێبەکەی (الاصطخری)[(٥)] بەجۆرێك ئەم شارە خاوەنی بەندەر و ئەو دوو پردەی کە لەسەر بەندەرەکە دروستکراوە، واتە لە نێوان بەندەر و دەریاکە، ئەم دووپردەتاکە ڕێگەیە بۆ ناوچەکە، جگە لە شورەکەی تا ناو دەریا درێژ دەبێتەوە[(٦)].

هەروەها یاقوت ئاماژە بەوەدەکات کەناوی دەربەند بۆ وشەیەکی فارسی دەگەڕێتەوە[(٧)]، کەچی وشەیەکی کوردیەو بەمانای ئەوشوێنە(تەنگە) یەکە، دەکەوێتە

---

(١)- جگە لەوەی کورد لەم شارە ڕاستەوخۆ لەلایەن سەرچاوەکان بەدیار خراوە وتەنانەت هەندێکیان بە پایەتەختی میرنشینی شەدادی دادەنێن.بروانە ئەم لێکۆلینەوەیە، ل٥١، پەراوێزی، ژمارە (١) ؛ احمد کیسروی، شهریاران کمنام (تهران: ١٣٣٦)، ج٣، ص٢٧٢.

(٢) – المصدر نفسه، مج ٤، ص ٤٨٢. بەلام( الاصطخری)( نۆ فەرسەخ٥٤/کم) دادەنێت. المسالك والممالك، ص١١٣.

(٣) - اسماعیل شکر رسول، المرجع السابق، ص ٤٠.

(٤) - ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٩١؛ معجم البلدان، مج ١، ص ٣٠٣.

(٥) - المسالك و الممالك، ص ١١٠.

(٦) - معجم البلدان، مج ١، ص ص ٣٠٣- ٣٠٦.

(٧) معجم البلدان، مج٣، ص٣٣٩.

نێوان دوو چیا[١]، جگە لە و دەسەڵاتی سیاسی کوردی لەسەدەی چوارەمی کۆچی دەیەمی زاینی ئەو راستیە دەسەلمێنێ، کەناوچەیەکی کوردنشین بووە، کە لێکۆلەران لەم ناوچەیە بەدیاریان خسووە[٢].

## ٤٨- شَرْوَان/ شێروان:

ئەگەرچی یاقوت دوودەربڕینی هەیە بۆ باسی ئەم شارە، سەرەتا بەیەکێ لەشارەکانی دەوروبەری شاری دەربەندی کەناری خەزەری دادەنێت، نێوانیشیان (سەد فەرسەخ/ ٦٠٠ کم)ە[٣] دواتر ڕاستەوخۆ بەیەکێك لەشارەکانی سنوری هەرێمی ئاران دەژمێردرێت[٤]. کەهەمان ناوچە دەگرێتەوە. وەلە ڕۆژهەلاتی ڕووباری (کور) درێژ دەبێتەوە تاکو شاری دەربەند[٥]، ناویشی دەگەرێتەوە بۆ یەکەم کەس کە دروستی کردووە [٦]. هەروەها لەلایەن ولاّتناسان و یاقوتیش ئەو بەردەی کە لە قورئانی پیرۆز باسی دەکات (أرأيت إذْ أوَينا الى الصَخْرة فاني نَسيتُ الحُوت)[٧] لەچیرۆکی پێغەمبەر موسا(سلاوی خوای لێبێ) هاتووە،کەوتۆتە ئەم شارە پێوە بەناویانگە[٨].

---

(١) - لەزمانی تورکی(ديمر القابی)وئەرمەنیەکەی(جور)، رووسیش لە وشەی تورکی(کابوك)وەرگیراوە، عەرەبیەکەشی بە (باب الابواب)هاتووە. اسماعيل شكر رسول، المرجع السابق، ص٤١، هامش رقم(٩٦).

(٢) - المرجع نفسه، ص٤٦.

(٣) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٣٩.

(٤) - ابن خرداذبة، المصدر السابق، ص ١٠٨؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٨١.

(٥) - حمدالله مستوفي قزويني، نزهة القلوب، ص ٩٢.

(٦) - ئانوشەروان پاشای فارسی دروستی کردووە .معجم البلدان مج ٣، ص ٣٣٩؛ القزويني، اثارالبلاد، ص٦٠٠؛سباهي زادة، المصدر السابق، ص٤٢٠.

(٧) - سورة الكهف، أية ٦٣.

(٨) - ابن خرداذبة، المصدر السابق، ص ١٠٨؛ ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص ٥٨٣؛ معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٣٩؛ حمداللتمستوفي قزويني، نزهة القلوب، ص ٧٨.

## ٤٩- بَدْلِیس/ بەدلیس:

شارێكه له ئەرمینیا[١]، له نێوان خیلات و مەیافارقین[٢]، لەگەڵ شاری خیلات نێوانی (حەوت فەرسەخ/ ٤٢ كم) [٣]. ئەگەرچی سەرچاوەكان ئەو هەرێمەیان، كـه ئـەم شـارەی كەوتۆته سەر، بەشوێنی ڕەسەنی ئەرمەنیەكان دادەنێن[٤]، بەلاّم ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كه بەتنها شوێنی ئەرمەنیەكان بێت، بەڵكو شـوێنهەڵكەوتنی لـەنێوان دوو شـاری كـوردی لەلایەك ونیشتەجێبوونی هۆزی كوردی هەرلەكۆنەوه[٥] بەم هۆیـەوه دەتـوانین ئامـاژه بەوەبكەین، كەمێژووی ژیانی كورد لەم شاره دێرینه.

## ٥٠- خِلاط/ خیلات :

یاقوت ئەم شارەی بە مەڵبەندی (قصـبة) ئەرمینیای سێیەم داناوه، هاوسنوره لەگەڵ هەرێمی جەزیرەو دەكەوێته نێوان شاری بەدلیس و ئەرگیش[٦]، وەبه شـارێكی ئـاوەدان وخاوەن بەرهەمی زۆر وەسفی دەكات[٧]

بەلاّم ناوبراو باس لەتایبەتمەندیی ناوی شـارەكه ناكـات، كـه گەریدەیـەكی سـەدەی پێنجەم ناوەكەی بۆ جۆراوجۆری پێكهاتەی دانیشتوانی و نەتەوه جیاجیاكانی ئەم شـاره گەڕاندۆتەوه[١].

---

[١] - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٥٨.هەروەها بروانە:ابن حوقل، المصدر السـابق، ص٢٩٥؛المقدسـی، المصـدر السابق، ص٢٨١؛الانصاری، المصدر السابق، ص١٨٩.

[٢] - ابوالفدا، المصدر السابق، ص ٣٩٥؛سباهی زادة، المصدر السابق، ص١٩٧.

[٣] - المهلبي، المصدر السـابق، ص ١٤٠؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص٣٩٥.

[٤] - الاصطخری، المصدر السابق، ص١١٠؛اسماعیل علی، المرجع السابق، ص٥٠٠.

[٥] -هەروەكو هۆزی رۆژەكی، كه بەكورده كۆنـەكان نـاوبراون ودەسـەڵاتی تایبـەت بـەخۆیان هـەبووەو مـیری دلێریان لێهەلكەوتووه، هەروەها بەربەچی دوژمنی ولاتی بەدلیسیان داوەتـەوه. . شـەرەفخانی بەدلیسـی، شەرەفنامه، وەرگێرانی بۆ كـوردی: مامۆسـتا هـەژار، (هـەولێر:٢٠٠٦)، ل٤٧١، ئەولیاچـەلەبی، كـورد لەمێژووی دراوسێكاندا، وەرگێرانی سـەعید ناكام، (بەغدا:١٩٧٩ )، ل ١١٨.

[٦] - المقدسی، المصدر السابق، ص ص٢٨١-٢٨٢.

[٧] - معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٨٠.

## ٥١- أَرْجِيش/ ئەرجیش -ئەرکیش[٢]:

یاقوت لەبارەی ئەم شارەش نووسیویەتی، کە ناوچەیەکی کۆنە لەهەرێمی ئەرمینیا لە نزیک شاری خیلات(خلاط) [٣]. بەشێوەیەك کەوتۆتە بەشی رۆژهەڵاتی ئەم شارە[٤].

## ٥٢- مَنَازْجِرد/مەنازجیرد- مەلازگرد:

یەکێکە لە شارەکانی ئەرمینیاو یاقوت لە نێوان خیلات و وڵاتی رۆمی دەست نیشان دەکات[٥]، بەشێوەیەك نێوانی لەگەڵ شاری خیلات (حەوت فەرسەخ/ ٤٢ کم)بووە[٦].

ئەگەرچی پێکهاتەی خەڵکەکەی بە رۆم و ئەرمەن داناون بەڵام دەسەڵاتی کوردیشی لێبەدیار خستووە[٧]. جگە لەمەش ناوبانگی مێژوویی ئەم شارە بۆ روودانی شەڕی مەلازجرد (٤٦٣ ك/١٠٧١ز) لە نێوان سەلجوقیەکان و بیزەنتینیەکان دەگەڕێتەوەو کوردەکانیش بەشداریان تێدا کردووە [٨].

---

(١) - .ناسر خسرۆ، المصدر السابق، ص٧. کوردیش یەکێك بووە لەپێکهاتەی دانیشتوانی ئەم شارە، لەگەڵ بەدیار کەوتنی دەسەڵاتی میرنشینی دۆستەکی(مەروانی) کوردی(٣٧٢-٤٧٨ك/٩٨٢-٩٩٠ز)، بەتایبەتی لە باکووری دەریاچەی‌خیلات (وان). بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: حکیم عبدالرحمن زبیر. المرجع السابق، ص٦٩.

(٢) - لە کۆتدا بە (ارزشکو) هاتووە: شترك، دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ارجيش)، مج٢، ص ٥٣٨.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ١٤٤.

(٤) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص٣٩٥؛ سباهی زادة، المصدر السابق، ص١٣٨.

(٥) -معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٠٢.

(٦) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص ٣٩٥.

(٧) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٠٢. بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەدەسەڵاتە کوردیەکە بڕوانە: بەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

(٨) - بەجۆرێك بەرەی جەنگ لەنێوان سەلجوقیەکان وکوردەکان ژمارەیان زۆربووە، کوردەکان نزیکەی دەهەزار کەس بوونە بەڵام بەگشتی سوپاکەیان ژمارەی زۆر بووە. ابن الجوزي، المنتظم، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، مصطفى عبد القادر عطا، راجعه:نعيم زرزور، ( بيروت:١٩٩٢)، ج١٦، ص١٢٣، محمد صالح طيب، سلاجقة الروم في اسيا الصغرى(٤٧٠-٦٣٤هـ/١٠٧٧-١٢٣٧م)، اطروحة دكتورا، مقدمة الى كلية

## ٥٣- أَرْزَن/ ئەرزەن:

یاقوت بە شارێكی ناسراو و بەناوبانگی دادەنێت لـە نزیـك خـیلات، دەیخاتـە سـەر ناوچەكانی هەرێمی ئەرمینیا[١]، بەلاّم لەهەندێ سەرچـاوە خسـتویانەتە سـەر هـەرێمی جەزیرە، نێوانی لەگەڵ شاری نەسێبین حەفت (فەرسەخ/٤٢كم) دەبێت[٢].

ئەگەرچی ناوبراو ئاماژە بە جیاوازی ئەو ڕایانـە، سـەبارەت بـە شـوێنهەلكەوتنەكەی لەهەرێمەكان، دەكات[٣]، بەلاّم خۆی بە ئاوەدانترین ناوچەی هەرێمی ئەرمینیای داناوە، لە (ارزن روم) [٤]ش جیایكردۆتەوە.

## ٥٤-دَبِیل- دوِینْ/دوین[٥]:

یاقوتی ئەم شارە جارێك لەهەرێمی ئـەرمینیا دادەنـێ[٦] یـا خسـتۆتیە دەورویـەری هەرێمی ئاران لەسنووری كۆتایی ئازەربایجان و نزیك شاری تەفلیس[٧]، كەیـەك ناوچـە دەگرێتـەوە، بـەلاّم بـەكارهێنانی ئـەم دوودەسـتەواژەیە واتـا (دبیـل)و(دوین)، ڕەنگـە بۆجیاوازی زمان وچـۆنیەتی دەربڕینـی بگەڕێتـەوە، كەیەكـەمیان عـەرەبی و دوینـیش كوردیەكەیە، بەڵگە بۆئەمەش ڕاستەوخۆ كوردیەتی شارەكە لەباس كردنی دوین بـەدیار دەخات[٨].

---

الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩٩)، ص ص٤٣-٤٤. بڕوانە: نیشـتمان بەشـیرمحەمەد، كـورد و سەلجوقی، وەرگێرانی: ئیدریس عەبدوڵلاّ، (هەولێر: ٢٠٠٦)، ل ١١١.

(١) - معجم البلدان، مج١، ص١٥٠.

(٢) -ابن خرداذبە، المصدر السابق، ص ص٨٦-٨٧.

(٣) - معجم البلدن، مج١، ص١٥١.

(٤) - ئەرزەنی ڕۆم شارێكی ترە لەئەرمینیا كەگەورەترە لەئەرزەن یەكەم . معجم البلدان، مج١، ص١٥٠

(٥) - ئەم شارە پێشی وتراوە (دڤین) .احمد كسروی، المرجع السـابق، ج ٣، ص ٢٧٦. هاوكـات دەكەوێتـەنزیك شاری یەریڤان لەسەر ڕووباری كورد. النقشبندی، اذربیجان، ص١١٥، هامش رقم(٥).

(٦)- معجم البلدان، مج٢، ص ٤٣٩.هەروەهابڕوانە: ابن خرداذبة، ص ١٠٨،

(٧) - معجم البلدان، مج٢ ،ص٤٩١

(٨) — المصدر نفسە، مج٢ ،ص٤٩١.

## دووەم// دەوروبەرەکانی(اعمال):

بەڵام سەبارەت بە دەوروبەرەکانی هەریەك لەشارەکان، جا چ گوند بێت یان کورە یان ڕوستاق یان شار یان دێ وئاوایی کەوا دەیاغاتە سەر شارێك، یاخود لە هەرێمەکە یان نزیك لە شارێکی دیاریکراو ڕوونی کردۆتەوە. ئەوا لێرەدا بەگشتی پەیوەستی شارەکانمان خستۆتە خشتەیەك کە تایبەتە بە هەرێمە کوردنشینەکان[1].

*****

[1] – بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٢).

## تەوەری دووەم:

## سیماکانی ڕواڵەتە تەلارسازیەکانی ناوچەکوردنشینەکان

### یەکەم// قەڵاکان:

**لە ڕووی زمانەوانییەوە ئەم وشەیە بەمانای حەشارگەیەک دێت لە شێوەی چیا[1]. بەڵام ئەگەر لە ڕووی واتاییەوە سەیر بکرێت ئەوا بەمانای شارێکی قایم و پتەو دێت. هەنـدێ جار دەبێتە شار[2]. یاخود ناوچەیەکی بەرفراوانی رامیاری و ئابووری و بنکەی شارستانی و ئاوەدانی لێ هەڵدەکەوێت. هەروەکو شاری ئیربل(هەولێر)[3].**

### ا- قەڵاکانی کورەی زۆزان:

**وەکو (اتیل)[4] (القی-ئەلکی)[5] (باخۆخا)[6] (بازالحمراء)[7] (برخۆ)[8] (بشیر)[9] (جرذقیل)[10] (خوشب)[1] (اروخ)[2] و کینکور)[3] (نیوه)[4] (علوس)[5] (بوختیە) [6].**

---

(١) - ابن منظور، المصدر السابق، مج ٤، ص ٤٧٤.

(٢) - شاكر مصطفى، المدن في الاسلام، ( الكويت: ١٩٨٨) ج١، ص ٤٥٠.

(٣) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨.

(٤) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٥١.

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٢٤٦؛ ابن الاثير، الكامل، ج٩، ص٥٣.

(٦) - المصدر نفسه ، مج١، ص ٣١٦.

(٧) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢١.

(٨) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٣٧٥.

(٩) - المصدر نفسه، مج١، ص ٤٢٩.

(١٠) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٤.

## ٢- عَقر الحُمَيدية/عەقریحومەیدیه-ئاکری[7]:

قەڵایەکی پتەوە لە ناوچە چیاییەکانی موسل، کەوتۆتە لای ڕۆژهەڵاتی شاری موسل، بە (عقر حميدية) ناسراو بووە، لەبەر ئەوەی تیرەی (حەمیدیەکان)[8] تێیدا نیشتەجێ بوونە[9]. (غيضه) و (جوجر) بە ناوچەکانی پەیوەست بەم قەڵایە ژمێردراون[10].

## ٣- العِمَادِية[11]/ عیمادیه-ئامێدی:

یاقوت بە قەڵایەکی پتەو و بەهێز و گەورە، لە باکووری شاری موسل[12] وەسفی

---

(١) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٤٠٦

(٢) -ناوی ئەم قەڵایە بەناوزخیش هاتووە، کەبۆ هۆزی ئارۆخی کوردی، کە لەجەزیرەی ئیبن عومەر نیشتەجێبووینە، کە دەگەڕێتەوە قەڵایەکی سەخت ودژوارە. شەرەفنامە، ل١٧٣.

(٣) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٥٨.

(٤) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٣٣١؛ ابن الاثير، الكامل، ج٩، ص٥٣..

(٥) - المصدر نفسه، مج ٤، ص ١٤٧. هاوکات ئەم قەڵایە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی شاری ئامێدی. کرفان محمد احمد، المرجع السابق، ص٣٠٨.

(٦) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٥٨.

(٧) - سەبارەت بەناوی ئەم شوێنەی کەیاقوت بەقەڵا باسی کردووە، هەندێ بیروڕای جیاواز لەسەر بنەرەتی ناوەکەی هەیە، پێیان وایە سەرەتا (ئاگری) خەڵکی ناوچەکە ئاگریان پەرستووە.محمد جميل بندی روژبیانی، مدن الكردية القديمه، ص٢٦٨؛ درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٤٣.

(٨) - تیرەیەکی کوردی بوونە، بڕوانەئەم لێکۆلینەوەیە، ل ل١٣٧-١٣٨.

(٩) - معجم البلدان، مج٤، ص ١٣٦؛ ابو الفداء، الصدر السابق، ص٣٤.

(١٠) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٢٢١، ج ٢، ص ١٧٨.

(١١) - هاوکات ئێستا شارێکی کوردی کۆنە لە باکووری شاری موسل(هەرێمی کوردستانی عێراق، بە دووری (١٦٢ کم) لێیەوە، کە لەلای باشووری زنجیرە چیاکانی هەکاریە و لە باکووریش زنجیرە چیای مەتینە.درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٤١.

(١٢) - معجم البلدان، مج ٤، ص ١٤٩.

دەکات، لە سەرەتا وەکو قوڵغێیەکی کوردەکان، ناوەکەشی (ئاشەب) بووە[١]، بەڵام (عیمادەدین زەنگی)[٢] لە ساڵی (٥٣٧- ك- ١١٤٧ ز) دووبارە بونیاتی ناوەتەوە و گەورەی کردووە، ناوی بۆتە عیمادیە کە بۆ (عیمادەدین) دەگەڕێتەوە[٣]. گوندی جۆزە یەکێك لە ناوچەکانی سەر بەم قەڵایە بووە[٤].

## ٤- أرْدُمشْت/ ئەردومشت[5]:

یاقوت شوێنی ئەم قەلایە، لەنزیك جەزیرەی ئیبن عومەردا واتا ڕۆژهەڵاتی شاری موسل(موصل) لە سەر چیای جودی دیارکردووە[٦]، بەقەڵایەکی بەهێزیش وەسف دەکات، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە، سەبارەت بەناوەکەی ناوبراو، بەهەمان قەلای (کواشی)[٧]

---

[١] - المصدر نفسه و الصفحه؛ مج ١، ص ٥٤، ابن الاثیر، الكامل، ج ٩، ص ٥٣.ناوەکەشی کوردیەو لەئاشی ئاو یان ئاشاوه هاتووه واتا(طاحونة الماء) دێت، هاوکات گوندێکە لەناوچەی سەرسەنگ، شوێنەوارەکەی پێیدەڵێن (ئامێدیکا خەراب).فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص٥٩، هامش رمز(***)؛ زرار صديق توفيق، القبائل وزعامات القبلية الكوردية فى عصر الوسيط، (اربيل:٢٠٠٧)، ص١٨٠.

[٢] - عیمادەدین زەنگی: عیمادی کوڕی ئاقسنقر کوڕی عەبدوڵلایە، ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) لە دایك بووە، لە ماوەی نێوان (٥٢١- ٥٢٢ك/ ١١٢٧- ١١٢٨ز) بۆتە ئەتابەکی موسل.ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٢، ص ص ٣٢٧- ٣٤٩.

[٣] - معجم البلدان، مج ٤، ص ١٤٩؛ ابن الاثير، الباهر، ص ٦٤.لەگەل ئەمەش دا سەرچاوەکان وشەی (عمادیه) بۆسەر وشەی (امات)یان(اماتی) هتد دەگەڕێنەوە. بۆزیاتر زانیاری بروانە:كاوة فريق احمد، امارة بهدينان (١٧٠٠-١٨٤٠م)، (اربيل:٢٠٠)، ص٢٦؛عبدالله خورشيد قادر، العمائر الاسلامية فى العمادية ونواحيها حتى نهاية القرن الثانى عشر الهجرى/ الثامن عشر الميلادى، اطروحة دكتورا، مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠٨)، ص ص٧-١٠.

[٤] - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٨٤.

[٥] -ئەم قەڵایە ناوی لەلای ( المسعودی) بە (صواره) ولای شەرەفخانیش بە(ئەرماشت) هاتووە.مروج الذهب، ج٤، ص٤٧٣، شەرەفنامە، ل١٧٣.

[٦] - معجم البلدان، ، مج ١، ص ١٤٦.

[٧] -.کواشیئهاوکات بەکاشی ناسراوە، شوێنەوارێکی روخاوی هەیەو بەدووری (٢٠)کم لەلایباکووری ڕۆژهەلاتی شاری سمیل . کرفان محمداحمد، المرجع السابق، ص١٧١، هامش رقم (٢).

داناوەو، تەنانەت ناوەکۆنەکەی (کەواشی ئەردومشتە) بووە[1] واتا یەك قەڵا بوون.خاوەن وفەرمانڕەوای ئەو کاتەی، واتە سەدەی حەوتەمی کۆچی سێزدەی زاینیی، (بدر الدین لؤلؤ)[2] بووە[3].

## ٥- شُوْش/ شوش:

قەڵایەکی بەرزو گەورەیە لە نزیك قەڵای (عەقرە حەمیدی)و بەڵام لە عەقرەحەمیدیە گەورەترە، ئەمە تەنها تێبینیەکانی یاقوتە بۆ ئەم قەڵایە، لەگەڵ ئەوەی کە بەیەکێك لەناوچەکانی پەیوەست بە موسلی ژماردووە[4]. بەجۆرێك نێوانیان (دوانزە فەرسەخ/ ٧٢ کم) بووە[5]، بەبێ دیاریکردنی خاوەنی ئەم قەڵایە کە کوردەکان بوون، هەروەها چۆن کەوتۆتە بەر هێرشی ئەتابەکیەکان و داگیریان کردووە[6].

## ٦- الجُدَیْدَة/ جودەیدە[7]:

ئەگەر لە شێوەی وەسف کردنی یاقوت بکۆڵینەوە لە باسی ئەم قەڵایەدا، جارێك

---

(١) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٨٦. لێکۆڵەرەوان ئەمە روون دەکەنەوە، کە ئەم دوو قەڵایە یەك قەڵا نەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە سەریەك زنجیرە چیای سپیلك، یەکێکیان لەسەرەتاکەیەتی، ئەوەی تریان لە دواوەی ئەم چیایەیە بۆیە بەیەك قەڵا ژمێردراوە. دروش یوسف حسن، المرجع السابق، ص ٥٤

(٢) - ناوی بەدرەدین لۆلۆی کوڕی عەبدوڵلایە، لە ساڵی (٦٥٨ك/ ١٢٥٩ز) مردووە. ابو شامة المقدسي، تراجم رجال القرنين السادس والسابع المعروف (بالذيل على الروضتين)، تحقيق: عزت العطار الحسيني، (بيروت: ١٩٧٤)، ص ٢٠٨.بۆزیاتر زانیاری بروانەبەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

(٣) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٦.

(٤)- المصدر نفسه، مج ٣، ص ٣٧٢. هاوکات دەکەوێتە نزیك ئاکرێ. فائزة محمد عزت، المرجع، السابق، ص٥٩، هامش، رمز(*)

(٥)- ابن الاثير، الكامل، ج ١٠، ص ٣٧٦.

(٦) - المصدر نفسة، ج٩، ص٥٢؛ج١٠، ص٢٧٩، ص ٣١٥، ص ٣٢٢.

(٧) -سەبارەت بەم ناوە رەنگە سەرەتا وشەیەکی تر بوویێت، بەچەشنێك دوای ئەوەی نوێیان کردۆتەوە، کردوویانە بەم ناوە.هەر وەکو نۆکرد ناوی (حديثة الموصل) بووە، دوای ئەوەی نۆژەنیان کردۆتەوە بۆتەحدیسە، واتە تەعریب کراوە.. معجم البلدان، مج٢، ص٢٣٠.

شوێنه‌كه‌ی له كوره‌ی (بين النهرين)[١] له نێوان موسل و نه‌سێبین داناوه، یا به‌شاری (حصن كيفا) ی لكاندووه[٢]، به‌لاّم له‌به‌ر ئه‌وه‌ی (ابن الاثير)یش، به یه‌كێك له ناوچه‌كانی موسلی ژماردووه[٣]، ده‌بێت له كوره‌ی به‌ینه نه‌هره‌ین بێت، جگه له‌وه‌ش هه‌میشه خاوه‌نی ئه‌م قه‌لاّیه ده‌سه‌لاّتدارانی موسل بوونه[٤].

## ٧- جَلَصَوْرَى[٥] / جه‌له‌سورا- گله‌سۆر:

ئه‌م قه‌لاّیه‌ش سه‌ر به‌ناوچه‌كانی موسل بووه، كه‌وتۆته ناوچه چیاییه‌كانی هه‌كارییه له باكووری موسل[٦]، به‌لاّم هاوكات شوێنه‌كه‌ی له‌ناوچه‌كانی به‌رواری باڵایه، دووری له‌ناحیه‌ی كانی ماسان (دوو فه‌رسه‌خ و نیو/١٥ كم) زیاتر ده‌بێت[٧].

## ٨- عَلُوس/ عه‌لوس:

قه‌لاّیه‌كی شاری ئه‌رزنه و، به یه‌كێك له قه‌لاّ كوردییه‌كان ده‌ژمێردرێت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی یاقوت ده‌سه‌ڵاتی هۆزێكی كوردی لێ به‌دیارخستووه[٨].

---

(١) - بين النهرين: كوره‌یه‌كی گه‌وره‌یه له بقعائی موسل، هه‌ندێ جار سه‌ر به‌شاری موسل بووه، هه‌ندێ جاریش سه‌ر به‌شاری نه‌سێبین بووه. معجم البلدان، مج ١، ص ٥٣٥.

(٢) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ١١٥.

(٣) - ابن الاثير، الكامل، ج ١٠، ص ٤٠٧.

(٤) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١١٥. گوندێك بووه له ناحیه‌كانی به‌رواری باڵا له‌نزیك ئامێدی به‌ناوی (جدیدكی)، به‌جۆرێك شوێنێكی پته‌وی هه‌یه و لێكۆله‌رانیش ئاماژه‌یه‌وه ده‌كه‌ن، كه‌ره‌نگه‌شوێنی ئه‌م قه‌ڵایه بێت.درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٥٧.

(٥) — له بنه‌ره‌تدا له وشه‌ی كوردی(گله‌سۆر ) هاتووه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م قه‌ڵایه له‌سه‌ر چیایه‌ك هه‌ڵكه‌وتووه خاكه‌كه‌ی له گڵی سۆر بووه‌و به‌شێوه‌ك خاكه‌كه سوره‌كه‌ی ره‌نگی داوه‌ته‌وه.، له‌زمانی عه‌ره‌بیش پیتی (گ) نیه‌و گۆڕیویانه‌بۆ(ج). درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص٥٧.

(٦) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٥٤.

(٧) - درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص ٥٧.

(٨) - معجم البلدان، مج ٤، ص ١٤٧.

## ٩- فَنَك/ فەنەك:

بەیەکێك لەقەڵا بەناوبانگەکانی مێژووی کوردی دادەنرێت[١]، یاقوتیش ئەم ڕاستییە دەسەلمێنی و، بەچەشنێك بۆهۆزی کوردی بەشنەوەیهی دەگەڕێنێتەوە وناوچەکەشی لەنزیك جەزیرەی ئیبن عومەر بووە و نێوانیان (دوو فەرسەخ/١٢ کم) بووە[٢]. بە شوێنێکی قایی خۆڕاگر وەسف کراوە[٣]، بەجۆرێك لەسەر چیایەکەو قولەیەکی هەیە، لەتاشەبەردێك دروست کراوەو بەرگری لەقەڵاکە دەکات[٤]. بۆیە ناوبراویش ئاماژە بەوەدەکات کوردەکان بۆ ماوەی سێ سەد ساڵ خاوەندارییەتی ئەم قەڵایەیان کردووە، بەلام کات وساتی حوکمرانیەکەیان دیار ناکات[٥]. وە ئەم ماوەیە زۆرە ڕەنگە بۆیتەوی شوێنەکەی بگەڕێتەوەو هیچ دژکارێك دەسەڵاتی نەگەیشتووەتێ.

## ١٠- هَتَاخ/ هەتاخ:

یاقوت تەنیا شوێنی ئەم قەڵایە قایە لە نزیك شاری مەیافارقین دیاردەکات[٦]، بەبێ ئەوەی مێژووی ڕامیاری گرینگی بەرچاو بخات، کەچۆن بە یەکێك لە قەڵاکانی دەسەڵاتی کوردی لە سەدەی چوارەمی کۆچی دەیەمی زاینیدا لە دیاربەکر دەژمێردرێت[٧].

---

(١) - شەرفخانی بەدلیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل، ٢٠٩.

(٢) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٢٧٨؛ ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص٤٣٤.

(٣) - ابن الاثیر، الباهر، ص ٧٣؛ الکامل، ج٨، ص١٢٣.

(٤) - القزوینی، اثار بلاد، ص٤٣٢.

(٥) - معجم البلدان، مج ٤، ص٢٧٨؛ ابن الاثیر، الباهر، ص ٧٣.

(٦) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٩٢؛ ابو الفداء، المصدر السابق، ص ٢٨١.

(٧) - وە کو قەڵای میرنشی مەروانیەکان دادەنرێت و بەلام ئەتابەکیەکانی ماردین دەستیان بەسەرداگرتووە ابن الاثیر، الکامل، ج ٧، ص ٤٣٧، ج٩، ص ٩٧.

## ١١- شاتان:

هیچ باسێکی مێژووی بۆوەسفی ئەم قەڵایە لەکتێبەکەی یاقوت ئاماژەی بۆنـەکراوە، تەنیا بە قەلآیەکی دیاریـەکری دانـراوە[١]. کەچـی لەسەرچـاوەکانی هاوکـاتی نوسـینی کتێبەکەی ناوبراو، بە شوێنێکی پتەوی تیرەی کوردی (جوبیـە)[٢] دادەنرێـت و، بـەلاّم دوای ساڵی(٥٦٦ك/١١٦٠ز) کەوتوتە ژێر دەسەڵاتی ئەمیرەکانی حیصن کەیفا[٣].

## ١٢- شِمشَكازاد/شیمشەکازاد:

یاقوت بەقەڵایەکی گەورەی لەشێوەی شارێکی خاوەن ڕوستاق وەسفی دەکات، لە نێوان شاری (ملگیە)[٤] و ئامێدبووە[٥].

## ١٣- صَبْحَة/ سەبحە:

قەلآیەکی دیاریەکر ەو لە نێوان ئامەد و مەیافارقین بووە[٦].

## ١٤- قَيْمُر / قەیمور[٧]:

تەنها لەوتێبینیە کورتەی کەیاقوت بۆئەم قەڵایەی کردووە، قەڵایەکی کوردیە، لەبەر ئەوەی ڕەچەڵەکی هەندێ لەمیرو سەرکردە کوردیەکانی بۆ دەگەرێنێتەوە، جگـە لـەوەی شوێنیشی دەکەوێتە نێوان موسل(موسل) وخیلات(خلاط)[٨].

---

(١) - معجم البلدان، مج٣، ص ٣٠٤.

(٢) - هۆزێکی کوردییە، بڕوانەئەم لێکۆڵینەوەیە، ل١٤١.

(٣) - ابن الاثير، الكامل، ج٩، ص ٢٩٠.

(٤) - ملطیە: شارێك بوو لە ولآتی رۆم، هاوسنوورە لەگەڵ ولآتی شام .معجم البلدان، مج ٥، ص ١٩٢.

(٥) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٣٦٣.

(٦)- المصدر نفسه، مج٣، ص ٣٩١.

(٧) - ناوی هۆزێکی کوردیە . بڕوانەبەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل١٤٠.

(٨) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٢٤.

## ١٥- الصَوْر/ سەور:

یاقوت کاتێ چاوی پێدەکەوێت، بە قەلاًیەکی قایم و سەرسوڕهێنەر وەسفی کـردووە، کەوتۆتە سەر لوتکە چیایەك لە نزیك شاری ماردین، ئاوەدان وخاوەن بازار بووە[١] . وەلە مێـژووی سـالی(٥٢٨ك/ ١١٣٣ ز) وەکـو قـەلاّ کوردیـەکانی تـر توشـی هێرشـکاری (ئەتابەك)[٢]یەکان هاتووە[٣].

## ١٦- خُفْتِیان[٤]/ خوفتیان:

دوو قەلاًی بەرز و گەورەی سەر بە شاری (اربل)هەولێر بوون، یاقوت یەکێکیان لەسەر ڕێگای مەراغە کەناوی ناوە (خفتیان زرزاری)[٥] لەسەر چیا یە و لە ژێرەوەیدا رووباری پێدا تێپەڕیوە[٦]. ئەوەی تریان (خفتیان سرخاب)[٧] لەسەر ڕێگای شـەهرەزوورو هـەولێر بووە[٨].

---

[١] معجم البلدان، مج ٣، ص ٤٣٤.

[٢] - ئەتابەك: نازناوێکی تورکییە (اتا) واتا باوك (بك) واتا میر، ماناکەی بەگشتی باوکە میر. ابن خلکان، المصدر السابق، مج١، ص ٣٦٥.

[٣] - ابن الاثیر، الکامل، ج٩، ص٥١-٥٢.

[٤] - بە( خُفتیذکان) ش هاتووە .معجم البلدان، ، مج ٢، ص ٣٨٠.

[٥] - لێکۆلەرەوان بۆچوونیان وایە کە ئەم قەلاًیە هاوکات ناوچەی هاودیانانی ئێستایە. النقشبندي. الدینور و شهرزور، ص ص ٣٨- ٤٠؛فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص٣٥، هامش رقم(٦).

[٦] - معجم البلدان، مج ٢، ص ص٣٧٩-٣٨٠..

[٧] - سرخاب کوڕی بەدر: یەکێکە لە میرەکـانی میرنشـینی عـەنازی (٣٨١-٤٠١ك/ ٩٩١- ١٠١٠ز) .ابـن الاثیر، الکامل، ج٨، ص ٤٧٦. بۆ زیاتر زانیاری بروانەئەم لێکۆلێنەوەیە، ل١٦٤ .

[٨] - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٧٩؛ ابن الاثیر، الکامل، ج٨، ص٤٧٦.

## ١٨- كَرْخِيني/ كەرخينی:

قەڵايەكی بەرز و پتەو ی نێوان داقوقا و هەولێر بووە[١]. هاوكات قەڵای كـەركووك شوێنەكەيەتی[٢].

## ١٩- تَل أَعْفَر/ تەلەعفەر:

ناوی قەڵايەكی نێوان شاری سينجار و موسل بووە، ڕووبارێكی سازگاری پێدا تێپەڕ دەڕۆيشت[٣].

## ٢٠- مايَدَشْت/ماييەدەشت:

هەم قەڵا و هەم ناوچەيەك بووە، لە خانيقينی عێراقدا[٤].

## ٢١- فَرْدَجان/ فەردەجان:

قەڵايەكی بەناوبانگی شاری هەمەدانەو ناويشی بە (براهان)[٥]ش هاتووە.

## ٢٢- أَزن/ ئەزن[٦] و سَنْدة/سەندە[٧]:

دوو قەڵان لە چياكانی هەمەدان.

---

[١]- معجم البلدان، مج٤، ص ٤٥٠.

[٢] - حكيم احمدمام بكر، المرجع السابق، ص٢٠٨.

[٣] - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٩. بـەجۆرێك كەوتۆتـە ڕۆژئـاوای شـاری موسـل . سباهی زادة، المصدر السابق، ص٢٠٥ .

[٤] - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٥٠. هاوكاتيش هەر بەم ناوە ناسراوە.

[٥] - المصدر نفسه، مج ١، ص ٣٦٨.

[٦] - المصدر نفسه، مج١، ص ١٦٩.

[٧] - المصدر نفسه، مج٣، ص ٢٦٨.

## ٢٣- سَرْمَاج/ سەرماج :

یاقوت ئەم قەڵایە پتەو وخۆڕاگرە، کەکەوتۆتە نێوان شاری هەمەدان و خۆزستان لە هەرێمی چیاکان، بەقەڵایەکی کوردی دادەنێت، چونکە بۆمیری کوردی میرنشینی حەسنەوەیهی (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٢-١٠١٤ ز) دەگەڕێنێتەوە[1].

## ٢٤- دزبز:

ناوی قەڵایەکە لە سابورخواست، هەر لە ڕوانگەی یاقوتەوە دەتوانین بەقەڵایەکی کوردی بژمێرین چونکە دەسەڵاتی کوردی لێبەدیار خستووە[2].

## ٢٥- شِرْماح/ شیرماح و غانْماباذ/ غانماباد:

دوو قەڵان لە چیادا، یەکێکیان دەڕوانێتە سەر گوندی (با أیوب)[3] لە نزیك نەهاوەند، کوردەکان دروستیان کردووە[4]، غانم ئابادیش کەوتۆتە لایەکی نەهاوەند[5]. ناوەکەشی بۆ میری کوردی (غانم بن احمد)دەسەلاتداری عەیشانیەکان(٣٠٠-٣٥٠ك/٩١٢-٩٦١ز) دەگەڕێتەوە، دەسەلاتی لە هەرێمی چیاکان ودەوروبەری ئازەربایجان هەبووە، ئەم قەلایەی دروست کردووە.[6]

---

[1] - معجم البلدان، مج٣، ص ٢١٥. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: النقشبندي، الدینور و شهرزور، ص ص٢٤-٢٥.

[2] - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٥٤.

[3] - با ئەیوب: گوندێکی گەورەیە لە نێوان قەرمیسین(کرمانشا) و هەمەدان. معجم البلدان، مج١، ص ٣٠٢.

[4] - معجم البلدان، مج٣، ص ٣٣٧.

[5] - المصدر نفسه، مج٤، ص ١٨٤.

[6] - ابن الاثیر، الکامل، ج٧، ص٣٧١.

## ٢٦- شْتَر / شتەر:

کەوتۆتە هەرێمی ئاران و، لە نێوان بەرزەعە و گەنجە دابووە[١].

## ٢٧- أَسْطان/ ئەستان:

قەلایەکی بەناوبانگی شاری خیلاتی ئەرمینیا بووە[٢].

## ٢٨- وان:

یاقوت بەقەڵایەکی پتەوی نێوان شاری خیلات وتەفلیس داناوە[٣]، بەلام سەدەیەك دوای یاقوت بەناوچەیەکی بچوکی خاوەن قەڵا وەسف کراوە[٤] . هاوکات بەسەنتەرێکی باکووری کوردستانی گەورە دادەنرێ[٥].

## ٢٩- سَرْمارا/ سەرمارا:

ئەم قەلایەش کەوتۆتە نێوان شاری تەفلیس و خیلات[٦] .

## ٣٠- بالو- قارغوان:

دوو قەلان لە زەوی ئەرمینیا لە نێوان خیلات و ئەرزەنی ڕۆم دا بوون[٧].

---

(١) - معجم البلدان، مج٣، ص ٣٢٥.
(٢) - معجم البلدان ، مج١، ص ١٧٧.
(٣) - المصدر نفسه، ، مج٥، ص٣٥٥.
(٤) - ابوالفداء، المصدر السابق، ص٣٩٠.
(٥) -عەبدوللا غەفور، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٥.
(٦) - معجم البلدان، مج٣، ص ٢١٥.
(٧) - معجم البلدان، ، مج ١، ص ٣٣٠، مج ٤، ص ٢٩٥.

## ٣١- قەڵای هەولێر:

یاقوت دوا ی ئەوەی سەردانی ئەم شارەی كردووە، وەسفی قەلاكەی دەكات، كەگەورەو فراوان و بازاری لێبووە، خانووی دانیشتوانی بینیوەو پاشان دەیچوێنێت بەقەلای حەلەب.بەلام ئاماژە بەوەدەكات كەگەورەتر بووە.[1]

جگە لەم قەلاًیانەی كە لەسەرەوە ئاماژەمان پێ كرد، لەباسكردنی هەندێ شاردا یاقوت بەخاوەن قەلاً وەسفیان دەكات[2]، وەك لە شاری ئورمیە لەسەر چیای (كەبوزان) قەلاًیەكی هەبووە، پارێزگاری لە ویلایەتی ئازەربایجان كردووە[3].

## دووەم// قوڵغەكان(رەند):

شوێنێكی قایە بۆ بەرگریكردن و پاراستنی ئەو شوێنانەی كە نزیك بن لە زەوی و دەسەڵاتی دوژمن[4]، یا بۆ بەرگری كردن لە هێرشی دەرەكی[5].

وەكو دەبینین هەندێ جار خەلكانی هەندێ ناوچە ترساون لە هێرش و دژایەتی كردنیان، هەستاون بە قوڵغ دروست كردن[6]. كەواتە ئەم بونیاتنراوە زیاتر هۆكاری سەربازی لەخۆ دەگرێت، ئەم مەبەستەش بە ئاشكرا لەكتێبەكەی یاقوت، روون دەبێتەوە بەلام تەنیا وەكو سەرژمێریەك دەكەوێتە بەرچاو، چونكە لایەنێكی زۆركەم لەمێژووی ئەم قولغانە بەدیار دەخات، بە جۆرێك لە شاری مەراغەدا سەربازەكانی لێ كۆدەكرایەوە[7]. كەچی لە شاری هەمەدان بۆپاراستنی موڵك و ماڵی دەوڵەت بوو[8]. هەندێ جاریش

---

(١) - معجم البلدان مج١، ص١٣٨.
(٢) - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٥٠.
(٣) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٣٥١.
(٤) - شاكر مصطفى، المدن فی الاسلام، ج١، ص ٤٥٠.
(٥) - معجم البلدان، مج٢، ص ٢٦٤.
(٦) - المصدر نفسه و الصفحه.
(٧) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٩٣.
(٨) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٤١١.

شاری لێ كەوتۆتەوە، وەكو شاری حیصن كەیفا و (سیسر)[١]، كە سەرەتا تەنیا قوڵغیەك بوون[٢]، یا هەندێ جاركەمێك فراوان بووە خۆی لە قەڵا بینیوەتەوە[٣]، بەڵام جیاوازی نێوان قەڵا و قوڵغ ئەوەبووە، كە قوڵغ بۆ پێویستییەكانی بەرگری كردن دروستكراوە، بەڵام قەڵا زۆر هۆكار و مەبەستی تری لە خۆگرتووە[٤].

## ١- سەرحە:

قوڵغیەكی نێوان شارەكانی نەسێبین و دونیسەر و دارابووە، رۆمەكان دروستیان كردووە، تاكو سەردەمی یاقوت هەر ماوەتەوە، بەڵام ئەوكات شوێنی جوتیارەكان بووە[٥].

## ٢- كەركەر:

لە نزیك مەلتییە(ملگیە) نێوان ئامەد دروستكراوە، لە قوڵغی (الران)[٦] نزیكیش بووە[٧]. لەسالی (٥١٦ك/ ١١٢٢ز) كەوتۆتە ژێر دەستی خاچ دروشمان[٨].

## ٣- هەرور[٩]:

یاقوت بەقوڵغیەكی خۆراگر وەسفی دەكات، لە باكووری شاری موسل سەر بە ناوچەی هەكاری دەبێت، نێوانی لەگەڵ ئامەدیش (فەرسەخێك/٦ كم) بووە[١٠].

---

(١) - سیسر: شارێكە لە نێوان هەمەدان و ئازەربایجان. معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٩٧.

(٢) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٢٦٥.

(٣) - هەروەكو (حصن طالب) كە قەڵایەكی بەناوبانگ بووە، لە نزیك حیصن كەیفا. معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٦٥.

(٤) - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: فرهاد حاجي عبوش، المدینة الكوردیة في القرن (٤-٧ هـ/١٠-١٣م) (اربیل: ٢٠٠٤)، ص٤٧.

(٥) - معجم البلدان، مج٣، ص ٢٠٧.

(٦) - الران، قوڵغیەك بووە لە ولاتی رۆم لە نزیك شاری مەلتییە. معجم البلدان، مج٣، ص١٩.

(٧)- المصدر نفسه، مج ٥، ص ٤٠٣.

(٨) -ابن الاثیر، الكامل، ج٨، ص٦٨٧.

(٩) - هاوكات دەكەوێتە باكووری شاری دهۆك.

(١٠) - معجم البلدان، مج٥، ص ٤٠٣.

**پتەوی ئەم قولغە لەکاتی هێرشی عیمادەدین زەنگی لەساڵی(٥٢٨ك/ ١١٣٣ز ) بۆسەر قەڵای کاشی وڵاتی هەکاری، بەدیار دەکەوێت[١]. وە بەقەڵایەکی هۆزی کوردی (هەکاری)[٢] وەسف کراوە[٣].**

**هەروەها ناوبراو ئاماژە بە قوڵغیەکی تر دەکات لەناوچە چیاییەکانی سەر بەشاری ئیربلیش(هەولێر) بە ناوی هەرور هەبووە[٤].**

## ٤- خێرس:

**قوڵغیەك بووە لەسەر دەریا لە هەرێمی ئەرمینیا، بەستراوەتەوە بە شاری شەروان، لەکاتێکدا مەروانی کوڕی محەمەد(١٢٧-١٣٢ك) دوا خەلیفەی ئەمەویەکان بە پێگەی خۆی دادەنێت[٥].**

## ٥- حصن زیاد:

**لە زەوی ئەرمینیا بووە، لە ڕۆژگاری یاقوت ناوبراوە بە (خرت برت)، کەوتۆتە نێوان ئامێد و مەلتییە[٦].**

## ٦- حصن الاکراد[٧] :

**قـــوڵغیەکی قایـــم بووە، لـــەسەر چیـــادا بـــــووە لـــەشـاری (حمص)[٨]،**

---

(١) -ابن الاثیر، الکامل، ج٩، ص ص٥٣-٥٤.

(٢) - بڕوانە: بەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل١٣٩.

(٣) - ابن فضل اللة العمری، المصدر السابق، مخطوطة مصورة، ج٣، ص١٣٤.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤٠٣.

(٥) - المصدر نفسە، مج ٢، ص ٣٥٨.

(٦) - المصدر نفسە، مج٢، ص ٢٦٤.

(٧) - هاوکات دەکەوێتە نێوان شاری حمص و صافیتا، نێوانی لەگەڵ حمص (دە فەرسەخ/ ٦٠کم) بووە. اکرم ساطح، القلاع و الحصون فی سوریە، (دمشق: ١٩٧٥)، ص ٨٣.

(٨) - حمص: شارێکە لە نێوان دیمەشق و حەلەب.معجم البلدان، مج٢، ص ٣٠٢.

ژماره‌یه‌ك گوندی له‌ خۆگرتبوو[١]، به‌ قولغێكی كورده‌كان داده‌نرێت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی تێدا نیشته‌جێ بوونه[٢].

## سێیه‌م//: شوره‌كان:

هێڵی درێژی به‌رگرییه‌ به‌ چوار ده‌وری شار یا هه‌ر جێگایه‌كی كه‌ مه‌به‌ست بێت، بۆ خۆپارساتن له‌ هه‌موو بارودۆخێك[٣]. جا چ له‌ڕووی ڕامیاری یا سه‌ربازی وئاسایشی بێت.

یاقوت له‌ باسكردنی شاره‌كاندا ئه‌م لایه‌نه‌ بیناسازییه‌ی خستۆته‌ ڕوو، هه‌روه‌ها نیشانی داوه‌ كه‌ی دروستكراوه‌، به‌چی بنیات نراوه‌ و كێ پێی هه‌لساوه‌، كه‌ ڕه‌نگه‌ بۆ سه‌رده‌می زۆر زووتر له‌ یاقوت بگه‌ڕێته‌وه‌ وه‌كو له‌ باسكردنی شاری ئامه‌د دا ئاماژه‌ به‌وه‌ ده‌كات، كه‌ شوره‌ هه‌ بووه‌ و به‌ ڕووباریش ده‌وره‌ دراوه‌[٤]. ناسری خوسره‌و له‌ ساڵی (٤٣٨ك/١٠٤٦ ز) سه‌ردانی شاره‌كه‌ی كردووه‌، وه‌سفی شوره‌كه‌ی ده‌كات كه‌ به‌ به‌ردی ڕه‌ش بونیات نراوه‌[٥] و ته‌نانه‌ت نه‌به‌ردو نه‌ئاگر كاری لێنه‌كردووه‌[٦]. شوره‌ی ئێربلیش له‌سه‌رده‌می (موزه‌فه‌ردین كوكبری)[٧] بونیات نراوه‌. به‌ڵام هه‌رچوار لای شاره‌كه‌ی ده‌وره‌

---

[١] - الظاهري، زبدة كشف الممالك و بيان الطرق المسالك، قد اعتني بتصحيحه: يوسف راويس: (باريس: ١٨٩٦)، ص ٥٨.

[٢] - معجم البلدان، مج٢، ص ٢٦٤.

[٣] - شاكر مصطفى، المدن في الاسلام، ج١، ص ٤٤٩.

[٤] - معجم البلدان، مج١، ص ٥٦.

[٥] - سفرنامه، ص ٨.

[٦] - سباهي زادة، المصدر السابق، ص١٢٤.

[٧] -موزه‌فه‌ردین كوكبری، ناوی ئه‌بو سه‌عیدی كوكبری كوڕی ئه‌بی حه‌سه‌نی عه‌لی به‌كته‌كینه‌، له‌ ساڵی (٥٤٧ك/ ١١٥٢ز) له‌ دایك بووه‌، حوكمی شاری ئێربلی له‌ ساڵی (٥٨٦ك/ ١١٩٠ز) تاكو (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) كۆچی دوایی كردووه‌. ابن خلكان، المصدر السابق، مج٤، ص ص ١١٣- ١٢١؛ ابو شامة المقدسي، المصدر السابق، ص ١٦١.

نەداوە، بەڵکو لە نیوەی کۆتایی هاتووە[١]. شورەی بەرقەعید سێ دەرگای هەبووە[٢]، لە شاری دەربەندیش لە شێوەی لووتی

مرۆڤ لەبەردا داتاشراو بووە[٣]. بەرزی لە شاری شەهرەزوور بەدیار خستووە[٤].

هەروەها شورەی شاری موسل بۆ سەردەمی مەروانی کوڕی محەمەد[٥] و شاری مەیافارقینیش بۆ سەردەمی حەمدانییەکان دەگەڕێتەوە[٦]. بەڵام لە شاری هەمەدان بۆ سەدەکانی پێش زایین، کە ئەوکاتیش وەکیلایەتی و بەرگری لەشار کردووە[٧].

## چوارەم// دەزگا دامەزراوەکانی تر:

## أ- مزگەوت و شوێنە ئاینیەکانی تر

### ١- مزگەوت:

یەکێك لەو دروستکراوانەی کە باروودۆخی ئاینی وکۆمەڵایەتی، لەسەرووی هەموویانەوە باروودۆخی بیناسازی شوێنەکان پیشان دەدات، بوونی مزگەوتە لەناوچەکان، لەگەڵ ئەمەشدا تۆمارکردن وزانیاری لەسەر مزگەوتەکان وشوێنەواریان بەڵگەیەکە لەسەر شارستانی نەتەوەو ئاوەدانی جێگانشینەکان.

ئەوەی یاقوت دەربارەی ئەم دامەزراوەی ئاینیە ناوچە کوردنشینەکان تۆماری کردووە، تەنها ڕووکاری دەرەکی یاخود هەبوونی مزگەوت لەناوچە کوردنشینەکان بووە،

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨.

(٢) - المصدر نفسه، ، مج ١، ص ٣٨٧.

(٣) – المصدر نفسه، مج١، ص ٣٠٣.

(٤) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٣٧٥.

(٥) - معجم البلدان ، مج٥، ص ٢٢٣ .بەشێوەیەك لەلایەن سەرچاوەکانی تر وەسف کراوە، کەگەورەتر بووە لە شورەی شاری دیمەشق. سباهی زادە، المصدر السابق، ص٦١١.

(٦) - معجم البلدان، مج٥، ص ٢٣٧.

(٧) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٤١١.

بە جۆرێك لەکوێ هەبووەو، کەی دروستکراوە، کێ پێیهەلساوە. هەروەکو لە ناوچەکانی ئێربل و بەعشیقا ویەرزەعەو بەرتولی و، بروجیردو، جودی و، خوسەر و شەهرەزوور موسڵ و [1]، لەگەل ناوچەی (خلبتا)[2] و (فاگماباژ)[3].

باسەکانیشی بۆ ئەم بنیاتنراوە لەوەوە بەرجەستەدەبێت، لەئێربل سەردەمی موزەفەرەدین کوکبری دروستکراوە[4]. یا وەسفی مزگەوتەکان دەکات بەوەی کە گەورەبوون[5]. یاخود منارەیان هەبووە[6]. مزگەوتی شاری بەردەعەش هاوشێوەی مزگەوتی ولآتی شام بووە[7]، تەنانەت لەم شوێنانەش مزگەوت هەبوون کەخەڵکەکەی فەلە بوون[8].

وەدروستکردنی مزگەوت لەناوچەکوردنشینەکان و گەرانەوەی بۆمێژوویەکی دوور، هۆیەکەی بۆ باوەری کورد بە خوداو لەگەڵ ئەو دەرئەنجام وبارودۆخە کۆمەڵایەتی و جوگرافیەو سیاسیەی، کە تێدا دەژیان، دەگەرێتەوە .

---

(١) — معجم البلدان، مج١، ص١٣٨، ص٣٢٤، ص٣٨٠، ص٤٠، مج٢، ص١٧٩، ص٤٠٦، مج٣، ص٣٧٥، مج٥، ص٢٢٣

(٢) -خلبتا:گوندێکی گەورەیە لەرۆژهەلآتی موسل.معجم البلدان، مج٢، ص٣٨١.

(٣) -لەگوندەکانی هەمەدانە.معجم البلدان، مج٤، ص٢٣٢.

(٤) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨.

(٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤

(٦) - المصدر نفسه، مج٢، ص ٤٠٦.

(٧) — المصدر نفسه، مج١، ص ٣٨٠.

(٨) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤، ص ٣٨٥.

## ٢- خانەقا(ربط-خانقاهات)[1]:

**ئەو نێوەندە واتا خانەقا بەگشتی وەکو بونیادێك بۆ فێربوونی زانست و شوێنی سۆفیەکان سەیردەکرێت، بەتایبەتی بۆزانیاری لەسەر شەرعی و ئاینی، ئەم دەزگا ئاینیانە لەکۆنەوە لەشارە کوردیەکان هەبوون، هەروەکو چۆن یاقوت لەشارەکانی ئەرجیش وماردین وهەمەدان بەدیاریان دەخات [2]، وە لە دیدی ناویراویشەوە وەکو خوێندنگەیەکی ئاینی سەیردەکرێن، لەبەر ئەوەی چەند مامۆستایەك لەبواری سۆفیگەری دەرسیان تێدا وتوەتەوە.**

**٣- جگە لەوپێگە ئاینیانەی کەتایبەتن بە ئاینی ئیسلام، چەند بونیاتنراوێکی تری ئاینەکانی تر، کە ڕوالەتێکی دیکەی تەلارسازیە، لەناوچە کوردنشینەکان هەبووە، ئەویش بوونی دێرەکانە، کەزیاتر لە پەنجا لاپەری کتێبەکەی بۆ سەرژمێری کردنی دێرەکان تەرخانکردووە، کەپەیوەستە بەئاینی مەسیحی، وەژمارەیەکی زۆریشیان لەناوچەکوردنشینەکانن[3]. هەروەها بوونی ئاتەشگای ئاینی زەردەشتی لە ناوچەی (جزنق)[4] و (شیز)[5] بەدیار خستووە.**

---

[1] -ئەم دوو دامەزراوە، لەلایەن سەرچاوەکان بەیەك شێوەوەسف کراون، بەشوێنی سۆفی وپیاوچاکان دانراون.السمعانی ا، المصدر السابق، مج٢، ص٣١٣؛ المقريزي، المواعظ و الاعتبار بالذكر خطط و الاثار، تحقيق: خليل منصور، (بيروت: ١٩٩٨)، ج٤، ص٣٠٢.بەلام جیاوازی لەناوەکانیان بۆ چۆنێتی بەکار هێنانە، بەجۆرێك عێراقییێك (ربط)ی بەکارهێناوە، ولاتی فارس و شام ومیسر خانەقایان بەکارهێناوە، جگە لەوەی لە سالی پەیدابوونیان جیاوازە. فرهاد حاجی عبوش، المرجع السابق، ص١٠٤، هامش رقم(١).

[2] -معجم البلدان، مج١، ص١٤٤، مج٥، ص٣٩، ص٢٢٢.

[3] -بروانە: پاشکۆی ژمارە(١).

[4] -جزنق: شارەدێیەکی ئاوەدانە لە ئازەربایجان، لە نزیك شاری مەراغە، معجم البلدان مج٢، ص ١٣٤. هاوکاتیش پەرستگای زەردەشتی لە گانزاك( تەکابی ئێستا) لەڕۆژهەلاتی کوردستان لەسەر سنوری باکووری بیجار شوێنەواریان ماون. مهیرداد ئیزەدی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧.

[5] - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٨٣.

## ب-//كاروان سەرا وگەرماوەكان:

### ١-كاروانسەراكان:

ئەم دامەزراوە بە بونیاتنراوێكی دێرینی وڵاتانی رۆژهەڵات دەژمێردرێت، كە (هیرودۆت) باسی لێوەكردووە، بە جۆرێك لە هەندێ شوێن بۆ خۆ داڵدەدان و خۆپاراستن لە راورووتی دا پاسگا و قولغیان بۆ شارێگاكان دروست كردووە، لە هەمان كاتدا وەكو بنكەیەكی پاراستن و خزمەتگوزاری پێویست سوودیان لێوەردەگیرێت. تەنانەت وەكو جێگەی حەوانەوە ی گەشتیار و موسافیران بووە[1]. بەلاّم یاقوت تەنیا بە ماڵی بازرگانانی دادەنێت[2]. لەگەڵ ئەمەشدا لەكاروان سەراكانی گوندی (مونیسە)[3] ئاماژەی بەوە كردووە كە تەنیا بۆ بازرگانی تەرخان كراوە. وا دیارە مەبەستی تریشی خستۆتە پاڵ، بەلاّم ئەوەی تێبینیمان كردووە، تەنیا باسی ئەو كاروان سەرایانە دەكات، كە كەوتوونەتە سەر رێگای بازرگانەكان. تەنانەت هەندێ جاریش رێگاكانی بە كاروانەرێ بۆ شوێنانی تر وەسف كردووە بەلاّم ئاماژە بە بوونی ئەم دەزگایە ناكات.

یاخود بوونی بازاڕ لە هەندێ شوێندا بۆ ئاڵوگۆڕكردنی بازرگانی بەكارهاتووە، دەكرێت بە ناوچەیەكی حەوانەوەی بازرگانیان دابنێین[4]، چونكە ئاماژە بە ناوچەی (تل هفتون)[5] لەسەر رێگای نێوان ئیربل و ئازەربایجان دەكات، كە بازاڕی هەبووە و كاروانەكانی لێ هاتوونەتە خوارێ[6]. هەروەها لەسەر رێگای ئیربل بەغدا چەند قەلاّیەك هەبوون شوێنی كاروانچییەكان بوون[7]. خودی شاری موسل بە بنكەی گەشتیار و گەڕۆكەكان

---

(١) - كارل میولەر، كاروان سەراكانی رۆژهەڵات، وەرگێرانی: عەبدولموئمین دەشتی، (سلیمانی: ٢٠٠٢)، ل ١٥.

(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٤١.

(٣) - مونسیە: گوندێكە لەسەر رێگای شاری نەسیبین و موسل. معجم البلدان. مج ٥، ص ٢٢٨.

(٤) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣٢٠، ص ٣٢٤، ص ٣٨٧، ص ٤٧٦، مج ٢، ص ١١٢.

(٥) - تل هفتون: شارە دێیەكە لە ناوچەكانی ئیربل(هەولێر).معجم البلدان، مج٢، ص ٥١١.

(٦) - المصدر نفسه و الصفحة.

(٧) - المصدر نفسه، مج١، ص ١٣٨.

دادەنێت[١] . پاشان ڕێگاکانی نێوان موسل و شارەکان وەکو ڕێگای (مرق) لەسەر ڕێگای موسل و نەسێبین بووە[٢] و (عقر) لە نێوان موسل و تکریت کاروانەکانی لێ وەستاون[٣]. هەندێ جاریش کاروانسەراکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازرانەوە بۆ پاراستن لە ڕاوڕووتی، وەکو کاروان سەرای شاری بەرقەعید گواستراوەتەوە بۆ ناوچەی (باشزا)[٤]، چونکە تووشی بارودۆخی ناهەموار هاتووە[٥].

وە شاری نەسێبین لە هەرێمی جەزیرە، ڕێگایەکی نێوان شام وموسل بووە [٦]. هەروەها گوندی (عرادە) لە نێوان نەسێبین و ڕەئس عەین وەکو کاروان سەرایەك سەیردەکرێت[٧] . لە هەرێمی چیاکانیش ئەم جۆرە دامەزراوە دەبێ هەبووبێت بەتایبەتی لەو ڕێگایانەی نێوان هەمەدان و بەغدا کە هاتووچۆیەکی زۆر لەسەر ئەو گوند و شارانەی کەوتوونەتە سەر ئەم ڕێگایە، وەکو(قەسری شیرین) [٨]و بانەیوب و سەیمەرە، بووە[٩].

## ٢- گەرماوەکان:

دروستکردنی گەرماوەکان و بەکارهێنانی ئەم بونیاتە بۆمێژوویەکی دوور دەگەڕێتەوە، ولەهەرشوێنێکدا بێت گوزارشت لەبەرەو پێشەوەچوونی ئەوکۆمەڵگایە پیشان دەدات، دروستکردنی گەرماوەکانیش لەناوچەکوردنشینەکان بۆسەردەمی ئیسلام دەگەڕێتەوە،

---

(١) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٢٣٧.
(٢) - المصدر نفسه، مج٥، ص ١٠٩.
(٣) - المصدر نفسه، مج٤، ص ١٣٦.
(٤) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٢٤.
(٥) - المصدر نفسه، مج١، ص ٣٨٧.
(٦) - المصدر نفسه، مج١، ص ٢٨٨.
(٧) - معجم البلدان، مج٤، ص٩٢.
(٨) -قەسری شیرین:ناوچەیەکە دەکەوێتەنێوان هەمەدان وحولوان، نزیکە لەقەرمیسین، ناوکەشی بۆ جاریەی کیسرا ئەبروێز مەلیکی فارسی دەگەڕێتەوە. معجم البلدان، مج٤، ص٣٥٨.
(٩) - المصدر نفسه والصفحة، مج ١، ص ٣٠٢، مج ٣، ص ٤٣٩.

لەبەر ئەوەی یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی تاکی موسولْمان پەیوەستە پێوەی، پاك وخاوێنیە، لەگەڵ ئەوەی چەند جۆرێك هەبووەو ئەمەش بە پێی لەسەر باری ئابووری و لەگەڵ چۆنیەتی دروستکردنی و کەرستە بەکاهاتووەکانی[١]، ئەمانە لای یاقوت باسی لێوەنەکراوە، تەنیا تیشکی خستۆتە سەر ئەو گەرماوانەی کەگشتی بوون، وەشوێنی هەڵکەوتنەکەی لە بازاری ناوچەکان لەڕیز دامەزراوەکانی وەکو کاروانسەراو مزگەوت دروستکراوەکانی تر بووە، ئەمانەش لەباسی (دیر القیارە)[٢] و باعشیقا بەرچاو دەکەوێت[٣] .



[١] - بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی گەرماوەکان لە شارە کوردیەکان بروانە: فرهاد حاجی عبوش، المرجع السابق، ص ص١٦٥-١٧٢.

[٢] - ئەم دێرە دەکەوێتە ناوچەکانی ڕۆژئاوای شاری موسل(موصل( بە دووری (چوار فەرسەخ -٢٤ کم) لییەوە. معجم البلدان، مج٢، ص٥٢٩ .

[٣] - المصدر نفسه، مج١، ص٣٢٤.

# بەشی چوارەم

## باری کۆمەڵایەتی و زانستی و ڕامیاری ناوچە کوردنشینەکان لەکتێبی (معجم البلدان)دا

**تەوەری یەکەم:**

باری کۆمەڵایەتی(هۆز و تیرە کوردییەکان، بیرو باوەڕوئایینەکانی ناوچە کوردنشینەکان).

**تەوەری دووەم:**

باری زانستی.

**تەوەری سێیەم:**

باردۆخی سیاسی(پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لە هەرێمە کوردنشینەکان،ئەمیر و سەرکردە کوردیەکان، حکومڕانانی ناوچە کورد نشینەکان لەسەردەمی یاقوت ).

## تەوەری یەکەم:

## باری کۆمەڵایەتی:

کۆمەڵایەتی، هەمووئاکارو ڕەفتارونەریتی کۆمەڵە مرۆڤە دەگرێتەوە کەبەیەکەوە دەژین، وبەشدارن لە هەموو ئەودیاردانەی کە دروستی دەکەن ودەبنە بەشێك لەکولتووری ئەو کۆمەلگایە، لەڕوانگەی هەر کۆمەڵگایەکیش جۆرێك لێکدانەوە بۆ ژیان وبەردەوام بوون هەیە. کەلە ناوچەیەك بۆناوچەیەکی دیکە دەگۆڕێ، بەلاّم لایەنی کۆمەلایەتی گوزارشتێکی تەواوە لەپێکهاتەی کۆمەڵگا لە ڕووی هۆزو تیرەو نەتەوەو ئاین ڕەنگدانەوەی مێژوو بەسەریاندا، وە لەکتێبەکەی یاقوتیش دا تێبینیی هۆز و تیرە کوردیەکان و بیروباوەڕە ئاینیەکانی ناوچە کوردنشینەکان تیشکی خراوەتە سەر.

### یەکەم/هۆز و تیرە کوردییەکان:

سەبارەت بەو هۆز و تیرە کوردیانەی، کە یاقوت لە ناوچە کوردی و کوردنشینەکان ناویان دەهێنێت، زیاتر لە ڕێگای ناساندنی شوێن و قەلاّ و ناوچەکان بەرچاو دەکەوێت[١]. لە ئەنجامی تەنیا ئەم ناوهێنانانەی بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەم هۆزانە خاوەن دەسەلاّت و هێز بوونە، تەنانەت خاوەن کورسی و مەملەکەتیش بوون[٢]، وە کو ئاشکرایە ئەوهۆزانە خاوەنی مێژوویەکی دێرین و وەرچەرخانن، بەلاّم یاقوت وەکو پێویست مافی خۆی پێنەداون، ڕۆڵی دلێرو نەبەردی ئەم هۆزانە ناخاتە بەرچاو، واتا زۆر لایەنی بەشاراوەیی هێشتووەتەوە. دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئینسکلۆپیدیایی کتێبەکەی، کە

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ٥١.
(٢) - المصدر نفسە، مج٢، ص١٢٤.

ماددەیەکی بەرفراوانی چەندان ڕووبەری جوگرافی سەردەمی خۆی لەخۆوە دەگرێت، ئەمەش وایکردووە کە نەتوانێت بە بەر فراوانیەوە هەر لایەنێکی تایبەت بەهەر ناوچەیەك بخاتە ڕوو بەوردو درشتیەوە[١].شایەنی باسیشە لە تێڕوانینەکانی یاقوت بۆ باسی ئەم هۆزانە ئەوە دەگەیەنێت، کورد نەتەوەیەکی خاوەن شارستانیە، ئەمیش لە ڕێگەی ئەو کیان و ناوچانەی تایبەت بوون بەو هۆزانە، هەروەها لەکتێبەکەدا باس لە سەرکردەو ئەمیرەکان دەکات، ئەگەرچی لە دیاری کردنی پیشەو کاریان لەهەرێمی فارسدا بە ڕەوەندی داناون، کە گەرمیان و کوێستانیان کردووە[٢]، ئەمەش یەکێك بوو لەشەقلە کۆمەڵایەتیەکانی ئەو سەردەمە. بەڵام لەو کاتەشدا کە کۆچیان دەکرد بۆ شوێنێك دەستە و کۆمەڵە کۆبوونەوە و ناوچەیەکیان بۆ خۆیان دیاری کردووە[٣]. بەڵام سەبارەت بە ئاکار و ڕەوشتیان لە هەندێ ناوچە بە بەهێز و توانا وەسفیان دەکات، بۆ نمونە وە سەبارەت بەخەڵکی شاری دینەوەر ناوبراو باس لە ڕەوشت و ئاکاریان دەکات، بەچەشنێ لەخەڵکی هەمەدان باشتربوون[٤]، یاخود خەڵکانی دەوروبەریان لێیان ترساون[٥]. یا سیفەتی خراپیان دەخاتە پاڵ[٦]. ئەگەرچی ئاماژەی بەوە دەکات کە ئەو زانیارییەی لەسەرچاوەی ترەوە وەرگرتووە، بەڵام ئەوەی گرنگە لەسەرچاوەکەی دەبینرێت.

دیارترین هۆز و تیرەکان ئەمانەن:

## ١- بوختیەکان:

ئەم هۆزە خاوەن مێژوویەکی سیاسی بوون، کەئەمەش لەڕوانگەی تێبینیەکانی یاقوت دەردەکەوێت، ئەمەش بەهەژمارکردنی ئەوقەڵایانەی کەبوختیەکان سەرپەرشتیان

---

(١) – بۆنمونە هۆزەکوردیەکان لەچەندناوچەو وهەرێمی جیاواز بوون. بروانە: پاشکۆی ژمارە (٤).

(٢) - معجم البلدان، مج٣، ص ٢٩٧ ؛ مج٤، ص ٢٢٧.

(٣) - المصدر نفسه، مج٣، ص ٧١.

(٤) - المصدر نفسه ج٢، ص ٥٤٥، . هەروەهابروانە: ابن حوقل، المصدر السابق، ص٣٠٨.

(٥) - المصدر نفسه، مج٤، ص ٣٨٠

(٦) - المصدرنفسه، مج ٣، ص٣٧٦ .

كردووە، وەكو ( ئاتیل وعەلوس و جورزدەقیل وباز) لەهەرێمی جەزیرە[١]، دەسەڵاتیشیان فراوان بووە، ئەمیش بۆشوێنهەڵكەوتەی ئـەم قەڵایانـە دەگەڕێتـەوە، لەشـاری زۆزانـی هەرێمی جەزیرەو هاوسنوری لەگەڵ ئەرمینیاو ئاران وئازەبایجان[٢]. بەڵام ئەم قەڵایانـە لـەژێر دەسـتیان نەماونەتـەوە، ئەگەرچـی نـاوبراو ئامـاژە بـەوە دەكـات، كەوتونەتـە ژێردەسەڵاتی ئەتابەكیەكانی شاری موسل[٣]، بەبێ ئەوەی هۆكـارو كـات و سـاتە مێژوویەكان دەست نیشان بكات. بەشێوەیەك لە ڕووداوەكانی ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) لە قەڵاكانی زۆزان ئەم ناكۆكییە لەسەر دەسەڵات بەدیار دەكەوێت[٤].

وە ئەو هۆزە ڕۆڵی سیاسیی گرنگیان گێـڕاوە، جـا چ بـە دەسـەڵاتەكەیان بێـت یـان هەڵكەوتنی میر و سەركردەی بـەهێز، كـە هـەر لەسـەدەی چـوارەمی كۆچـی دەیـەمی زایینییەوە، بەرچاوە[٥].

## ٢- بەشنەوەیهی:

هۆزێكی كوردی جوامێر و خاوەن دەسەڵات بوون[٦]. یاقوت دوو جار ناوی ئەم هۆزەی هێناوە و باس لە قەڵاكانی دەكات[٧]، بەشێوەیەك بۆهۆزی بەشنەوەیهی دەگەڕێنێتەوە. سنووری فەرمانڕەوایان لە هەرێمی جەزیرە بەرچاوكەوتووە[٨]، ناوبراو باس لـە ڕۆڵی چالاكی سیاسی ناكات، ئەگەرچی ئاماژە بەوە دەكات، لە قەڵای فنك دا سێ سەد ساڵ

---

(١) - معجم البلدان، مج ١ ، ص ٥١، ص ٣٢١ ؛ مج ٢، ص ١٢٤ ؛ مج ٤، ص١٤٧

(٢) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٥٨ .

(٣) - المصدر نفسه، مج١ ، ص ٢٤٦ ، ص ٣١٦ ، ص ٣٧٥ .

(٤) - ابن العبري، تاريخ الزمان، ص ٢٥٤

(٥) - یەكێك لەو میر كوردیانە ئەمیرموسەك عجلی (م :٤٤٧ك/١٠٥٥ز) بووە. ابن الاثير، الكامل، ج ٨، ص ١٢٣.

(٦) - شەرەفخانی بەدلیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٠٩.

(٧) -معجم البلدان، مج١، ص١٢٩، مج ٤، ص ٢٧٨.

(٨) - ابن الاثير، الباب في تهذيب الانساب، ج ١، ص ١١٥.

**حوکمڕانیان کردووە[١]. ابوشامە(م:٦٦٥ك/ ١٢٦٦ز) ش ئەم دەقە دووبارە دەکاتەوە[٢]. بەڵام ڕۆڵ و چالاکییە سیاسییەکانیشیان لە مێژوو نوسراوەتەوە، وەکو چۆن لەسەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەیەمی زایینیدا، بەشداریان لە دژایەتی کردنی حەمدانییەکان کردووە، بۆ بەرەوپێشەوە چوونی دەسەڵاتی کوردی[٣]. وە لەگەڵ ئەم بەهێزیەشدا سەرهەڵدانی ئەتابەکیەکان کاریگەر بووە بۆ لاوازکردن و داگیرکردنی دەسەڵات و ناوچەکانی ئەم هۆزە، کە لە ڕووداوی ساڵی (٥٤٠ك/١١٤٥ز) ئەتابەکیەی موسل قەڵاکانیانی خستۆتە ژێر دەستی خۆی[٤].**

## ٣- هەزبانیەکان[٥]:

**هۆزێکی کوردی بوون[٦]، یاقوت تەنیا یەك جار ناوی هێناون و مەبەستی ئەو بەشە یە، کە لە جەزیرەی فوراتی و ناوچەکانی پەیوەست بەشاری موسل نیشتەجێ بووینە[٧]. لەگەڵ ئەمەشدا دەسەڵاتیان تەنها لەم ناوچەیە نەبووە، بەڵکو لە ناوچەیەکی فراوانی هەرێمی ئازەربایجان فەرمانڕەوایەتیان کردووە[٨]، ڕۆڵێکی دیاریان لە سوپای دەوڵەتی**

---

(١) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٢٧٨؛ القزويني، اثار البلاد، ص ٤٣٢.

(٢) - الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، وضح حواشيه وعلق عليه: ابراهيم شمس الدين، (بيروت:٢٠٠٢)، ج١، ص١٨٠.

(٣) - ابن الاثير، الكامل، ج ٧، ص ٤٣٤؛ ج٨، ص ١٢٣.

(٤) - ابن العبري، تاريخ الزمان، ص ١٥٩.

(٥) - مینۆرسکی دوای ئەوەی باس لە ڕەوادیەکان دەکات، بەتیرەیەکی هەزبانیەکان دایان دەنێت، ئینجا وشەی هەزبانی بۆ(هذانی)کە زاراوەیەکی لێکدراوە بۆجوگرافی ناوچەکانی شاری ئیربلی دەگەڕێنێتەوە. - Studies in Caucasian History ,p,128.

(٦) - المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص ٣٣٨.

(٧) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٩.

(٨) - ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص ٥٧. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: احمد عبدالعزيز، المرجع السابق، ص ص ٦١- ٦٦.

ئەیوبی(٥٦٧-٦٤٨ك/١١٧١-١٢٨٤ز) دا هەبووە[١].

جگە لەمەش هەندێکیان ئەندامی کارای دەوڵەتی فاتمیەکان (٢٩٧-٥٦٧ك/ ٩٠٩-١١٧١) [٢] بوون وەکو( قطب الدين بن تليل المذباني) [٣].

## ٤- حەمیدیەکان[٤]:

ئەگەر سەیری بیروبۆچونی یاقوت بکەین، سەبارەت بەم هۆزە کوردییە[٥]. ناوەکە، واتا (حەمیدی)، لکاندووە بە هەندێ ناوچەکە، کە خەڵکەکەی کورد بوون [٦]. واتا بە خاوەنی چەند قەڵاو گوندێکی ناوچە چیاییەکانی شاری موسلی داناوە[٧]، بەشێوەیەکی گشتی لە نێوان شەهرەزوور و ئامەدا ژیاون[٨]، لێرەدا لەخوێندنەوەی ئەم گێرانەوەیە دەتوانین بگەینە دەرئەنجامێك، کە شوێنی ستراتیجی گرینگیان هەبووە، هەربۆیە ئەو هۆزەش ڕۆڵی دیاریان لەوەرچەرخانی مێژوودا بینیوە، ئەگەرچی هەمدیسان ناوبراویش کەلێنێکی گەورەی لەکتێبەکەی بۆباسی جولەی سیاسیان بەجێهێشتووە، چونکە

---

[١] - یەکێك لەوکەسایەتیانە میر حوسامەدین هەزبانی بوو، یەکێکە لەئەمیرەکانی مەلیك سالح نەجمەدین ئەیوب (٦٣٧-٦٤٧ك/١٢٣٩-١٢٤٩ز) بەجۆرێك ڕۆڵی لە(٦٤٧ك /١٢٤٩ز ) خەباتی بێوچانی بەدیار دەکەوێت .محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان في الدور الاسلامي، نقلة الى العربية، كريمة، (بغداد:١٩٤٥)، ج١ص ١٧١. بۆزیاتر زانیاری بڕوانە: الياس أحمد كريم، الدور السياسي و الحضاري للهذبانين في الدولة الايوبية في مصر و بلاد الشام، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠٨)، ص ص ١٠٣- ١٣٠.

[٢] - .عبد الله محمد جمال الدين، الدولة الفاطمية قيامها ببلاد المغرب وانتقالها الى مصر، ( القاهرة:١٩٩١)، ص٤١.

[٣] – المقريزي ، اتحاظ الحنفا باخبار الائمة الفاطميين الخلفاء، تحقيق، محمد عبد القادر، (بيروت:٢٠٠١)، ج ٢، ص ص٢٩٤-٢٩٧.بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ابن الأثير: الباهر، ص١٤١.

[٤] - سەبارەت بەناوی ئەم هۆزە لەڕووی زمانەوانییەوە دەیگەڕێنێتەوە بۆ کەسایەتیەك کە میری هۆزەکەبووە بەناوی (حميد). كرفان محمداحمد، المرجع السابق، ص٢٨٩، هامش رقم (١).

[٥] – الروذراوري، ذيل تجارب الأمم، تحقيق:ه، ف. امد روز، (مصر: دت)، ج٣، ص ٨٤.

[٦] - معجم البلدان، مج ٤، ص ١٣٦.

[٧] - معجم البلدان، مج ٤، ص ١٣٦؛ مج ٢، ص ١٧٨؛ مج ٣، ص ٣٧٢.

[٨] -ابن حوقل، المصدر السابق، ص ٣١٥.

میوسەرکردەی چالاکی تێدا هەڵکەوتووە، تەنانەت دەسەڵاتیان فراوان بووە، تاکەکانی بەشدارییان له ڕوویەڕووبونەوەی دژە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئەیوبی دا کردووە[١].

٥- جەلالی (گەلالی)[٢]:

ئەم هۆزە کوردییە[٣] یاقوت دووجار ئاماژەی بۆ کردوون[٤]. جارێکیان بە یەکێك لە هۆزەکانی شاری شەهرەزووری ژماردووە، زانیارییەکەشی لە گەشتنامەکەی (مسعر بن مهلهل) گواستۆتەوە[٥].

بۆ جاری دووەمیش ڕەچەڵەکی یەکێك لە هاوڕێکانی، کە نیشتەجێی (باکلبا)[٦] بووە، بۆ ئەم هۆزە دەگەڕێنێتەوە لە ڕیز کەسایەتی زانست خوازەکان دەکات[٧].

کەواتە یاقوت جەلالییەکان لەشاری شەهرەزوور و ئەو شارو ناوچانەی، کە سەر بە موسل بوون دیاردەکات. ئەگەر لەمە بتوێژینەوە، ئەوا ئەم هۆزە بەناوچەیەکی ستراتیجی سنوری نێوان دوو هەرێمدا گەیشتوون بەلام ناگەین بەئەنجامێك کەئایا ئەم هۆزە تاچ ڕادەیەك خۆیان خزاندۆتە ناو مێژووی ئەم شوێنانە، .چونکە جگە لەم سنورەی ناوبراو دەستنیشانی کردووە، لەشاری ئوشنۆ و داقوق و دەرتەنگ و نەهاوەندیش بەدی کراون[٨].

---

(١) - وەکو مەنای کوری حەمیدی لەساڵی (٥٨٧ك/ ١١٩١ز ) .عمادالدین الاصبهاني، الفتح القسي في الفتح القدسي، قدم له وضع حواشیه و علق علیه: ابراهیم شمس الدین، (بیروت: ٢٠٠٣)، ص ٣١٠ .بۆزیاتر زانیاری بروانه : زرار صدیق توفیق، القبائل، ص ص٨٣-٩٠.

(٤)- لێکۆڵەرەوان وشەی جەلالییان و گەلالی بە ناوی یەك هۆز داناوە. بروانە، کرڤان محمداحمد، المرجع السابق، ص ٣٦١.

(٥)- المسعودي، التنبیه و الاشراف، ص ٩٤

(٤) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٧٥

(٧)- الرساله الثانیة، ص ١٠؛معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٧٥.

(٦) - گوندێکە لە دەوروبەری شاری هەولێر. معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٨.

(٧) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٢٨.

(٨) - ابن فضل الله العمري، المصدر السابق، مخطوطه مصورة، ج٣، ص ١٢٥.

## ٦- زەرزارییەکان:

تیرەیەك بوون لە هۆزی گەورەی کوردی هەزبانی[(١)]. یاقوت تـەنیا یـەك جـار باسـی کردوون، بە جۆرێك ناوەکەیان دەخاتە سەر قەڵایەك، کە شوێنەکەی کەوتۆتە ئەو ناوچانەی سەر بەئیربل بوون[(٢)]، بەڵام ئەمە تەنها تاکە ناوچەیان نەبووە، بەڵکو سنوری دەسەڵاتیان لە (مرت)[(٣)] ەوە تاکو چیای کێلەشین (جنجرین)، کە دەڕوانێتـە سـەر شـاری ئوشـنۆی هەرێمی ئازەربایجان، دیاریکراوە[(٤)]. شایەنی باسە لەو تێبینیە کورتەی یاقوت بۆمان روون دەبێتەوە، کە جێگای متمانەی مێژوو بوون، چونکە سەرپەرشتی قەڵایەکیان دەکرد، لەچەرخ ودەورانی جیاجیادا مێژووی سیاسی کورد پشتی پێبەستووە، بێجگـە لەمـەش میرەکـانی زەرزاری بەشـداریان لـەپێکهێنانی بەرەیـەکی ئیسـلامی یـەکگرتوو، بـۆ بەرپەچدانەوەی خاچ دروشمان، کردووە[(٥)].

## ٧- هەکارییەکان:

هەکاریەکان یەکێکن لەو هۆزە کوردی یە بەناوبانگەی سەردەمی ئەیوبیـەکان، کـە هەموو دەم جێگای باوەری سەڵاحەدین ئەیوبی بوونە بەجۆرێك لە زۆربەی کاتدا پشتی پێبەستوون و راوێژی پێکردوون [(٦)] یاقوتیش بەهۆزێکی کوردی خاوەن گونـد وشـارو ناحیەی باکووری موسل، باسیکردوون، ناوەکەشیان بۆناوی وڵاتەکەیان (بلاد هکاری)[(١)]

---

(١) - احمد عبدالعزیز: المرجع السابق، ص ٤٤.

(٢) - معجم البلدان: مج ٢، ص ٣٨٠.

(٣) -مرت: گوندێکە لە شاری ئورمیە نزیکە لەسەر رێگای تەبرێز. معجم البلدان، مج ٥، ص ١٠٠.

(٤) - ابن فضـل الله العمـري، المصـدر السـابق، مخطوطـه مصـورة، ص ص ١٢٩- ١٣٠؛ القلقشـندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٣٧٦.

(٥) -وەکو میر (شروین بن حسن) ناسراو بە(جمال الدین زرزاری ) (م: ٥٨٣ ك/١١٨٧ز)، جگە لەوەی بەشداری لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبیدا کردووە، رۆڵی چالاکی لە رزگارکردنی (بیـت المقـدس) بەدیار دەکەوێت. الذهبی، تاریخ الاسلام، ج٤١، ص١٥٤.

(٦) - بەتایبـەتی لـەکاتی گـەمارۆدانی شـاری موسـل راوێـژی بـە عیسـای هـەکاری(م: ٥٨٥ك/١١٨٩ز )و مەشتوبی هەکاری (٥٨٨ك/١١٩٢ز ) کردووە . ابن خلدون، تاریخ ابن خلدون،

دەگەڕێنێتــەوە، کەدەکەوێتــە نزیــك جــەزیرەی ئــیبن عومــەر [٢]. وە(الســمعانی) (م: ٥٦٢ك/١١٦٦ز ) یش وەکو ناوبراو باسی لێوەدەکا[٣].

کەچی هەندێکی تر ئەم ناوەیان سەرەتا بۆ ناوی هۆزەکەیان، کە هەکاریە، داناوە، واتا بۆناوی هۆزەکە دەگەڕێتەوە نەك شوێنەکە[٤]، وە ئەو شوێنانەی کە پەیوەست بــوون بــەم هۆزە و وڵاتەکەیان دەخاتە سەر ناوچــەکانی موســل[٥]، کەواتــە لێــرەدا ئەمــە بــەدیار دەکەوێت، دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆیان، بەتایبەتی لەڕووی جوگرافیەوە نەبووە.

## ٨- قەیموری:

ناوی ئەم هۆزە جارێك لەلایەن یاقوتەوە ئاماژەی پێکراوە، کە بــە هــۆزێکی کــوردی خاوەن قەڵا و میر باسی کردوون، دەسەڵاتەکەشیان لە ناوچەکانی نێوان موسل و خــیلات دیاردەخات[٦]. لەمیانەی باســەکەی نــاوبراو دا راســتی دەســەلاتداری ئــەم هــۆزە ڕوون دەبێتەوە، چونکە لە ڕووداوە مێژووییەکانی وڵاتی شام ئەمیرەکانی ئــەم هــۆزە بەرچــاو دەکەون، کە چۆن ڕۆڵی چالاکی سیاسی و بیناسازی یان بینیوە[٧].

---

ج٥، ص ص٣٠٧-٣٠٨. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : نەبەز مەجید ئەمین، المشطوب الهكاري دراسة عن دور الهكاريين في الحروب الصليبية، ( السليمانية، ٢٠٠٢).

(١) -معجم البلدان، مج ٥، ص ٤٠٨.

(٢) - بۆ سنوری جوگرافی ئەم وڵاتە بڕوانە: درويش يوسف حسن، المرجع السابق، ص ص ١٧-٢٠" احمد عبد العزيز، المرجع السابق، ص١١٠.

(٣) - الانساب، ج٥، ص٦٤٥.

(٤) - لەرایەکی تردا ناوی هۆزەکەش بۆنــاوی بــاپیرە گەورەکــەیان گەڕێنراوەتــەوە، کــەناوی(هاوکال) لــەوڵاتی هــەکاری گــوزەرانی بەســەر بــردووە. نەبــەز مەجیــد ئــەمین، عیســای هــەکاری، (سلیمانی:٢٠٠٢)، ل١٠.

(٥) - معجم البلدان، مج ١، ص ٥٤؛ مج ٢، ص١٤٩، ص ١٥٤.

(٦) — المصدر نفسه، مج٤، ص ٤٢٤.

(٧) - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سهيل زكار، تاريخ دمشق، ( دمشق: ٢٠٠٧)، ج٢، ص ٨٦٠.

## ٩- داسنیە[١]:

هۆزێكی كوردی باكووری شاری موسل بوون، لە چیایەكدا نیشتەجێ بوون، كە هەر بەناوی هۆزەكە ناوبردراوە[٢]. لەگەڵ ئەمەشدا ناوچەكانی ئەم هۆزە چوارسەدە پێش سەردەمی یاقوت بە مۆڵگە (معقل)ی كوردەكان دانراوە[٣]. وە بەهاوشان وپاڵپشتی هۆزی هەزبانی و حەمیدی دادەنرێن، لەڕووداوی ڕامیاری ساڵی(٢٩٣ك/٩٠٦ز) لەبەرەنگاربوونەوەی حەمدانیەكان[٤]، هەروەها لەریزی سوپای كوردیەكانی وڵاتی شام ومیسر بینراون[٥].

## ١٠- جوزقان(گۆران):

دەربارەی ئەو هۆزە كوردییە، یاقوت تەنها یەك جار ئاماژەی پێكردووە و بەنیشتەجێبوانی شاری حولوانیان دادەنێت [٦]. ئەو شارەی هەر لەسەدەی سێیەمی كۆچی نۆیەمی زاینی دا كوردبە یەكێك لە پێكهاتەی دانیشتوانی دانراوە[٧]. بەلام (المسعودی) (م :٣٤٦ك/٩٥٦ز) ئەم هۆزەی لە ناوچەكانی موسل و دەوروبەری چیای جودی دەست نیشان دەكات[٨]. بۆیە جیاوازیەك لەشوێنیان دروست دەبێ، بەلام لەسەرەتا ڕۆژئاوای هەرێمی چیاكان، جا لە حولوان بێ، یاخود لەناوچەكانی نێوان هەمەدان و شەهرەزوور نیشتەجێبووینە[٩] . بە گۆران ناسراون[١]، بەلام ناوبراو بەجۆزقانی ناوبردوون، ڕەنگە

---

(١) - مانای داسنیە بەمانای دوژمن دێت. درویش یوسف حسن، المرجع السابق، ص ٤٤، هامش رقم (١).
(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٤٣٢.
(٣) - البلاذری، المصدر السابق، ص ٣٢٧؛ ابن الفقیه الهمذانی، المصدر السابق، ص ١٧٥.
(٤) - ابن الاثیر، الكامل، ج٦، ص٥٤٨.
(٥) - بۆزانیاری زیاتر بروانە:زرار صدیق توفیق، القبائل، ص٩٣.
(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٨٤؛ ابن الاثیر، الباب فی تهذیب الانساب، ج ١، ص ٣٠٧.
(٧) - الیعقوبی، المصدر السابق، ص ٧٥.
(٨) - مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨.
(٩) - ابن فضل الله العمری، المصدر السابق، مخطوطه مصورة، ج٣، ص ١٢٥.

**لەبەر ئەوەبێت زانیاریەکەی لەسەرچاوەکانی پێش خۆی ڕاستەخۆ گواستبێتەوەو لێکۆلینەوەی لەبارەیەوە نەکردبن.**

## ١١- جوبیە[٢]:

**هۆزێکی کوردیەو لە هەرێمی جەزیرە نیشتەجێ بووینە، خاوەن قەلای (حیصن گالب)، نزیك شاری سەعرد، بوون [٣] کەچی (السمعانی) بەهۆزێکی عەرەبی شاری هەمەدانی دادەنێت [٤] بەلام (ابن الاپیر) ڕاستی زانیاریەکەی یاقوت دەسەلمێنێت، بەوەی کەخاوەنی قەلای شاتانی کوردی بوون [٥] .**

**شایەنی باسە دەسەلاتی ئەم هۆزە لەم شوێنە وەکو خۆی نەماوەتەوە، لە پاش سالی (٥٦٠ك/١١٦٤ز) کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی حوکمڕانانی ئەو کاتەی شاری (حیصن کەیفا)[٦].**

## ١٢- زومان[٧]

**یاقوت ئەو هۆزە، بەتایەفەیەکی کوردی وەسف دەکات، کە لە باشووری شاری موسل(موصل) و دەوروبەری هەرێمی ئەرمینیا دانیشتوون، هەروەها بە هۆزێکی خاوەن**

---

(١) - مؤلف المجهول، مجعل التواریخ و القصص، ج٢، ص ٩٩.

(٢) - لێکولەران ئەم وشەیە بۆزمانی کوردی دەکەرێنەوە بەلام گۆرانکاری بەسەر داهاتووە کاتێك بۆتەعەرەبی واتا سەرەتا(گوپ یا قوپ) بووە . کرفان محمداحمد، المرجع السابق، ص٦٤، هامش رقم(٤).

(٣) معجم البلدان، مج٢، ص ٢٦٥.

(٤) - الانساب، ج٢، ص ص١١٠-١١١.

(٥) - ابن الاثیر، الکامل، ج٩، ص٢٩٠.

(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ٢٦٥. بۆ زیاتر زانیاری بروانە: کرفان محمداحمد، المرجع السابق، ص ص ٢٦٤-٢٦٥..

(٧) - زومان: ووشەیەکی کوردیەو بەمانی کوێستان دێت، رەنگە ئەم تایەفەیە بۆیە بەم ناوە ناسراون چونکە شوێنیان کەوتۆتە نێوان هەرێمی جەزیرەو ئەرمینیا، بەشێوەیەك لەناوچە چیایەکانی موسل لەگەل ئەرمینیا کەناوچەیەکی شاخاویە.

دەسەڵات و ویلایەت یا دادەنێت بەناویانگیش بووینە بە پەنیر دروستكردن، چونكە بۆتە نازناوێك بۆ ناوی ئەم هۆزە[1].

## ١٣- كوردە شامییەكان:

ئەو كوردانە بوون كە لە شاری مەیافارقین گیرساونەتەوە[2]، ئەگەرچی هیچ سەرچاوەیەك پێش یاقوت ئاماژەی بە مە نەكردووە، بەڵام (الفارقی)(م: ٥٧٢ك/١١٧٦ز) دەرك بەوە دەكات، كە هۆزێك لە وڵاتی شام كۆچیان كردووە ولە شاری مەیافارقین گیرساونەتەوە، لێكۆڵەرەوانیش وای بۆچوونە كە رەنگە ئەم كوردانە بووبن كە یاقوت بە كوردە شامییەكانی ناویردووە[3].

## ١٤- سولیە:

لەو تاقە ناوهێنانەی یاقوت بۆ ئەم هۆزە كوردیە ناگەینە ئەنجامێك، چونكە سەرەتا لە كتێبی (مسعر بن مهلهل)ی گواستۆتەوە، كە ئەویش جگە لەمە بەهۆزێكی كۆچەری دایناون[4]، بۆیە بە شیكردنەوەی زانیاری كتێبی (معجم البلدان)، تەنها هۆزێكی كوردییەو لەشاری شەهرەزووربوون[5]، كەچی (ابن فچل الله العمری)(م: ٧٤٩ك/١٣٤٨ز) سنوری ناوچەكەیان لەنێوان شەهرەزوور وئوشنۆییدا(شنۆیە) دیاری دەكا، بەچەشنێك بۆ دوو تیرە دابەشكراون و هەریەكە سەركردەی تایبەت بەخۆیان هەبووە[6].

---

(١) - معجم البلدان، مج ٣، ص ١٥٩. لەلای (الاصطخری) ش ناوی ئەم پەنیرە هاتووە. المسالك و الممالك، ص ١٢٠.

(٢) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٣٦

(٣) - تاريخ الفارقي، ص ص٤٥-٤٦، فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص ٤١، هامش رقم(١)؛ قادر محمد حسن، الكرد في مصر و بلادالشام، ص ٢٠.

(٤) - الرسالة الثانيه ، ص١٠ .

(٥) - معجم البلدان، مج٣ ص ٣٧٥ .

(٦) - مسالك الابصار فی الممالك الامصار، مخطوطة مصورة، ج٣، ص١٢٦ .

واتە بەشێوەیەك هەریەتەنها لە شاری شەهرەزوور نەماونەتەوە بەڵکو کۆچیان کردووە بۆ هەندێ شوێنی تر، بەتایبەتی سنوری شارەکانی هەرێمی ئازەربایجان.

## ١٥- باسیان:

هەروەکو هۆزەکانی تر تەنها لەشاری شەهرەزوور ناوی هێناون[1]، باسی لە هیچ داب و نەریت و رۆڵ و چالاکی ژیانیان ناکات، ئەگەر چی مێژوو بەگشتی بێدەنگە دەربارەی ئەم هۆزە، تەنها بەناوهێنان ناسراوە، بەلام بە دەستەواژەی جیا جیا، وەکو چۆن یاقوت بەدەستەواژەی (باسیان) ناوزەدیان دەکا، لەسەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی دەیەم و یانزدەی زایینی بە (بارسیان) هاتووە[2] .

## ١٦- حەکەمیەکان:

هۆزێکی کوردی شاری شەهرەزوورن[3] کە ئەمە زانیاری یاقوتە دەربارەیان، ئەگەر بێت و تەنها لە روانگەی ناوبراوەوە سەیری بکەین، ئەوا هیچ لایەنێکی ژیان و جوڵەی تاکەکانی ئەم هۆزە بەدەست ناهێنین، کەچی لەسەرچاوەکانی هاوچەرخی یاقوت، تاکەکانی ئەم هۆزە بەدیارخراون، کە چۆن هەندێکیان لەشاری ئیربل دەستنیشان کراون بۆ رووبەرووبوونەوەی خاچ دروشمان لەشاری عەککا لە ساڵی (٥٨٥ ك-١١٨٩ ز) بەسەر کردایەتی(ابی الهجاو السمین)(م:٥٩٤ك/١١٩٦ز)، ئەمەش بەمەبەستی پتەوکردنی دەسەلاتی ئەیوبییەکان[4].

---

(1) - معجم البلدان، مج٣، ص٣٧٥ .

(2) - المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨ ؛ البكري، المسالك و الممالك، ج١، ص ٢٦٢ .

(3) - معجم البلدان، مج٣، ص٣٧٥ .

(4) - ابن الاثير، الكامل، ج١٠، ص٧١ . بۆ زیاتر زانیاری بروانە : کرفان محمد احمد، المرجع السابق، ص ٣١٣ حامد عبد العزیز، المرجع السابق، ص٦٧.

## ١٧- لوڕەكان:

وەكو ئاماژەمان پێكردووە[١]، یاقوت لە ڕووی زمانەوانیەوە ناوەكەی چەسپاندووە، لەڕووی جوگرافیشەوە شوێنەكەیان دەستنیشان دەكات، ئەم بیروڕایەش لە زۆر سەرچاوەكانی بەر لە سەردەمی ئەو باسكراوە[٢]، لەدوای ناوبراویش دووبارە كراوەتەوە[٣]. بەلاّم لەباسی ئەم هۆزە لەكتێبی (معجم البلدان )دا زیاتر خۆی لە وەسف كردن دەبینێتەوە، بەلای بارودۆخی مێژوویی نەچووە، كە گرینگە بۆ ناساندنی و چەسپاندنی ئەم دەستنیشان كردنە جوگرافیە، چونكە چۆنیەتی دەسەلاّت و ڕەوتی ژیان و جێگای نیشتەجێبوون گۆڕانی بەسەر دادێت، كە لەم هۆزە بەدی دەكرێت، وەكوچۆن ئەم ناوچەیە دابەشكراوە بۆ لوڕستانی گەورەو بچوك وە ئەم جیاكردنەوە جوگرافیە خۆی لەمیانەی مێژووەوە دەبینێتەوە، كە لە سەدەی چوارەمی كۆچی دەیەمی زایینی بەرچاو دەكەوێت[٤].

## ١٨- بازنجان:

ئەم هۆزە كوردیە ناسراوە دەسەلاّتداری ڕەمێك(زم) لە نزیك شاری شیرازی هەرێمی فارس بوون[٥]، بەلاّم ئەوەی گرنگە تێبینی یاقوتە بۆ ئەم هۆزە، كە خۆی لە زانیاری (الاصگخری) دەبینێتەوە[٦]، كە بەوشێوەی سەرەوە ناوی هێناوە، بەلاّم لەلای هەریەك لە(المسعودی) [٧]و(ابن حوقل) [٨]و(البكری) [١] بە (مازنجان) ناوبردراوە.

---

(١) - بڕوانە: ئەم لێكۆلینەوەیە، ل ل٥٨-٥٩.

(٢) - المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨ ؛ ابن حوقل، المصدر السابق، ص٢٣٢ ؛ البكري، المسالك و الممالك، ج١، ص٢٦٢ .

(٣) - ابو الفداء، المصدر السابق، ص٣١٣ ؛ القلقشندي، المصدر السابق، ج٤، ص ٤٣٣ .

(٤) - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: رمضان شريف زيبر، المرجع السابق، ص٥١ .

(٥) - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ٥١ .

(٦) - بڕوانە: ئەم لێكۆلینەوە یە، ل٦١، پەراوێزی ژمارە (٣) .

(٧)- مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨.

(٨) - صورة الارض، ص٢٣٦.

## ١٩- کوردەکانی بلاسجان( بلاشگان):

لەکاتی بەڕێوەچونی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لەهەرێمی ئازەربایجان، یاقوت ئاماژە بەو هۆزە دەکات، کە هەر بەناوی شوێنەکە یان (بلاشجان)[٢] کراوە[٣]، هەروەها ئەوەی لە دیدی ناوبراویش روون دەبێتەوە، بیرو باوەری ئەم هۆزیە، چونکە کاتێ ئیسلام گەیشتۆتە ئەم ناوچەیە کوردەکانی بلاشجانی لە بەجێگەیاندنی مەراسیمی ئایینی تایبەت بەخۆیان ئازاد کردووە [٤]. کەدەبێ زەردەشتی بووبن.

## ٢٠-یەعقوبیەکان:

وەك ئاشکرایە ئەم هۆزە ڕەچەڵەکیان بۆ کورد دەگەڕێتەوە، (المسعودی)یش لە ڕیز هۆزە کوردیەکانی نیشتەجێی موسلی داناون[٥]، بەلآم دیدی یاقوت لەم خاڵانە خۆی دەبینێتەوە :

أ- ناوبراو ئاماژە بەوە ناکات، کە ئەم هۆزە کورد بوون، بەڵکو ئەوە دەسەلمێنێت کە فەلەن و خاوەنی دێری (القیارە)[٦]ن.

ب- ڕەنگە چۆنیەتی دارشتنی ئەم زانیاریە لەلای یاقوت لەم ناوچەیە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە بیروباوەڕی ئایینی زیاتر زاڵ بوویێت، یاخود لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت، ناوبراو لە زۆر شوێن ڕەگەزی دانیشتوانی بەدیار نەخستووە کە زیاتر لەناوچە کوردنشینەکان بەرچاوە .

---

(١) - المسالك و الممالك، ج١، ص ٢٦٢ .

(٢) – بلاشگان: زەویەکی پانتاییە، دەکەوێتە نێوان بەرزەند و وەرسان لە باکوری هەرێی ئازەربایجانە واتا لەنێوان ئەرمینیاو ئازەربایجانە. ابن خرداذبە، المصدر السابق، ص١٠٧.

(٣) - معجم البلدان، مج ١، ص١٢٨.

(٤) - ئەگەر چی یاقوت زانیاریەکەی لە ( البلاذری) گواستۆتەوە، بەلآم سەرچاوەی تریش باس لەم ڕووداوە دەکەن . فتوح البلدان، ص ٣٢١ ؛ قدامە بن جعفر، المصدر السابق، ص ٣٧٨ .

(٥) - مروج الذهب، ج ٢، ص٣٣٨، بۆ زانیاری مێژووی سیاسی ئەم هۆزە بروانە: کرفان محمد احمد، المرجع السابق، ص ص٢٥٨ — ٢٦١ .

(٦) -. معجم البلدان، مج٢، ص٥٢٩ .

## دووەم // بیروباوەڕو ئاینەکانی ناوچە کوردنشینەکان:

وەکو ئاشکرایە پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، لە ناوچـە کوردنشـینەکان چـەند ئایینێك پەیڕەو دەکرا، ئەو ئایینانەی کـە یـاقوت تیشـکی خسـتۆتە سـەر کۆنترینیـان لەهەرێمی جەزیرەشدا ئاینی (صائبە)[1] بڵاوبۆتەوە، تەنانـەت نـاوبراو شـاری حـەران و ناوچەی (ترعوز)[2] بەناوچەیەکی گرنگی ئەم ئاینە دادەنێت[3]. هەروەکو چۆن ( المقدسی) شاری حەران و روها بەپێگەیەکی گرنگی ئەم ئایینە داناوە[4].

پەیرەوانی سەر ئاینی جولەکەش بوونیان لە ناوچە کـورد نشـینەکان هـەبووە، بـەڵام لێرەدا یاقوت تەنها تیشك دەخاتە سەر کنێسەکانیان، وەکو لەشـاری مـەیافارقین[5] و (سن)[6]، هەروەها خەڵکی دوبەیل(دبیل) یەهودی تێدا بووە[7].

هەروەها ئایینی (زەردەشتی)[8] ش ئاینێکی دێرینی هەرێمە کوردنشـینەکان بـووە، بەڵام یاقوت بەبێ دیاریکردنی کات و ساتی بڵاوبوونەوەو خاسیەت و تایبەت مەندی ئەم ئاینە ئاماژە بەو شار و ناوچانە دەکات، کە ئاتەشگای زەردشتی لێ بووە، وە گرنگترین

---

(١) - سەبارەت بەم ئایینە بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ص ٤١٥؛ البيروني، الأثار باقية عن القرون الخالية، نشره: قاسم محمد الرحيب، (بغداد: ١٩٢٣).

(٢) - ترعوز: گوندێکی بەناوبانگ بووە لە حەران. معجم البلدان، مج٢، ص٢٢.

(٣) - المصدر نفسه، مج ٢ ص ٢٣٥.

(٤) - احسن التاقسيم في معرفه الاقاليم، ص ١٢٩.

(٥) - المصدر نفسه، مج٥، ص ٢٣٦.

(٦) - المصدر نفسه، مج ٣، ص٢٦٨.

(٧)- معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٣٩.

(٨) - زەردەشتی، بـۆ نـاوی زەرادەشـت یـان راهشـت کـوڕی پورشسـب کـوڕی بیتراسـب ئەفریـدون دەگەڕێتەوە، کە لە شاری ئورمیە لەسەدەی حەوتەمی پێش زاین لەدایك بووە، حەفتاو حەوت ساڵ ژیاوە. المسعودی، مروج الذهب، ج١، ص ص ١٥٤-١٥٥. ئەم ئایینە لەسەدەی حەوتـەمی پـێش زاین بڵاوبۆتەوە لەسەردەمی ساسا نیەکان بۆتە ئـاینی ڕەسمـی وڵات. مهـرداد ئیـزەدی، ئـاین و تایفەئاینیـەکان لەکوردسـتان، وەرگێرانـی : کامـەران فـەهمی، (سـلیمانی:٢٠٠٢)، ل٧، پەراوێزی،(*)

ناوچەیان شاری ئورمیەیە، کە بەمەزارگای زەردشتی دانراوە[١]، هەروەکو سەرچاوەکانی پێش ئەویش ئاماژەیان پێ کردووە[٢]. هەروەها بوونی ئاتەشگەکانیان لە ناوچە جیاجیاکان[٣] بەدیار خستووە، ئەم ئایینە تاکو هاتنی ئایینی ئیسلام لە هەرێمی ئازەربایجان پەیڕەو کراوە، ئەمەش لە چۆنییەتی بەڕێوەچوونی پەیڕەویان لەیادەوەری بۆنەئاینیەکان، لەکاتی فەتحکردنی ناوچەکان، بەدیار دەکەوێت[٤].

دیارە ئەم ئاینە گەیشتۆتە هەرێمی جەزیرەش، وەدەبێت ڕێژەیەکی لەپەیڕەوانی ئەم ئاینە هەبوو بێت، بۆسەلماندی ڕاستیی ئەمەش، یاقوت ئاماژە ئاتەشگاکانیان دەکات لەشاری ئەربل، تەنانەت ناوچەیەك هەر بەناوی (بیت النار) بووە کە دەبێت مالی ئاگرینی و پەرستگای ئاگرپەرستانی لێ بووبێت[٥]. وەبۆ ڕاستی زانیاریی یاقوت، ناسر خوسرەویش کاتی سەردانی شارەکانی ئەم هەرێمە دەکات، ئاماژە بەکۆمەلەیەك دەکات بەناوی بارسیەکان (البرسیون)، خەریکی کارکردن بوون. ئەوانیش شوێنکەوتەی ئاینی زەردەشتی بوون[٦].

جگە لەمە ئەگەرچی یاقوت بەڕێژەیەکی دیاری کراو باس لەبیروباوەری ئایینی ناوچەکان دەکات، بەلآم بۆ ئەم ئایینە، واتا زەردەشتی بەلگەی تر بەدیار دەخات، کە لەهەرێمی چیاکان شوێنکەوتوانی هەبوون، ئەمیش نموونەیەکی شیعری بۆزیاتر بەزانیاری کردنی کتێبەکەی ئاماژە بە (هرابذة) دەکات[٧].

---

(١)- معجم البلدان، مج١، ص ١٥٩. تەنانەت (ابو الفدا) بەشوێنی لەدایك بوونی زەردەشت دادەنێت. تقويم البلدان، ص٣٩٧.

(٢) - ابن خرداذبه، المصدر السابق، ص ١٠٦؛ ابن الفقيه الهمذاني، المصدر السابق، ص٥٨٢.

(٣) - بروانە ئەم لێکۆلینەوەیە، ل١٣١.

(٤) - معجم البلدان، مج ١، ص ١٢٩.

(٥) — المصدر نفسه، مج١، ص ٥٢٣.

(٦) - ئەوکۆمەلەیە هاوکات لەولاتی ئێران وهندستان دەژین. سفرنامة، ص٧، عبد الرقيب يوسف، المرجع السابق، (اربيل:٢٠٠١)، ج٢، ص١٧٢؛ فايزة محمد عزت، المرجع السابق، ص٦٢.

(٧). فلا قلت فارس منهم نكالا- وقتلنا هرابذ شهرزور معجم البلدان، مج٢، ص١٣٥.

**بەجۆرێك توێژەران بە بەپەیرەوانی ئاینی زەردەشتیەکانیان داناون[(1)]: جگە لەمە شاری دینەوەر، خەڵکەکەی زەردەشتی بوون[(2)].**

**هەریەکە لە ( ابن الفقیه الهمذانی) و (المقدسی) بەر لەیاقوت باسیان لەم بابەتە کردووە، کەچۆن ئەم هەرێمە ژمارەیەکی زۆر لەشوێنکەوتوانی لەخۆگرتووە[(3)].**

**هەروەها لە شاری دبیل واتا لەهەرێمی ئەرمینیا، خەڵکی لەسەرئایینی زەردەشتی هەبوون، چونکە لەکاتی فتوحاتی ئیسلامی، ئاگرپەرستەکان بینراون[(4)]. بەلاّم دوای هاتنی ئاییىنی ئیسلام و بلاّوبوونەوەی لەناوچەکانیان، وەکو (اهل الکتاب) واتا پەیڕەوانی ئایینی ئاسمانی مامەڵەیان لەگەڵ کراوە[(5)].**

**کە ئەمەش لە فەتح کردنی هەرێمی ئازەربایجان دا دەردەکەوێت، کاتێ هەندێ ناوچە لەسەر ئەم ئایینە ماونەتەوە و بەرامبەر بەوە سەرانە (جزیە)[(6)] یان لێ وەرگیراوە[(7)].**

**بەلاّم لە باسی مەسیحیەت دا زیاتر ڕوون کردنەوە لە لای یاقوت بەدیار دەکەوێت، ئەگەرچی باس لەکات وساتی بلاّوبوونەوەی ئەم ئایینە لەناوچەکوردنشینەکان ناکات، بەلاّم تێبینیە سەربەخۆ ڕوون کراونەتەوە لەسەر چەندایەتی بیروباوەڕی ناوچەکان،**

---

(1) - فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص٦٣.

(2) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤٩.

(3) - البلدان، ص٥٠٤؛ احسن التقاسیم فی معرفة الاقالیم، ص٢٩٦.

(4) — معجم البلدان، مج ٢، ص ٤٣٩.

(5) - ابو یوسف، الخراج، ( القاهرة:١٣٥٢هـ)، ص ١٣٠.

(6) - سەرانە: ئەو بڕە پارەیە بوو دەسەپێنرا بەسەر ئەوکەسانەی لەسەر ئاینە ئیسلامیەکان بوون، کە لە ژێر سێبەری حوکمی ئیسلام ژیاون و لەسەر ئاینەکەی خۆیان مابوونەوە بەلام لەسەر ژن ومنداڵ وپیرو پەککەوتەو کەم عەقل ونابینایان و پیاوانی ئاینی قەدەغە دەکرا، بڕەکەشی لەنێوان چل وهەشت تا دوانزەدرهەم بوو، بەپێی چینە کانی کۆمەڵگا. ابو یوسف، المصدر السابق، ص١٢٢؛ فاروق مجدلاوی، الادارة الاسلامیة فی عهد عمر بن خطاب، تقدیم: احمد شلبی، (عمان:٢٠٠٣)، ص ١٩٨.

(7) - معجم البلدان، مج١، ص ١٢٩.

بەجۆرێك، لە زۆر شوێندا ئاماژە بەوە دەکات کە خەڵکەکەی فەلە (مەسیحی/نەسرانیەکان) بوون[١]. لەگەڵ وەسف کردن و ناوهێنانی بونیاتنراوەکانی تایبەت بەئایینی مەسیحی، وەکو کەلیسای شاری ئامەد[٢]. کە لەهەندێسەرچاوە بە گەورە و نەخشەکێشراو وەسف کراوە[٣]. شاری مەیافارقینیش وەك شاری شەهیدانی نەسرانیەکان باسی کردووە[٤]. بێجگە لە دەست نیشان کردنی زۆر لەدێرەکانی، کەشوێنی خواپەرستانی ئەم ئایینەبووە[٥]. تەنانەت هەندێ لەسەرچاوەکانی تر هۆزە کوردیە فەلەکان ناودەهێنن، کەچۆن نیشتەجێبوانی شاری موسل و چیای جودی بوون[٦].

تەنیا بەودێرەی کەلەشاری حولوان بەناوی(غادر) [٧] بەرچاومانی خستووە، دەتوانین لە کتێبەکەی بگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەهەرێمی چیاکان شوێن کەوتوانی ئەم ئایینەهەبوون.

هەروەها هەرلەڕوانگەی ناوبراوەوە، ئایینی مەسیحی یەکێکە لەئایینەکانی دانیشتوانی هەرێمی ئەرمینیا، لەبەر ئەوەی دەڵێت:(( مەسیحیەکان قەڵا و قوڵغیان لەهەرێمی ئەرمینیادا هەبووە))[٨] .

وەکو ئاشکرایە هەر لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام، ژمارەیەکی کوردیش پەیڕەوی ئایینی ئیسلامیان دەکرد، بەڵام لەکاتی فتوحاتی ئیسلامیدا گۆڕانکاریی بەسەر داهاتووە، ڕێژەکە زیادی کردووە. ئەگەرچی ڕووبەڕوونەوە لە هەندێ ناوچەی کوردنشینی

---

(١) - معجم البلدان، مج ١، ص ٣١٦؛ مج ٢، ص١١٢، ص ٢٤؛ مج ٤ ص٤٥٦.
(٢) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٥٦.
(٣) - ناصر خسرو، المصدر السابق، ص ١٠.
(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٣٦.
(٥) - بروانە : پاشکۆی ژمارە (١ ).
(٦) - المسعودی، مروج الذهب، ج٢، ص٣٣٨؛ البكری، المسالك والممالك، ج١، ص٢٦٢.
(٧) - غادر:ئەو دێرە نزیکە لە حولوان لەسەر لوتکە چیایەك هەڵکەوتووە. معجم البلدان، مج٢، ص٥٢٥.
(٨) معجم البلدان، مج٢، ص ١٠٢.

ڕوویداوە[١] . لەکاتی بەڕێوەچوونی پرۆسەی فتوحات یاخود دانانی سەرانە لەسەر هەندێ لەو ناوچانەی کە هەر لەسەر ئایینی پێشوو مابوونەتەوە، بەلاّم ئەمەیان زۆری نەخایاند، یاقوتیش تیشکی خستۆتە سەر چۆنییەتی بەڕێوەچوونی ئەم پرۆسەیە، بەم هۆیەوە ناوبراو سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئەم ئایینە دەست نیشان دەکات[٢] و هەروەها بوونی (مزگەوت و جامع) لە هەندێ شوێندا[٣]، کە وەکو پێگەیەکی خواپەرستی و بەجێ گەیاندنی نوێـژ و وتار خوێندنەوە و تەنانەت دەبێت وەکو شوێنی خوێندن و فێربوونی زانستیش بوبێت.

## تەوەرەی دووەم:

## بــــاری زانـــــســـــتــــی

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە پێناسەی رۆشنبیریی کۆمەڵگا دەکات، هەڵکـەوتنی زانا و زانست خوازەکانە، واتە لە هەر شوێنێك هەڵکەون، ئەوا دیارە ئاستی رۆشنبیریی ئەو کۆمەڵگایە بەرز بۆتەوە، یاقوتیش لە کتێبەکەیدا ئەمە دەخاتەڕوو، بەچەشنێك لـە کۆتایی باسکردنی هەر ناوچەیەك زانا و ناوداری هەڵکـەوتووی شـارەکە دەسـت نیشـان دەکات، کە رەچەڵەکی بۆ شارەکە دەگەڕێنێتەوە، جگە لەناوهێنانی ریزبەندی گێڕەڕەوەکان (رواة)، کـەباس لـە کەسـایتیەکانی شـارەکە دەکـەن[٤]. ئـەو تایبەتمەندییــە لەناوچـە کوردنشینەکانیش دووبارە دەبێتەوە، ناوی ژمارەیەکی زۆر لە زانا زانستی دەخاتەڕوو[٥].

---

(١) - بڕوانە: پاشکۆی ژمارە، (٣).

(٢) - بڕوانە: ئەم لێکۆلینەوەیە:ل١٥٦-١٦٢.

(٣) - بڕوانە: ئەم لێکۆلینەوەیە:ل١٢٩.

(٤) - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: اتحاف الخلان بمعارف معجم البلدان، تقديم: فضيله الشيخ بكر، اعداد و دراسه: محمد العمري، (السعودية: ١٩٩٤)، ج١-ج٢.

(٥) - معجم البلدان، مج ١، ص ٢٢٢، ص ٤٨١؛ مج ٢، ص ١٣، ص ٥٤٥؛ مج ٣، ص ١٥٨، ص ٣٣٩؛ مج ٤، ص ١٣٦، ص ٤٨٨؛ مج ٥، ص ٢٨١، ص ٢٢٣.

بۆیە لێرەدا تیشك دەخەمە سەر چەند بیر مەندێکی زانستی ئەم ناوچانە، بە جۆرێك ناوی شارەکەیان خراوەتە پاڵ ناوەکانیان و بنەچەیان بۆ دەگەڕێتەوە، ئەگەرچی کورتەیەك لە ژیانیانی باسکردووە، وە سەرچاوەکانی بەردەستیشمان گەواهی ئەم ڕاستیە دەدەن.

## یەکەم: لەهەرێمی جەزیرە[1]:

١- (حسن بن بشير الامدي) ناسراو بە ( ابو القاسم):

ئەمە لە خاوەن بەرهەمەکانی شاری ئامێدە، کاری دەستی نووسەری بۆ قازی بەسرە کردووە، لە ساڵی (٣٧٠ك/٩٨٠ ز) کۆچی دوایی دەکات و بەرهەمەکانیشی وەك (الموازنة بين ابي تمام البحتري، المختلف و المؤتلف، في اسماء الشعراء)..هتد[2].

٢- (خضر بن ثروان بن احمد بن ابي عبدالله) :

بەگوێرەی گوتەی یاقوت کە(ابوسعدالسمعانی) لە نزیکەوە چاوی پێکەوتووە، لەو کاتەی کە بە دوای زانست و زانیاری گەڕاوە، لە جەزیرەی ئیبن عومەر لەدایك بووە و لە مەیافارقین پێگەیشتووە، شاعیرێکی لێهاتوو بووە و زانیاری لە بواری (نەحو) هەبووە، لە ساڵی (٥٠٥ك/ ١١١١ز) چۆتە بەغدا و سەردانی مەرو و سەرخەس و نیسابووری کردووە، لەساڵی (٥٥٤ك/ ١١٥٩ز) مردووە[3].

٣- (ابو قاسم عمر بن محمد بن احمد بن عكرمة) ناسراو بە (البزی الجزری).

هەروەکو ( خضر بن ثروان) بنەچەکەی بۆ جەزیرەی ئیبن عومەر دەگەڕێتەوە، ساڵی (٤٧١ك/ ١٠٧٨ز) لەدایك بووە، بەگەریدەیەکی خاوەن بەرهەم دادەنرێت و چۆتە

(١) - معجم البلدان مج١، ص٣٤٠ ص، ٣٨٨؛مج٢، ص١٠٨، ص ١٢٤، ص ٢٠٨؛مج٣، ص٢٦٣؛مج٤، ص٣٢٢.

(٢) - معجم البلدان، مج ١، ص ٥٦؛ ابن القفطي، انباه الرواة، ج ١، ص ص ٢٨٥- ٢٨٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج ٢٦، ص ٤٣٧.

(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ٥٩، ابن القفطي، انباه الرواة، ج١، ص ٣٥٦؛ السيوطي، بغية الوعاة، ج١، ص ص ٥٥١-٥٥٢.

شاری بەغدا و قوتابییەکی زۆریشی پێگەیاندووە، یەکێك لە بەرهەمەکانی (الاسامي و العلل من كتاب المهذب)ە، سالی (٥٦٠ك/ ١١٦٤ز) کۆچی دوایی کردووە[١].

٤- ( حسن بن علی بن سعید بن سعید بن عبدالله بن بندار الدیاریکری الشاتانی ): سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەم کەسایەتیە، بۆ قەڵای شاتانی دیار بەکر دەگەڕێتەوە، سەرەتا خوێندنی لەلای چەند زانایەکی شافیعی بووە، پاشان بۆتە شاعیرێکی بەناوبانگ و پڕ بەهرە، سەردانی شاری بەغدای کردووە، کاتێ بەخزمەت سەڵاحەدینی ئەیوبی دەگات هۆنراوەی بۆ گوتووەو بەجۆرێك هۆنراوەکەی خۆی لە ستایش کردنی ناوبراو بینیوەتەوە، لە سالی (٥٧٢ ك/ ١١٧٦ز) کۆچی دوایی کردووە[٢].

٥- ( ابو سعادات بن المبارك بن ابی الكرم بن الاثیر الجزری )، ناسراو بە (مجدالدین): ئەمەش یەکێکە لەو خاوەن زانیاریانەی لە سالی (٥٥٤ك/١١٥٩ز) لە جەزیرەی ئیبن عومەر لەدایك بووە، پاشان چۆتە موسل وبە خاوەنی بەرهەمی بەپێز دادەنرێت، بەتایبەتی لە بواری تەفسیر کردنی قورئان، وەکو (جامع الاصول في احادیث الرسول، النهایة في غریب الحدیث)، لەکۆتایدا گەڕاوەتەوە زێدی کۆنینەی خۆی و لە سالی (٦٠٦ك/١٢١٠ز) ماڵئاوایی لە ژیان دەکات[٣].

٦- ( مروان بن علی بن السلامة طنزی) ناسراو بە (حجة الدین):

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨، ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٣، ص ص ٤٤٤- ٤٤٥.

(٢) - معجم البلدان، مج ٣، ص ٣٠٤، السبكي، المصدر السابق، ج٧، ص ص ٦١-٦٢. بۆ زیاتر زانیاری بروانە : ابن خلكان، مج٢، ص ص١١٣-١١٤.

(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٨، ابن خلكان، المصدر السابق، ج٤، ص ١٤١، ص ١٤٣.؛ ابن القفطي، انباة الرواة، ج ٣، ص ٢٥٧؛ابن اللمش، تاريخ دنيسر، تحقيق: ابراهيم صالح، (دمشق: ١٩٨٦)، ص ص ٩٧- ٩٩.

بەگوێرەی نازناوەکەی(طنزة) [١] یەکێکە لەزانست پەروەرەکانی هەرێمی جەزیرە، بەلاَم چۆتە بەغدا بۆ زانست، لەسەر دەستی زانا بەناوبانگەکانی سەردەم خوێندوویەتی، پاشان گەڕاوەتەوە ناوچەکەی و لە قەلاَی (فنك) نیشتەجێ بووە، هەندێ بەرهەمی بەردەستی پوختە کردووە و کورتی کردۆتەوە، لە (٥٤٠ك/ ١١٤٥ز) کۆتایی بەژیانی هاتووە[٢].

٧- ( اسعد بن يحيا موسا بن المنصور) ناسراو به (بهاء السنجاري):-

ناوبراو ڕێ و ڕەچەلەکی دەچێتەوە، سەر شاری سینجار لە ساڵی (٥٣٣ك/ ١١٣٨ز) لە دایك بووە، شاعیرێکی بەتواناو بڕوادار بووە بە کەسایەتییەکی قسەخۆش و ڕووح سوك وەسف کراوە، لە سەردانی بۆ شاری موسل چاوی بە ئەمیرەکانی ناوچەکە کەوتووە، لە ساڵی (٦٢٢ك/ ١٢٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە[٣] . مێژوونوسانیش یەکێك لە هۆنراوەکانی بەنموونە دەهێنەوە [٤] .

هەروەها یاقوت ناوی (ابن الاثير)یش دەهێنێت و بە مێژوونووس باسی دەکات [٥]، لە شاری هەولێریش (ابن المستوفی الاربلی)، بە کەسایەتییەکی زانا وەسف دەکات[٦]، جگە لەمە نازناوی شاری مەیافارقین، کە (الفارقی) بووە، خراوەتە سەر چەند زانایەکی پڕ زانیاری[٧]. بەلگەش بۆ ئەمە یەکێك لە زانایانی لێهەڵکەوتووی ئەم شارە وەکو ( محمد بن احمد بن ابو بكر شاشی الفارقی ) ناسراو بە (فخر

---

[١] - ناوچەیەکە لەجەزیرەی ئیبن عومەر. معجم البلدان، مج٤، ص٤٣.

[٢] – معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٤، السبكي، المصدر السابق، ج٧، ص ٢٥٩.

[٣] - معجم البلدان، مج ٣، ص ٢٦٣، ابن خلكان ج١، ص ٢٤١؛ ابن اللمش، المصدر السابق، ص١٥٥.

[٤] - ياضبية الهرمين من مصر على الر- بع السلام وان تقويض او عفا . ابوشامه، المصدر السابق، ج٢، ص ٢٥٨.

[٥] - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٨. سەبارەت بەژیانی بڕوانە: بەشی یەکەمی ئەم لێکۆلینەوەیە، ل٤٧.

[٦] - معجم البلدان، مج١، ص ١٣٨. بڕوانە: ئەم لێکۆلینەوەیە، ل١٦، پەراوێزی ژمارە (٣ ) .

[٧] - معجم البلدان، مج٢، ص ٥٩.

الاسلام) له سالى (٤٢٧ك/ ١٠٣٥ز) له‌دايك بووه و له سالى (٥٠٧ك/ ١١١٣ز) كۆچى دوايى كردووه[١].

٨- (شيّخ عدي بن مسافر بن اسماعيل بن موسى بن مروان الشافعي)ناسراو به (شيخ الاكراد):-

بنج وبناوانى شيّخ عوده‌ى بۆ قه‌لاّكانى هه‌كارى له شارى موسلّ ده‌گه‌ڕێته‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ى كه‌سايه‌تيه‌كى ئاين په‌روه‌ر بووه به ڕيش سپى و پياو ماقولاّنى ناوچه‌كه دانراوه، زياتر خۆى خوليای بوارى زاستى ئاينيه‌وه بووه.، له نێوان سالاّنى ( ٥٥٥ -٥٥٧ ك/١١٦٠-١١٦١ز ) كۆچى دوايى كردووه[٢].

٩- (عمر بن ثابت) ناسراو به( ابو قاسم الثمانيني): -

بۆ ناساندى ئه‌م زانايه، ياقوت سه‌ره‌تا بنه‌چه‌ى بۆ گوندى( ثمانين)[٣] ده‌گه‌ڕێنێته‌وه، پاشان به پێشه‌وايه‌كى به متمانه‌و ئه‌ديبێكى پێگه‌يشتووى خاوه‌ن به‌رهه‌مى وه‌كو (المفيد في النحو، كتاب شرح التصريف الملوكي) باسى لێوه‌كردووه، له سالى (٤٤٢ ك/١٠٥٠ز ) مردووه[٤].

١٠ – (عبدالقادر بن عبدالله الرهاوي) :-

---

(١) - الصفدى، المصدر السابق، ج٢، ص ص٥٣-٥٤.

(٢) - معجم البلدان، مج٥، ص٢٨، الشعراني، الطبقات الكبري المسماة ب(لواقح الانوار في طبقات الاخيار)، تحقيق : سليمان صالح، ( بيروت : ٢٠٠٥)، ص ص٢٠٣-٢٠٤ . بۆ زياتر زانيارى بڕوانه : ابن خلكان، المصدر السابق، مج ٣، ص٢٥٤ .دياره ئه‌م زاته يه‌زيديه‌كان به‌شيّخى خۆيان داده‌نێن و لايان پيرۆز بووه‌و ته‌نانه‌ت ئيزيديه‌كان دابه‌ش كراون بۆ سه‌ر سێ چين (شيخ، البير، المريد) ئه‌م دابه‌ش كردنه‌ش شيّخ عوده‌ى كردوويه‌تى مه‌به‌ستى چاكسازيه له‌ئاينى يه‌زيدى. عدنان زيان فرحان، الكرد الازيديون فى اقليم كردستان، دراسة سياسية واقتصادية واجتماعية(١٨٠٠-١٩١٨م)، (السليمانية:٢٠٠٤)، ص٢٣٦.

(٣) - گوندێكه له‌باكوورى موسل نزيك جه‌زيره‌ى ئيبن عومه‌ر، يه‌كه‌م شوێنى نيشينگه‌ى كه‌شتى نوح پێغه‌مبه‌ر(د.خ) بووه. معجم البلدان، مج٢، ص٨٤.

(٤) - المصدر نفسه، مج٢، ص٨٢، معجم الادباء، ج٤، ص٤٦٣ .

ئەمەش یەکێکە لەو زاتانەی بەدوای شوێن پێی زانست گەڕاون، لە موسل پێگەیشتووە، لە روهاش ساڵی( ٥٣٦ك/١١٤٣ز) لە دایك بووە، توانیویەتی لە گەشتە زانستیەکانی بە جەزیرە و شام و میسر بگات، بەڵام دوا مەنزڵگای ژیانی شاری موسل بووە، تاساڵی ( ٦١٢ ك /١٢١٥ز) کۆچی دوایی دەکات[1].

## دووەم// لەهەریمی چیاکان[2]

١١- ( ابو بكر عمر بن سهل بن اسماعيل بن جعد حافظ القرمسينى) : ناسراو بە (كلو):

خەڵکی شاری قەرمیسینە(کرمانشا)، بەڵام لە ساڵی (٣١٧ك/ ٩٢٩ز) چۆتە هەمەدان، دواتر دووبارە ساڵی(٣٢٩ك/ ٩٤٠ز) گەڕاوەتەوە شوێن و زێدی لەدایك بوونی، متمانە و باوەڕی لەلای خەڵك دورست کردووە، ساڵی (٣٣٠ك/٩٤١ز) بۆدواجار پێڵوی چاوەکانی لێك ناوە[3].

١٢-( عبد الرحمن بن حمدان جلابى الهمذانى):

ئەمە لە زاناخوازەکانی ناوچەی (بیزنروذ)ە، کە یەکێك لە ناحیەکانی شاری هەمەدان، هەر لەم شارەش پۆست وپلەو پایەی وەرگرتووە، جگە لەمە گێڕەوەیەکی (راوی) لێهاتوو ڕاستگۆ و ڕووداوی زۆر بووە، خەریکی گەشت وگوزاریش دەبێت. لە ساڵی (٣٤٢ك/ ٩٥٣ز) کۆچی دوایی دەکات[4].

١٣-(محمد بن عثمان بن زيرك) ناسراو بە (ابو الفضل القومسانى):

---

(١) - معجم البلدان، مج٣، ص١٠٦، ابن الشعار الموصلي، ج١، ص١٥٧ .

(٢) - بۆنمونە بڕوانە: معجم البلدان، مج١ص١٦٤؛مج٢، ص١٨٤؛مج٣، ص ٧٨، ص ٣٧٦؛مج٤ ص٤٤، ص ٤٣٩.

(٣) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٣٣٠، السمعاني، المصدر السابق، ج٤، ص ٤٧٩.

(٤) - معجم البلدان، مج١، ص ٤١٠، معجم الأدباء، ج ٢، ص ٢٣؛ الذهبي، تاريخ الأسلام، ج ٢٥، ص ٢٦٤.

ڕێ و ڕەچەڵەكی ئەم زانایە دەچێتەوە سەر گوندی (قومسانی) سەر بەشاری هەمەدان، چونكە بنەچەكەی نازناوی قومسانی هەڵگرتووە، كەئەمەش بۆشوێنی نیشتەجێبوونیان دەگەڕێتەوە، لە ساڵی (٣٩٩ك/ ١٠٠٨ز) لەدایك بووە، وەكو پێشەنگێك و كەسایەتییەكی ناسراوی سەردەمی خۆی بووە، چالاكانە توانیویەتی شارەزایی لە بواری زانستی جۆراوجۆردا وەربگرێت، لە ساڵی (٤٧١ك/١٠٧٩ز كۆچی دوایی كردووە.[(١)]

١٤- ( ابو یعقوب بن یوسف بن ایوب الهمذانی) :

یەكێك لە گوندەكانی هەمەدان (بوزنجرد) ە، وادیارە كەسایەتی لێهاتووی لێهەڵكەوتووە، (یوسف بن ایوب)یش یەكێكە لەوانە، ساڵی (٤٤٠ك/ ١٠٤٨) لەدایك بووە، بە وتارخوێنێكی خاوەن كەرامەتی ئەم ناوچەیە وەسف كراوە، هەندێ لە موریدەكان لەسەر دەستی پەروەردە كراون، چۆتە شاری بەغدا و لە قوتابخانەی (نظامیة) لەم شارە وانەی وتۆتەوە و، پاشان چۆتە مەرو ساڵی (٥٣٥ك/١١٤٠ز) هەر لەوێش ساتەكانی ژیانی كۆتایی پێ دێت[(٢)].

١٥- (محمد بن علی بن حسن ابوعلاء الهمذانی):

شاعیرێكی شاری هەمەدانە و خولیای هۆنراوە و شیعر بووەو كە ئەمەش دەچێتە مەیدانی زانستی مرۆڤایەتییەوە، سەرچاوەكان ئاماژە بەوە دەكەن، كە لە بواری مێژوو و ڕەچەڵەكناسی و تەفسیركردن دەستی هەبووە، بەرهەمەكانی هێناوەتە مەیدان، وەك (زاد السیر فی خمسون جزء، الوقف الابتداء فی القرآن) لە نێوەندی ساڵانی (٤٨٨-٥٦٩ك/١٠٩٥-١١٧٥ز) ژیاوە[(٣)].

١٦- ( المبارك بن حسن بن احمد بن علي بن فتحان بن منصور الشهرزوري):-

---

(١)- معجم البلدان مج ٤، ص ٤١٤، ابن عماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٣، ص ٣٤١.

(٢) - معجم البلدان، مج١، ص ٥٠٧، ابن العماد الحنبلي، المصدر السابق، ج ٤، ص ١١١؛ الشعراني، المصدر السابق، ص ٢٠٠.

(٣) -معجم البلدان، ج ٥، ص ٤١٧، السیوطي، بغیة الوعاة ، ج١، ص ٤٩٤؛ الداودي، المصدر السابق، مج١، ص ص ١٢٨-١٢٩.

وەکو ئاشکرایە شاری شەهرەزوور ئەندامی کاراو بەتوانای لەهەموو بوارێك لێهەڵکەوتووە، لە بواری زانستیش بێبەش نەبووە، ئەوەتا یاقوت (مبارك بن حسن) دەیخاتە ریز کەسایەتی مەزن و بەهێزو زانست پەروەرەکانی ئەم شارە و لە ساڵی( ٤٦٢ك ١٠٦٩ز)لە دایك بووەو لە (٥٥٠ ك/١١٥٥ز) لە بەغدا کۆتایی بەدوا سەرنجی ژیانی هێناوە، کتێبێکیشی بەناوی ( المصباح في القراءات) هەبووە[1].

## سێیەم// لە هەرێمی ئاران و ئازەربایجان و ئەرمینیا [2]:

**١٧- ( ابو الفضل اسماعیل بن علی بن ابراهیم الجنزوی):**

یەکێك لەو کەسانەی ناوەکەی لاپەڕەکانی مێژووی پێ ڕەنگ کراوە و لە گۆڕەپانی زانستی قەڵەم بازیدا دەوری هەبووە، ئیسماعیل کوری عەلی گەنجەوی بووە، لە ساڵی (٤٨٩ك/ ١٠٩٥ز) لەدایك دەبێت و پێگەیشتووە لە (گەنجە) زانیاری لە بواری فیقهی و فەرموودە وەرگرتووە، چۆتە شاری بەغدا، لە ساڵی (٥٨٨ك/١١٩٢ز) ماڵئاوایی لەژیان کردووە[3].

**١٨ - ( ابو معالی عبد الملك بن احمد البیلقانی):**

یاقوت ئەسڵی ئەم زانایە دەباتەوە سەرشاری بەیلەقان، گەریدەیەکی بەتوانا بووە، بۆ زۆر وڵاتانی ئیسلام گەڕاوە، بەتایبەتی خوراسان و عێراق و بەغدا، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی، بۆتە وانەبێژێك بۆ ئەوانەی هەوڵی فێربوونی زانستیان دەدا[4].

**١٩- ( عمر بن عثمان کنجی ) ناسراویە (ابی الحفص):**

---

(١) - معجم البلدان، مج٣، ص٣٧٦، معجم الادباء، ج٥، ص٣٧ .

(٢) - معجم البلدان، مج٢، ص ٣٧، ص١٧٢، ص ٤٣٩ ؛مج٣، ص٣٨٢.

(٣) -المصدر نفسه، ج٢، ص ١٧٢، السبكي، المصدر السابق، ج ٧، ص ص٢- ٥٣؛اسماعيل شكر، المرجع السابق، ص ١٣٤.

(٤) -معجم البلدان، مج٢، ص ٥٣٣.

ئەدیبێکی مەزن و خواپەرست بووە، چۆتە شاری هەمەدان و بەغدا، بەدوای زانیاریدا گەڕاوە، لە خوراسانیش بینیویانە دواساتەکانی ژیانیشی لە شاری (مەرو) دەبێت، سالّی (٥٥٠ك/ ١١٥٥ز) پێڵووی چاوی لێکناوە [1].

٢٠- (ابو حسن علي بن محمد بن منصور الارجيشي ):-

ئەم کەسایەتیە لە ئەرجیش هاتۆتە دونیاوە، خودی یاقوت لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاری حەلەب، کە شوێنی نیشتەجێبوونی بووە، چاوی پێکەوتووە [2]. بەلاّم سەرچاوەکانی بەردەست ئاماژە بەمێژووی ژیانی ناکەن.

هەروەها یاقوت جگە لەوەی زانا و ناودارانی ناوچەکان دەست نیشان دەکات، کەجێ پەنجەیان لەبواری مێژوودا هەیە، وەسفی هەندێ لە ناوچەکانیش بەگشتی دەکات، بەوەی زانایان تیا هەلّکەوتووە [3]. یا بە خاوەنی قەومێکی زیرەك باسیان دەکات [4]. لەگەلّ ئەمەشدا بوونی فێرگە (المکتبات) لە بنیاتنراوەکانی هەندێ ناوچە بەتایبەتی شاری ماردین بەدیار دەکەوێت [5]. جگە لەوەی ڕوویەکی شارستانی وبیناسازی ناوچەکان پیشان دەدات، بەلاّم زیاتر لایەنی زانستی ورۆشنبیری پێوە پێناسە دەکرێت. بەگشتی سیمای کولتوری کۆمەلّگا بەدیار دەخات.

---

[1] – المصدر نفسه، مج٢، ص ١٧٢، ابن القفطي، انباه الرواة، ج٢، ص ٣٢٩.
[2] - معجم البلدان، مج ١، ص١٤٤، السبكي، المصدر السابق، ج١٠، ص٣٦٩
[3] - معجم البلدان، مج١، ص ١٥٠، ص ١٦٠، ص ٣٣٣.
[4] - المصدر نفسه، مج ١، ص ٣٨٠.
[5] - المصدر نفسه، مج٥، ص٣٩.

## تەوەری سێیەم:

## بارودۆخی سیاسی:

گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان لەهەر بابەتێکدا بەتایبەت ئەو بابەتانەی پەیوەست بن بەباس کردنی پێگە ومەقامی نەتەوەکان، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کەلایەنی سیاسی ڕۆڵێکی گرینگی هەبووە، لە ڕووی مانەوەو نەمانی ئەو نەتەوانەو بێ هێز بوونیان، چونکە ئەو ململانێیەی کە لە مێژوودا هەبووە، هەمیشە بەسەر کەوتنی بەهێزەکان کۆتایی هاتووە، ئەگەر لەسەر حەقیش نەبووبن.

کوردیش لەو ڕەوتە مێژووییەوە لەناوچەکانی خۆیان تووشی سڕینەوەی نەتەوەیی زۆر هاتوون، بەتایبەت لە ڕوبەڕووبونەوەی دوژمنانی سوپا گەورەکان، بەلآم ئەوەی گرینگە هێزی مانەوە لەناخی ڕۆڵەکاندا وایکردووە هەربمێنێتەوە و ئاسەواریان ون نەبێت، کە لەم تەوەرەیە ڕوون دەبێتەوە، بەجۆرێك لەسەرەتای بلاْوبونەوەی ئیسلام، کورد خۆی حوکمرانی ناوچەکانی خۆی نەکردووە، هەروەها ئەمیرە کوردیەکان بوونەتە ڕەمزێکی سەرکەوتوو بۆ وەسف کردنی ناوچەکان لەلای یاقوت، دواتریش چۆن ناوچەکان ڕوبەڕووی دەسەلآتە زلهێزەکان بوونەتەوە .

### یەکەم// پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامی لە هەرێمە کوردنشینەکان:

یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی کە پەیوەندی بە مێژووی رامیاریی ناوچە کوردنشینەکانەوە هەیە، چۆنییەتی بەرێوەچوونی پرۆسەی فتوحاتە، ئەو میتۆدەی یاقوت پابەندی بووە بۆ گێڕانەوەی ئەم بابەتە بەگشتی لە چەند خاڵێك خۆی دەبینێتەوە.

١- لەو کاتەی سوپای ئیسلام بەرەو ناوچە کورد نشینەکانەوە جولآوە، تووشی ڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ ئەو دەوڵەتە زلهێزانەی کە حوکمی ناوچەکەیان دەکرد هاتووە، وەکو ڕۆم و فارس.

٢- فتوحات وەك لەسەرچاوەکانی تر دەردەکەوێت ماوەیەکی درێژی خایاندووە، بەڵام لە (معجم البلدان)دا، تەنیا ئاماژە بە سەرەتای فتوحاتی سەردەمی خەلیفە (عومەر کوڕی خەتاب) و (عوسمان کوڕی عەفان) دا (ڕەزای خوایان لەسەر بێت) کراوە.

٣- هەروەکو هەموو بەرنامەکانی تر لە گێڕانەوە و خستنەڕووی زانیارییەکان چەند دەقێك دەخاتە بەرچاو، کە لە چەند سەرچاوەیەکی وەرگرتووە هەندێکیان چەند دێڕێك وەردەگرێ و بەراوردیان دەکات، بەتایبەتی ئەو سەرچاوانەی کە پەیوەستن بەم بابەتەوە، ئەو جیاوازی و بەراوردکردنەش لە زۆربەی شوێندا بۆ ساڵی مێژوویی ئەو ئەمیرەی کە فەتح کردنی ناوچەکەی پێ سپێردراوە، دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە کاتێ زانیاری وەرگرتووە لەو سەرچاوانەی کە هاوکات لەبەردەستن، دەقاودەق زانیارییەکەی گواستۆتەوە، دوای بەراورد کردن ئەوەم لێ بەدی کردووە.

٤- خاڵە گرینگەکانی باروودۆخی جەنگ لە ناوچە کوردنشینەکاندا، سوپای موسوڵمانان لە چەند ناوچە تووشی ڕووبەڕووبوونەوە هاتووە، بە پێچەوانەشەوە ڕێکەوتن و (صلح) لە نێوان سوپای موسوڵمانان و خەڵکانی چەند ناوچەیەك ئەنجام دراوە، تەنانەت هەندێ لەم ڕێککەوتنانە بە گرنگ سەیرکراوە، یاقوت چەند جارێك دووبارەی کردۆتەوەو ناوچە هەیە تەنیا ناوی ڕێکەوتنەکەی لێ هێناوە بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەکی تر بکات[1].

٥- باس لە فەتح کردنی هەموو شارەکان یەکە بە یەکە ناکات.

### أ - لە هەرێمی چیاکان:

یاقوت لەدەستپێکردن بۆفەتحی ئەم هەرێمە، ئەمە دەخاتە ڕوو کەسوپای موسوڵمانان پاش شاری جەلولا بەرەو ئەم هەرێمە بەڕێکەوتوون. بەبێ ئەوەی باس لە گرینگی وچۆنیەتی فەتحکردنی جەلولا بکات، کەناوی شارەکەی بۆگەراندۆتەوە[2]، بەجۆرێك لەساڵی(١٦ك/٦٣٧ز) چۆن موسوڵمانان گەورەترین سەرکەوتنیان بەست هێناوەو

---

[1] - بڕوانە : پاشکۆی ژمارە (٣ ).

[2] - بڕوانە : ئەم لێکۆڵینەوەیە، ل٩٨.

فارسەکانیش تووشی نوشوستیەکی گەورە هاتوون، جگە لەوەی دەرگا والآ بووە بۆفەتح کردنی شارەکانی هەرێمی چیاکان[١].

سەبارەت بەفەتحکردنی شاری حولوان بەبێ شەڕ، بەسەرکردایەتی (جریـرین عبداللـە البجلی)[٢] فەتح کراوە[٣]، پاشان موسوڵمانەکان بارەگای گشتیان تێدا داناوە و نیشتەجێ بوون، لە کتێبی ناوبراودا ساڵی فەتح کردنەکەی (١٦ك/٦٣٧ز) دەستنیشان نـەکردووە، هەروەها هیچ لە بیروڕای سەرچاوەکانی نەخستۆتەروو دەربارەی جۆری فەتح کردنەکـەی، کەهەندێکیان جیاوازیان لەگەڵ زانیـاری نـاوبراودا بـەوەی شـەر ڕوویـداوە، جگـە لـە سەرکردایەتی سوپایەکە[٤].

پاشان بۆ شاری قەرمیسین(کرماشا) و دینەوەر چوونە و شاری قەرمیسینی بە ئاشتی فەتح کردووە[٥]، بەلآم یاقوت درێژەی بەباسی فوتوحـات نـەداوە، تەنانـەت سـەبارەت بەشاری دینەوەر بێدەنگ بووە. ئەگەرچی تەنها لەم دێـرەی سـەرەوە بەدیاردەکـەوێت، کەلەم شارە موسوڵمانان تووشی ڕووبەڕووبونەوە هاتوون، لەئاماژەی بۆشاری قەرمەسـین بەئاشتی بووە، دەبێت ئەو بەشەر بوو بێت. سەرچاوەکانی تـریش جـەخت لەسـەر ئەمـە دەکەنەوە، وە( ابوموسا الاشعری) پێـی هەڵسـاوەو چـەند ڕۆژێکـی خایەنـدووە، دواتـر بەسەپاندنی سەرانە لەسەر خەڵکەکە کۆتایی هاتووە[٦].

---

[١] - ابن الاعثم الكوفي، ، كتـاب الفتـوح، (بيروت:د/ت)، ج١، ص٢٧١؛ ابـن خلـدون، تـاريخ ابـن خلدون، ج٢، ص ص٥٣٨-٥٣٩؛ محمد فـرج، الفـتح العربـي العـراق وفـارس، تقـديم: احمـد حسـن الباقري، ( القاهرة:١٩٦٦)، ص٢١١.

[٢] - بڕوانە : الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٤، ص ص١٨٥-١٨٨.

[٣] - بڕوانە: الصفدي، المصدر السابق، ج١١، ص ص ٥٧- ٥٩.

[٤] - خليفة بن خياط، تاريخ خليفـه ابـن خيـاط، تحقيـق: مصـطفى نجيـب، حكمـت كشـلي، (بـيروت: ١٩٩٥)، ص٧٧. هەندی لەسەرچاوەکان ( قعقاع بن عمرو ) یان بە سەرکردەی سوپای ئەم ناوچەیە داناوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: احمد ميرزاميرزا، المرجع السابق، ص٧٩.

[٥] - معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٩١. دەقاودەق زانیارییەکە لە (البلاذري) دەبینرێت، فتوح البلدان، ص ٢٩٩

[٦] - البلاذري، المصدر السابق، ص٣٠٤.

هەروەها لە ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز) سەعد كوڕی ئەبی وەقاس سوپایەكی ئامادە كردووە، بەسەركردایەتی (ضرار بن خطاب الفهری)[1] بەرەو ماسەبەزان ناردووە و فەتحی كردووە فارسەكانیشی تێكشكاندوە[2].

گەورەترین فەتح كردنی ئەم هەرێمە، جەنگی مێژووی ئیسلام لەكاتی فەتح كردنی شاری نەهاوەند ڕوویداوە، بەڵام یاقوت تەنیا باس لە ڕیزبەندی سەركردە سوپاییەكان و ساڵی فەتح كردنی (٢١ك/٦٤١ز) دەكات، كە چۆن سەرەتا بە جەنگ بووە، پاشان سوڵحیان كردووە، لەگەڵ كوژرانی (نعمان بن مقرن المزنی)[3] كەسەركردایەتی یەكەمی سوپای كردووە[4]. بەبێ دیاریكردنی ڕێژەی سوپای هەردوولاو چارەنوسی سوپای دوژمنان كەفارسەكان بوون، لە سەرئەنجامی ئەم فەتح كردنە بەكوێ گەیشتووە؟[5].

بەڵام شەش مانگ دوای شەهید كردنی خەلیفە عومەر لە ساڵی (٢٤ك/٦٤٤ز) موغەیرە كوڕی شعبە بەرەی جەنگی شاری هەمەدانی گرتۆتە دەست[6]. بەڵام لەڕایەكی تر، كە دەخاتە ڕوو كەوا موغەیرەی والی كوفە لە ساڵی (٢٣ك/٦٤٣ز) جەریر كوڕی عەبدوڵڵای ڕاسپاردووە، بۆ فەتح كردن[7]. كەواتە شاری هەمەدانیان لەسەردەمی خەلیفە عومەر یان عوسمان فەتح كردووە، یاخود ڕەنگە دووبارە بوبێتەوە. (خلیفه بن خیاط)یش لەسەركردایەتی كردنی بەرەی جەنگ جیاوازی لە ڕایەكانی خستۆتە ڕوو، ئەگینا ساڵی (٢٤ك/٦٤٤ز) بە ساڵی فەتح كردنی ئەم شارە داناوە[8].

---

(١) - بروانە: الصفدي، المصدر السابق، ج ١٦، ص ص ٥٩- ٢١٠

(٢) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١.

(٣) - بروانە: الذهبي، تاريخ الاسلام، مج ٣، ص ٢٣٩.

(٤) - معجم البلدان، مج ٥، ص ص ٤٩- ٣١٤.

(٥) - بروانە: البلاذري، المصدر السابق، ص ص٣٠٠-٣٠٤؛ ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص٥٦.

(٦)- معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١٠؛ ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج٢، ص٥٥٩

(٧) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٤١٠ .

(٨) - تاريخ خليفة، ص ٩٠؛البلاذري، المصدر السابق، ص ٣٠٦.

## ب- له هەرێمی جەزیره:

سەرەتا له باسی فتوحاتی ئەم هەرێمه و شارەکانی به جەزیرەی ئاقور دەست پێ دەکات، ڕایەکی خستۆته ڕوو که له ساڵی (١٧ك/ ٦٣٨ز) له سەردەمی خەلیفه عومەر (ڕەزای خوای لێبێ) بەسەرکردایەتی (سعد بن ابی وقاص)[1] بۆ (عیاض بن غنم)[2] ی نووسیوه و ڕایسپاردووه بۆ فەتح کردنی ئەم هەرێمه، توانیویەتی فەتحی بکات لەگەڵ خەڵکەکه ڕێك بکەوێت، وه بەشێوەیەکی ئاسان بەڕێوەچووه، چونکه ئەم هەرێمه کەوتۆته نێوان دوو هەرێمی عێراق وشام بنکەی موسڵمانەکانی لێ بووه[3].

بەڵام له (البلاذری) وەرگرتووه، که خەلیفه (عیاض)ی[4] دەست نیشان کردووه لەوکاتەی (ابو عبیدة الجراح)[5] له شام بووه[6]، لێرەدا یاقوت ئەوەمان بۆ یەکلاناکاتەوه کەئایا سوپاکه له ولاتی شامەوه بۆفەتح کردن گەیشتۆته، جەزیره، یاخود له ڕێگەی عێراقەوه، واتا ئەویەکارهێنانەی سەرچاوەکان بۆ بەدیار خستنی ڕایەکانه، نەك بۆ یەکلاکردنەوەو شیکردنەوەی زانیاری و دەرئەنجامەکان لەسەر ئەم بابەته.

پاشان زانیارییەکانی (الواقدی) (م: ٢٠٧ك/٨٢٢ز)[7] خستۆته ڕوو به جۆرێك هاوڕایه که ئەم هەرێمه له ساڵی (١٨ ك/٦٣٩ز) کاتێك فەتح کراوه ئەبو عوبەیده به نەخۆشی مردووه، خەلیفه (عیاض) ی دەست نیشان کردووه بۆدرێژەدان به فەتح کردن[8]. بەڵام

---

(١) - بڕوانه: الصفدي، المصدر السابق، ج١٥، ص٩٠؛الشعراني، المصدر السابق، ص ٣٥.
(٢) - بڕوانه: الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٣، ص ٢١٦.
(٣) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٧.
(٤) - فتوح البلدان، ص ١٧٦.
(٥) - بڕوانه: الذهبي، تاريخ االسلام، ج٣، ص ص ١٦٧- ١٧١؛ الشعراني، المصدر السابق، ص ٣٦.
(٦) - معجم البلدان، مج٢، ص ١٣٧
(٧) - الواقدي: فتوح الشام، تحقيق: عبداللطيف عبدالرحمن، (بيروت: ٢٠٠٥)، ج٢، ص ٨٩.
(٨) - معجم البلدان، مج ٢، ص ١٣٨

زۆربەی زانیاریی سەرچاوەكان لەسەر ئەمە كۆكن، كە سوپاكە بە پاڵپشتی سوپای شامەوە بۆ هەرێمی جەزیرە بەڕێكەوتووە. [1]

شارەكانیش، لەساڵی (١٧ك/٦٣٨ز) شاری رەقە بەسەركردایەتی سەركردەی ناوبراو فەتح كراوە[2]، هەمان سەركردەش لە ساڵی (٢٠ك/ ٦٤٠ز) شاری ئامێدی بەشێوەیەك فەتحكردووە، كە كوشتاری تێدا ڕوودراوە، پاشان ڕێكەوتن لەگەڵ خەڵكەكە كراوە، كە هاریكاری لەگەڵ ئیسلامەكان بكەن بۆ چاكردنەوەی پردەكان.[3] كەچی لەهەندێ سەرچاوەدا ( خالید بن ولید)[4] بەیەكێ لەو سەركردە سوپایانە دادەنرێت، كە ئەم شارەی فەتح كردووە[5].

شاری حەران و (راس كیفا)[6] وداراو ماردین بە پەیڕەوكردنی ڕێكەوتنی روها (صلح رها)[7] بەبێ هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەك فەتح كراون [8] ئەگەرچی ئاماژە بەدەقی ڕێككەوتنەكە لە شاری ڕوهاشدا ناكات[9].

بەڵام لە نەسێبین عەیاز كوڕی غەنەم فەرمانی كردووە، كە سوپای مەوسوڵمانان ئابڵوقەی دەروازەی شارەكە بدەن و داوای یارمەتی لە دەسەلاتداری شام سەردەمی خەلیفە عوسمانی كوڕی عەفان كراوە، پاشان ڕێككەوتوون[10]، بەڵام (خلیفة بن خیاط)

---

(1) - ابن الاعثم الكوفي، المصدر السابق، ج١، ص٣٢٥. بۆزیاتر زانیاری بڕوانە: فائزة محمد عزت، المرجع السابق، ص ص ٦٠-٨٩.

(2) - معجم البلدان، مج٣، ص٥٩.

(3) - المصدر نفسه، مج١، ص ص ٥٦-٥٧.

(4) - بڕوانە: الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٣، ص ص٢٣٠-٢٣٣.

(5) - الواقدي، المصدر السابق، ج٢، ص١٤٤.

(6) - راس كیفا، ناوچەیەكە لە جەزیرە نزیك حەران: . معجم البلدان، مج٣، ص ١٤

(7) - دەربارەی دەقی ڕێكەوتنەكە بڕوانە:البلاذري، المصدر السابق، ص ١٧٨.

(8) - معجم البلدان، مج٣، ص ١٤، مج٢، ص ٢٣٥، ص٤١٨، مج٥، ص٣٩.

(9) - المصدر نفسه، مج٣، ص ١٠٦ .

(10) - معجم البلدان، مج ٥، ص٢٨٨.

(م:٢٤٠ك/٨٥٤ز)[١] بۆ سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابی دەگەڕێنێتەوە. وەلە ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز) هەمان سەرکردەبە فەتحکردنی شاری مەیافارقین بەشەڕ فەتحی کردووە [٢].

وە دەبێ تێبینی ئەوەبکەین، کاتێك یاقوت ئاماژە بەوە دەکات :(( کەهەرێمی جەزیرە بەگشتی لەسالی(١٩ ك/٦٤٠ز)فەتح کراوە)) [٣] واتا بەشێوەیەك بۆسەردەمی خەلیفە عومەری کوری خەتاب دەگەرێتەوە، کەچی فەتحی شاری نەسێبین بۆ سەردەمی خەلیفە عوسمان دەگەرێنێتەوە. بەلاّم لەوانیە ئەم شارە بۆجاری دووەم لەسەردەمی خەلیفە عوسمان ئەنجام درابێت، کەواتە بەیەکبەستنەوەی بۆ گێڕانەوەو وەرگرتنی بابەتەکان نەکردووە.

## ج- لە هەرێمی ئازەربایجان و ئاران و ئەرمینیا

دەبینین لە هەرێمی ئازەربایجان و شارەکانی، پرۆسەی فەتح کردنی چەند جارێك دووبارە بۆتەوە[٤]، هەرێمەکەش بەگشتی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب، و لەسەر دەستی سەرکردە (حذيفة بن اليمان)[٥] سەرەتا دەستپێکراوە، بەلاّم لەسەردەمی عوسمان لە ساڵی (٢٥ك/٦٤٥ز) بەسەرکردایەتی (وليد بن عقبة)[٦] دووبارە فەتحی کراوەتەوە، دوای ئەوەی رووبەڕووی دەسەلاّتدارانی ناوچەکە بۆتەوە پاشان لەسەر هەمان شێوەی رێکەوتنی یەکەم کەئەویش دانانی برێك لەسەرانەیە بۆسەر ئەوکەسانەی کەلەسەر بیروباوەری خۆیان مابونەتەوە[٧]. هەروەها لەکاتی درێژە پێدان و فەتح کردنی شارەکانی هەرێمی جەزیرە، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب[٨]هەندێ لە شارەکانی هەرێمی

---

(١) – خليفة ابن خياط، المصدر السابق، ص ٧٧.
(٢) - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٣٨.
(٣) - المصدر نفسه، مج ٥، ص ٣٩.
(٤) - المصدر نفسه مج١، ص ١٤٥
(٥) - بروانه: الشعراني، المصدر السابق، ص ٤٠
(٦) - بڕوانه: الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٣، ص ٦٦٣
(٧) - معجم البلدان، مج١، ص١٢٩.
(٨) - المصدر نفسه، مج١، ص ص ٣١٤-٣٢٩

ئاران و ئەرمینیا فەتح کراون، بەڵام ناوچەکانی تر لەسەردەمی خەلیفە عوسماندا جارێك (حەبیب بن مسلمە الفهری)[١] و لە هەندێ شاردا[٢] (سلمان بن ربیعەالباهلی)[٣] بەرەی جەنگیان گرتووە[٤].

بەڵام سەبارەت بەئەرمینیا بەگشتی تێروانینەکانی یاقوت بۆفەتحکردن زانیاریەکانی (البلاذری)یە . وەبەراوردی نەکردووە لەگەڵ سەرچاوەی تر، چونکە (طبری) (م: ٣١٠ك/٩٢٢ز) لەگێرانەوەی ڕووداوەکانی (١٩ك/٦٤٠ز) دەڵێت :((عەیاز فەرمانی بە عوسمان کوری عاس کردووە بۆ ئەرمینیا بچێت، کە لە ئەنجام دا شەر ڕووی داوە، سەفوان کوری موعەتەل شەهیدکراوە، لەپاشان عوسمان بەدانانی برێك لەسەرانە لەگەڵیان ڕێك کەوتووە، کەرێژەکەی یەك دینار بووە)[٥].

بۆیە لێرەدا سەرنجی ئەوە دەدەم کتێبی (معجم البلدان) بەسەرچاوەیەکی سەرەکی دانانرێت بۆ لێکۆلینەوە لەمەر فەتحکردنی ناوچە کوردنشینەکان، چونکە کورتبری و تێکەلاوی لە گواستنەوەی زانیاریەکانی بۆ ئەم بابەتە بەدی دەکرێت، وەکو شتێکی لاوەکی باسی فتوحاتی تێدا کراوە.

## دووەم// ئەمیر و سەرکردە کوردیەکان:

### أ- ال مروان (میرە مەڕوانییەکان):

یاقوت دەسەڵاتی مەڕوانیەکانی بە (ال مروان)ی مەلیکەکان دیاریەکر ناو دەبا[٦].

مەبەستی میرەکانی (میرنشینی مەڕوانی)ە لە ساڵی (٣٧٢-٤٧٨ك/٩٨٢-

---

[١] - بڕوانە: الصفدي، المصدر السابق، ج١١، ص ص ٢٢٢- ٢٢٣

[٢] - معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٤؛ مج٢ ص ٣٦، ص ٤٣٩؛ ج ٥، ص ص ٢٨٦-٢٨٧.

[٣] - بڕوانە: الصفدي، المصدر السابق، ، ص ص ١٩٣-١٩٤

[٤] - معجم البلدان، مج١، ص ٣٠٥، ص ٣٨٠، ص ٥٣٣.

[٥] - تاريخ الرسول والملوك، (د/م:١٩٦٧)، ج٤، ص١٩٧.

[٦] - معجم البلدان، مج ٥، ص ٢٠٢

**١٠٨٥ز) لە دیاربەکر لەگەڵ بەشێك لە ئەرمینیا[1] سەریان هەڵدا، دامەزرێنەری میرنشینەکەش بۆ میر (بادی کوردی) دەگەڕێتەوە[2].**

**ناوبراو ناوی یەکێك لەوەزیرەکانی ئەم دەوڵەتە، کە(ابونصر المنازی)[3] یە، دەهێنێت، بنەچەی بۆ شاری مەنازجرد دەگەڕێنێتەوە، کەواتە یاقوت دەبێت زانیاری دەربارەی ئەم دەوڵەتە هەبووبێت، بەلاّم مێژووەکەی کەباس نەکردووە، ڕەنگە لەبەرئەوەبێت سەرچاوەکەی خۆی بە ولاّتناسی داناوە، لەسەر تێبینیی و تێروانینی ولاّتناسانی بەرلەخۆی ڕۆیشتووە، ئەوانیش زیاتر بەلای وەسف کردنەوە ڕۆیشتوون، جگە لەوەی ئەم میرنشینە خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژن و دەسەلاّتیان فراوان بووەو چەندین میری لێهەڵکەوتووە، بۆیەش نەیویستووە بچێتە ناو ئەم باسەوە چونکە دەبوایە هەندێ لایەن فەراموش بکات بۆئەوەی تایبەتمەندی لە میتۆدی داڕشتنی بابەتەکانی گشتی کتێبەکەی لەدەست نەدا.**

---

[1] - گرنگترین شارەکانیشی بریتین لە دیاربەکر و جەزیرەی فوراتی شارەکانی ئامەد و مەیافارقین و ماردین و جەزیرەی ئیبن عومەر و نەسێبین و بەلەد و باکووری موسل و لەگەڵ ئەرجیش و ئەرزەن و خیلات و بەدلیس لە ئەرمینیا. بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت بەم دەوڵەتە بڕوانە: الفارقي، المصدر السابق ؛ عبد الرقيب يوسف، المرجع السابق، ج١-ج٢.

[2] - میربادی کوردی: ناوی ئەبوعەبدولاّی حوسێنی کوڕی دۆستەك، ڕەچەلەکی بۆ هۆزی حاربوختی یا حەمیدی کوردی دەگەڕێتەوە، لە دیاربەکر سەری هەڵداوە. الفارقی، الصدر السابق، ص٤٩؛ ابن الاثیر، الكامل في التاریخ ج ٧، ص ٤٠٢.

[3] - ناوی (ابونصراحمد بن یوسف المنازی) یەکێك بووە لەوەزیرەکانی دەوڵەتی مەروانی هەروەها بەدوای زانستیش گەڕاوە و بەدوای کتێب چۆتە قوستەنتنیە. الفارقی، المصدر السابق، ص١٣١، ابن خلكان، المصدر السابق، مج١، ص ص١٤٣-١٤٥.

### ب- بەدر کوڕی حەسەنوەیهی (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٤ز):

ئەم میرە یەکێکە لە میرە بەناوبانگەکانی (میرنشینی حەسەنەوەیهی)[1]، کە دوای باوکی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەشێوەیەك توانیویەتی بارودۆخی ناوخۆیی و پەیوەندییە سیاسییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی تر بە هاوسەنگ ڕابگرێت و حوکمرانی ناوچەیەکی فراوانی کردووە[2] .

یاقوت دووجار ناوی ئەو میرە دێنێت، بەمیرێکی کوردی خاوەنی سابورخواست و قەڵای دزیزو سەرماج ناوی بردووە[3]. بەڵام ئەوەی تێبینی دەکەین، بەر لەو میرە ئەم ناوچانە کوردی بوونە، تەنانەت قەڵای سەرماج پێگەیەکی گرینگی باوکی بووە، کە میر حەسنەوەیهی کوردی (٣٥٠-٣٦٩ك/٩٦١/٩٧٩ز) هەر لەم قەلایەش کۆچی دوای کردووە[4]. بەڵام وای بۆدەچم لەبەر ئەوەی ئەم ناوچەوقەڵایانە خۆی لەبنەڕەتدا کوردی بوون، ناوبراویش بۆوەسفکردنیان ویستویەتی گرینگترین دەسەلاتیان لێ بەدیار بخات.

---

(١) - میرنشینی حەسنەوەیهی یەکێکە لەمیرنشینە بەناوبانگەکان، کە لەنیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زایینیدا لە هەرێمی چیادا سەری هەڵداوە و لە شارەکانی دینەوەر و هەمەدان و شەهرەزوور و نەهاوەند و سابور خواست و ئەسەد ئاباد و ناوچەکانی تر حوکمیان گێڕاوە. ابن الاثیر، الکامل في التاریخ، ج ٧، ص ٣٧٠. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: النقشبندي، الدینور و شهرزور، ص ص ١٢٦، ١٣٠.

(٢) - مسکویه، المصدر السابق، ج٢، ص٤١٧؛ ابن الجوزی، المصدر السابق، ج١٥، ص ١٠٤ ؛ابن الاثیر، الکامل ج ٧، ص ٣٧١.

(٣) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٤٥٤، مج٣، ص. ٢١٥

(٤)- ابن خلدون، تاریخ ابن خلدون، ج٤، ص٦٨٨. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:فرست مرعی اسماعیل، الامارات الکردیة فی العصر العباسی الثانی، (٣٥٠-٥١١هـ/٩٦٠-١١١٧م)، (اربیل:٢٠٠٥)، ص ص١٣٣-٢١٩.

جـ- سەرخاب کوڕی بەدر[1]:

یاقوت کاتێ وەسفی قەڵای (خفتیان) دەکات، ناوی ئەم میرەی پێوە لکاندووە[2] کە بەخاوەنی ئەم قەڵایەی داناوە، بەڵام ناوبراو ئاماژە بەوە ناکات، کەمیرێکی کوردی بووەو یەکێکە لە میرەکانی (میرنشینی عەنازی)[3]، کەوا توانیویەتی لە ساڵی (٤٩٥ك-١١٠١ز) ئەم قەڵایە بگەڕێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی[4].

د- ئەبو فەوارس:

مێژوو ناوی زۆر لەجوامێروسەرکردەمان پێدەناسێنێت، جاچ سەرکردەی هۆزێکبن یاخود گەلێك، یاقوتیش ئەم ئەرکەی مێژوو دەخاتە ئەستۆی خۆی، ناوی ئەبوفەوارس دەهێنێت، بەمیری هۆزی قەیوری کوردی دادەنێت[5]. کە خاوەنی قەڵای (قەیور) بووە لە شاری سەعرد تا کاتی هێرشی تەتەر و مەغۆلەکان .

بەڵام ئەم ناوەی کە ناوبراو ئاماژەی پێکردووە، کە بۆ میرەکانی ئەم هۆزە زۆربەیان بەم ناوە ناسراون، بۆیە ناتوانین دەستنیشانی ئەومیرە بەشێوەیەکی تەواو

---

(١) - سەرخابی کوڕی بەدر کوڕی موهەلهەل نازناوی ئەبو فەوراسە بەناوبانگە بە (ابن ابی شوك الكردي) لە ساڵی (٥٠٠ك- ١١٠٦ ز) مردووە. ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج ٨، ص ٥٤٧. بۆچالاکیە سیاسیەکانی بڕوانە:فرست مرعی اسماعیل، المرجع السابق، ص ص٤١٧-٤٢٠.

(٢) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٨٠.

(٣) - میرنشینی عەنازی، ئەم میرنشینە کوردیە بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زاینیدا لە ناوچەکانی سنووری نێوان عێراق و ئێران و ناوچەکانی ڕێگای خوراسان لەم سەردەمەدا سەری هەڵدا، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : النقشبندي، الدينور و شهرزور، ص ص ١٥٩-١٩٨

(٤) - ابن الاثير، الكامل، ج ٨، ص ٤٧٦؛ شەرەفخانی بەدلیسی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٩؛ محمدامين زكي، المرجع السابق، ج١، ص ٢٢٨.

(٥) - معجم البلدان، مج ٤، ص ٤٢٤.

**ورد بکەین[١]، شایەنی باسە زۆربەی حوکمڕانانی ئەم هۆزە لەسەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیدا ڕۆڵی چالاکیان لە وڵاتی شامدا، بەتایبەتی لە ڕووی بیناسازییەوە، کارەکانیان دیارەو، تەنانەت مزگەوتێك بەناوی قەیوری، بووە[٢].**

**هـ- دەرباسی کوردی[٣]:**

**یەکێکە لەو میرە کوردیانەی کە لەسەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبیدا بەشداری لە چالاکییە سیاسییەکانی میسر کردووە[٤]، بەڵام یاقوت تیشك دەخاتە سەر ئەو ڕۆڵە بیناسازییەی کە هەستاوە بە بنیاتنانەوەی گوندێك لە شاری (صعیدی سەروو)[٥] لەناوچەی (قوص)[٦] ناوەکەشی گوندی (تود) بووە[٧].**

**و-ئەمیری کوردی(ابن الحجر الکردی)و قەرمەتیەکان (القرامگە):**

**قەرمتیەکان کۆمەڵەیەك بوون بیروباوەڕی تایبەت بەخۆیان هەبوو، کەجیابوو لەگەڵ باوەڕی ئیسلام، ئەوان پێیان وابوو کەدەبێ لەدوای کۆچی پێغەمبەر** (صلی

---

(١) - یەکێك لەو میرانە ( ابوحسن یوسف بن الفوارس بن موسك) ناسراو بە( سیف الدین القیمری) سەرپەرشتی ئەو هۆزەی کردووەو لەساڵی(٦٥٤ك/١٢٥٦ز) کۆچی دوای کردووە. الیونینی، ذیل مراة الزمان، نشرة ضمن کتاب تاریخ دمشق، ج٢، ص٨٦٠ .

(٢) - ابن شداد، المصدر السابق، ق١، ج١، ص٢١٢ .بۆزیاتر زانیاری بروانە: قادر محمد حسن، اسهامات الکرد، ص ٦٥-٧٨

(٣) - ناوی (صدر الدین عبد الملك بن عیسی بن درباس بن ثیربن جهم بن عبدس المارانی) لەشاری موسل ساڵی(٥١٦ك/١١٢٢ز) لەدایك بووە. ابن المستوفی الاربلی، المصدر السابق، ق٢، ص٣٧٠.

(٤) - دەرباسی کوردی: لە ساڵی (٥٦٤:/ ١١٦٤ز) سەلاحەدین ئەیوبی دەیکاتە قازی لە میسر. المقریزي، المواعظ و الاعتبار باذکر الخطط و الاثار، تحقیق: خلیل منصور، (بیروت: ١٩٩٨)، ج٤، ص٥٥، ص١٦٦.

(٥) - صعیدی سەروو: بەشێکە لە هەرێمی فراوانی صعیدی وڵاتی میسر کە سەرەتای سنوورەکەی شاری ئەسوانە و کۆتاییەکەشی نزیکە لە ئیخمیم. معجم البلدان، مج ٣، ص ٤٠٨.

(٦) -قوص: شارێکی گەورەی پایتەختی سەعیدی وڵاتی میسرە. معجم البلدان، مج٤، ص ص ٤٦-٤٧.

(٧) - المصدر نفسه، مج ٤، ص ص ٤٦-٤٧.

الله علیه وسلم) وە جێنشینی هەبێ، یەکەم کەسیش عەلی کوری ئەبی تالـب بـێ تادەگاتە نەوەکەی محەمەدی کوری اسماعیل تائەو ڕۆژەی کەس لەسەر زەوی نامێنێ "مردیە و دەمێنێ هەتا ئەو ڕۆژەی مردن نامێنێ" [1]. لێکۆڵەرەوان ناوەکەی بۆ وشەیەکی ئارامی بەمانای (زانستی نهێنی) دەگەڕێننەوە[2].

لێرەدا ئەوەی پێویستە لەسەری بوەستین، یاقوتە، کەچۆن باس، لەئەمیری کـوردی (ابن الحجر الکردی بن المومل بن المصبح:٢٥٠-٢٩٠ك/٨٦٤-٩٠٢ز)[3] دەکات، کە لەلایەن خەلیفـەی عەباسـی دەکرێـت بـەوالی شـاری (ئافامیـە/ فامیـە)[4] بۆماوەی چل ساڵ حوکمی ئەم شارە دەکات، بەلام (قرمطي)[5] دەرکـەوتووە لـە ولاتی شام (٢٩٠ك/ ٩٠٢ز) ئەمیرە کوردییەکە مەیلی بەلای قەرمەتە چـووە و بەشداری و پاڵپشتی جـەنگی لەگەڵـدا کـردووە، بەتایبـەتی لـەکاتی ڕووبـەڕوو بوونەوەی لەگەڵ خەلکی(معرە) دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆریـان لێـدەکوژن . بەلام سەرکردەی کۆمەلەی ناوبراو کوژراوە، ئـیبن حەجـەریش هـەلاتووەو دواتـر مردووە[6].

یاقوت هۆکاری ئەو پاڵپشتی کردنەی لەنێوان کوردو قەرمەتیەکان بەدیار ناخات، تەنیا (ابن الجوزی) سەبارەت بەوانەی پاڵپشتی ئـەم کۆمەلەسیاسـی وفکرییـەیان کردووە، کەسانی خۆش باوەڕ و دووربین نەبووینە، تەنانەت بە ناوشیار لە قەڵەمی

---

(١) -الاشعري، کتاب المقالات الاسلامین و اختلاف المصلین، عـني بتصـححه: هلمـوت ریتر، (د/ت: ١٩٨٢)، ص ٢٥.

(٢) -سهیل زکار، اخبار القرامطه، (د/ت: ١٩٨٢)، ص ٢٥.

(٣) - سەرچاوەکانی بەردەست باس لە ژیانی ناکەن.

(٤) - ئافامیە: شارێکە لە کەنارەکانی ولاتی شام لە کورەی حمص. معجم البلدان ج١، ص ٢٢٧.

(٥) - قرمطي: ناوی (ابن زکرویە) ناسراو بە (صاحب الشامە) .سمیر سرحان، محمد عناني، المختار مـن تاریخ الطبري، (قصة القرامطة)، ( القاهرة ١٩٩٩)، ص ٦٢.

(٦) - معحم البلدان، مج ٤، ص ٢٣٤.

داون، نمونەش بە و خەڵکی (اهل سواد) کوردەکـان دێنێتـەوە[1]. بـەڵام وەکـو دەرئەنجامێك بۆ زانیاری کتێبی (معجم البلدان) لەم خاڵانە کۆمان کردۆتەوە:

یەکەم: ناوهێنانی سەرکردەیەکی کـوردی، کـەخاوەنی ئازایـەتی و یەکلاکردنـەوەی رۆڵەکەی، دەرئەنجامێکی گرینگە بۆ بەپێرەوەچونی مێژووی بنەماڵەیەکی کوردی، کە ئایا لەدوای ئەم میرە لەم ناوچەیە کوردەکان چۆن ژیاون و ئەندامی بنەماڵەکە درێژەیان بەخەباتی ناوچەکەداوە؟

دووەم: بەدیارخستنی بارودۆخی سەرکردە کوردیـەکان لەسـەدەی سـێیەمی کۆچـی وئۆیەمی زاینی بەجۆرێك وەرگرتنی پلەی ئیداری لەلایەن خەلیفـە، بـەڵام دواتـر رووبەرووی خەلیفە دەبێتەوەو پالپشتی لەدژە دەسەلاتی خەلیفە دەکات .

## سێیەم/ حکومڕانانی ناوچە کوردنشینەکان لەسەردەمی یاقوت:

ئەو بارودۆخە سیاسیەی کە جیهانی ئیسلامی هەر لەسـەدەی چـوارەمی کۆچـییەوە دەیەمی زاینی تووشی بوو، کە لە دوای نەمانی پلەوپایەی خەلیفەی عەباسییەوە دەستی پێکرد، لەئەنجامی کێبرکێ هێزە دەسەلاتدارە داگیرکەرەکان بۆ سەر حوکم بەردەوام بوو، تا لەسەردەمی پێنجەمی کۆچی یازدەی زاییندا کە سەلجوقیەکان بەدیار کەوتن .ئەو سیستەمەی کەمیرە سەرکردە سەلجوقییەکان پەیڕەویان دەکـرد، ئـەمیش بـە بەخشـینی ئیمتیازاتی بەمیرو سەرکردە سوپاییەکان کە لە ئەنجامدا دەسەڵاتی خۆجێی (ئەتابەك) و تەنانەت دەوڵەتیشی لێکـەوتووە. کاریگـەری راسـتەوخۆی لەسـەر ناوچـە کوردیـەکان هەبوو[2]. تا هاتنی مەغۆلەکان لە (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) کە گۆڕانکاری بەسەر رەوتی ژیانی

---

(١) - ابن الجوزي، المصدر السابق، ج ١٢، ص ٢٨٩.

(٢) - بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئەم بارودۆخە وکورد بەتایبـەتی بڕوانـە : نیشـتمان بەشـیر محەمـەد، کوردو سەلجوقی، ص ص٣٠٣-٣١٨.

کورد داهات، وه‌له‌ده‌رئه‌نجامدا خه‌لافه‌تی عه‌باسی کۆتایی پێهات [(١)]، یاقوتیش ئاماژه به گۆڕانکاری و بارودۆخی کوردنشینه‌کان ده‌کات، ئه‌ویش له‌حوکمڕانانی ناوچه‌کان به دیارده‌که‌وێ.

## ا-ئه‌تابه‌کیه‌کان:

### أ- ئه‌تابه‌کی زه‌نگی:

له شاری موسل سه‌ری هه‌ڵداوه دامه‌زرێنه‌ره‌که‌شی عیماده‌دین زه‌نگی (٥٢١-٥٧٧ك/ ١١٢٧-١١٨١ز) بووه[(٢)]، له (معجم البلدان) دا به‌ده‌رده‌که‌وێ، که‌هه‌ستاوه به بنیاتنانه‌وه‌ی قه‌ڵای ئاشه‌ب[(٣)]، ئه‌گه‌رچی ده‌سه‌ڵاتی ئه‌م که‌سایه‌تییه به‌ر له‌سه‌رده‌می یاقوته، به‌ڵام میره‌کان دوای زه‌نگی هاوچه‌رخی یاقوت بوون، که هه‌ر له‌سه‌ره‌تای دروستبوونی ئه‌تابه‌کی زه‌نگی ناوچه‌کانی باکووری موسل و قه‌ڵاکانی، خستۆته ژێر ده‌سه‌ڵاتی خۆی[(٤)]، ئه‌میش بۆ پاراستنی سنووره‌که‌ی و فراوانکردنی ده‌سه‌ڵاته‌که‌ی له‌سه‌ر حسێبی ناوچه کوردییه‌کان[(٥)]، هه‌ربۆیه‌ش لێکۆڵه‌ره‌وان دروستبوونی ئه‌م ئه‌تابه‌کیه به یه‌کێك له خاڵه‌کانی له‌ناوچوونی ده‌سه‌ڵاتی کوردی ئه‌و کات داده‌نێن[(٦)]. شاری موسل کاتێ له ژێر فه‌رمانڕه‌وایی ئه‌تابه‌ك (عزالدین بن مسعود بن مـودود بن قطب الدین زنكی)[(٧)] بووه، وه‌کو له باسی ناوچه‌ی ته‌رجه‌له ده‌رده‌که‌وێت [(٨)]، ئه‌و ناکۆکییه به‌دیار

---

(١) - بڕوانه: عبدالله علیاویی، کردستان فی عهد المغول، ( السلیمانیة:٥ ٢٠٠).

(٢) ابن العبري، تاریخ مختصر الدول، ص ١٧٦

(٣) - معجم البلدان مج ١، ص ٥٤.

(٤) - ابن الاثیر، تاریخ الباهر، ص ٣٦، ص ٥٧، ص ٦٨.

(٥) - محمد فتحي الشاعر، الأکراد في عهد عمادالدین زنکي، (د/ ت: ١٩٩١)، ص ٤٢.

(٦) - نیشتمان به‌شیرمحه‌مه‌د، کورد و سه‌لجوقی، ل ٣٩١.

(٧) - عزالدین له دوای مردنی براکه‌ی له ساڵی (٥٧٠ ك/١١٧٤ز) ده‌سه‌ڵاتی ئه‌تابه‌کیه‌که وه‌رده‌گرێت تاکو (٥٨٧ ك/١١٩١ز) مردووه. ابن خلکان، المصدر السابق، مج ٥، ص ص ٢٠٣- ٢٠٧.

(٨) - گوندێکی ناسراوه له نێوان هه‌ولێرو موسل. معجم البلدان، مج ٢ ص ٢٢.

دەخات كە لەگەڵ ئەتابەكی ئەربل(هەولێر)(زین الدین یوسف بن علی كوچك)[1] كە ڕووبەڕووی یەكتر بوونەتەوە[2]. لەدەرئەنجامی ئەم تیشك خستنە سەرەی ناوبراودەردەكەوێت، كە هەوڵی قۆرخ كردنی دەسەڵاتی كوردی دراوە وەهەروەها ناوچەكەشیان شوێنی ململانێی دەسەڵاتی ناوخۆی ئەتابەكیەكان بووە.

ئەم ئەتابەكیەی موسل(موصل) وای كردووە، كە چەند دەسەڵاتێكی خۆجێی و ئەتابەكیەكی تر دروست بێت لەمانە:

**ب-بەدرەدین لۆلۆ:**

لە دوایین حوكمڕانێتی زەنگییەكاندا مەلیك (قاهیر نورالدین ارسلان شاە) (٦٠٧-٦١٥ ك/ ١٢١٠-١٢١٨ز) بەدرەدین دەسەڵاتی وەرگرت، ئەگەرچی لەكاتێكدا ناوبراو كاروباری ناوچەكانی بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ بەڕێوە دەبرد، تەنانەت چەند جارێك نازناوی ئەمیری نوریەكانی پێ بەخشراوە[3]. بەڵام حوكمی ئیمارەتی موسل(موصل) لە ساڵی (٦١٥ك- ١٢١٨ ز)، بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ و ڕەسمی بە پاڵپشتی خەلیفەی عەباسی دەسەڵاتی وەرگرت[4]. وە ئەوەی یاقوت ئاماژەی پێكردووە، دەسەڵاتەكەی لە قەڵای ئەردومشت بینیوە و ئەوكاتەش یەكێك بووە لە ئەمیرەكانی مەلیك (نورالدین ارسلان شاە بن مسعود بن عزالدین بن قطب الدین زنكی) (٥٨٩-٦٠٧ك/ ١١٩٣-١٢١٠ز) ئەتابەكی موسل بووە[5].بۆیەلەكتێبەكەی یاقوت تەنها وەكوكاریەدەستی زەنكیەكان ناوی هاتووە.

---

[1] - زین الدین یوسف كوڕی عەلی كوچك لە نێوان ساڵانی (٥٧١ك-٥٨٦ك/ ١١٧٦-١١٩٠ز) حوكمی شاری هەولێری كردووە. ابو شامە، الروضتین، ج ٤، ص ص ٩٨-٩٩، ابن خلكان، مج ٥، ص ص ١٠-١١. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محسن محمد حسین، المرجع السابق، ص ٦٨.

[2] - معجم البلدان، مج ٢، ص٢٢

[3] – معجم البلدان، مج ٥، ص ٣٩١

[4] - ابن العبری، تاریخ الزمان، ص ٢٨٠.بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سوادی عبد محمد الروشدي، امارة الموصل في عهد بدرالدین لؤلؤ، (بغداد: ١٩٧٠)، ص ٢٤-٢٩.

[5] -معجم البلدان، مج ١، ص ١٤٦

## جـ- موزەفەرەدین کوکبری

یاقوت کاتێ سەردانی شاری ئیربل کردووە، دەسەڵاتی موزەفەرەدینی بینیوە، کە بە کەسایەتییەکی خاوەن هەیبەت و باڵادەست باسی دەکات، بە جۆرێك توانیویەتی بەرگرییەکی تەواو لە دەسەڵاتی خۆی بکات[1]، ڕەنگە ئەم وەسف کردنەی یاقوت خۆی لەوەوە سەرچاوە گرتبێت کە بەرگری و بەشداری لەگەڵ دەسەڵات و دەوڵەتی هاو زەمانی خۆی کردووە، وەك لە پەیوەندی ئەتابەکی موسل[2] و دەوڵەتی ئەیوبی[3]، دژایەتی کردنی خاچ دروشمان بەدیار دەکەوێت[4].

جگە لەمە ڕۆڵی چالاکی پیشان داوە، لە بنیات نانەوەی شاری ئیربل، کە هەر لە دروستکردنی شارو بازاڕ و قەڵا و قەیسەری و مزگەوت بەدیار دەکەوێت[5]. بەڵام بە کەسێکی زۆردار و زاڵمی داناوە بەرامبەر بە خەڵك، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ موسافیر و هەژاراندا باش بووە، بۆیە ڕەخنەی لێگرتووە، کەوا خێر و شەڕی بەرامبەر یەکتر بووە[6].

لەمیانەی باسەکەی ناوبراو دا دەردەکەوێت، توندو تیژیەکەی بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە، حوکمی شارەکە بەرێك وپێکی ڕابگرێت وسەرپێچی نەبێت، وە مەبەستی لەچاکەکردنەکەشی ئەوە بووە، کە یارمەتی خەلکەکە بدات وهەژاری نەمێنێت، واتا لەهەموو ڕووێکەوە شارە کە چەسپاوبێت.دەتوانین ئەمەش بۆ ئەوەبگەڕێنینەوە کەزۆربەی سەرچاوەکانی تر بەکەسایەتی خاوەن پیاوەتی وگەورەی وبەخشندەی وەسفیان کردووە.[7]

---

[1] - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٣٨.

[2] - ابن الاثیر، الکامل في التاریخ، ج ١٠، ص ٣١٥، ص ٣١٨.

[3] - عمادالدین الاصفهاني، المصدر السابق، ص ٦٦، ص ٢٩٨ ؛ ابن العبري، تاریخ الزمان، ص ٢٠٣.

[4] - ابن خلکان، المصدر السابق، مج ٤، ص ١١٥.

[5] -معجم البلدان، مج ١، ص ١٣٨.

[6] - المصدر نفسه، مج ١، ص ١٣٨.

[7] - بڕوانە: محسن محمدحسین، المرجع السابق، ص ١٨٩، ص ١٩٦.

## د -ئەتابەکی ئەرتەقی(اراطقة)[(١)]:

کاتێ فەرمانڕەوایی ئەرتەقیەکان لە شاری ئامێد لە سالّی (٥٠٢ک/١١٠٨ز) بووەبـە دوویەش بەشێکیان بۆ شاری (حیصن کەیفا) و ئەوی تریان حوکمی شاری ماردینیان گرتە دەست، کە هەر یەکێکیان بەسـەرکردایەتی یـەکێك لـە کوڕەکـانی دامەزرێنـەری ئـەم ئەتابەکییە بووە[(٢)]، یاقوتیش دەسـەلاّتی ئـەم ئەتابەکییـە دیـاری دەکـات، بەتایبـەتی ئەوانەی چوونەتە بەرەی شاری (حیصن کەیفا) ناوی مەلیك ئەحمەدی کوڕی داود

کوڕی سوقمان کوڕی ئەرتەق بووە[(٣)]، لەناوچەی (حیصن تالب) دەسەلاّتی ئەرسەلانی کوڕی داودی کوڕی سوقمان بووە[(٤)]. هەروەها شـاری ئامێـدیش مەملەکـەتی مەسـعود کوڕی محەمەد کـوڕی ئەرسـەلان کـوڕی داود کـوڕی سـوقمان (٦١٨-٦٢٩ک/ ١٢٢٢-١٢٣١ز) بووە[(٥)]. کە دوایین مەلیکی ئەرتەقیەکانە[(٦)].

### ٢- دەوڵەتی ئەییوبی:

زانیارییەکانی ئەم کتێبە، سەبارەت بە دەولـەتی ئـەیوبی لـە چـەند لایـەنێك خـۆی دەنوێنێ، زیاتریش لەباری سیاسی و رامیاری سەردەمی سەلاحەدین ئەیوبی، کـە چـەند زانیاری سەرکردایەتی سوپای و حوکمڕانی سەلاحەدین لە ولاّتی میسر و شام دەخاتەروو:

---

(١) - دامەزرێنەری ئەم ئەتابەکییە بۆ ئەرتەق کوڕی ئەکسبە دەگەڕێتەوە، یەکێك بـووە لـە سـەرکردە سوپایەکانی دەولّەتی سەلجوقی، ڕۆلێکی بەرچـاوی لـە مێژوویانـدا بینیـوە، لـە سـالّی (٤٧٨ک-١٠٨٥ز) کۆچی دوایی کردووە و کوڕەکانی دەسەلاّتی ئەویان گرتۆتـە دەسـت. الماردیني، المصدر السابق، ص ٥٣.بۆ زیاتر زانیاری بروانە:عماد الدین الخلیل، امارة بنی ارتق، (بیروت:١٩٨٠).

(٢) - سیپان حسن علی، المرجع السابق، ص ص ٦٣-٦٤.

(٣) - معجم البلدان، مج ٢، ص ٢٦٥.

(٤) - المصدر نفسه و الصفحه

(٥) - المصدر نفسه، مج ١، ص ٥٧.

(٦) - بۆ زیاتر زانیاری بروانە: سیپان حسن علی، المرجع السابق، ص ص ٥٧-٧٦.

لە ڕوویەڕووبوونەوەی شاڵاوی داگیرکەران بەتایبەتی خاچ دروشمان کە توانیویەتی هێزەکانیان تێك بشکێنێت[١]، ئاماژەشی بە سەرنج و مێژوو کات و ساتی جەنگەکان کردووە[٢].

هەروەها سەلاحەدین ئەیوبی ستایشی هەندێ جێگای کردووە، (جلق) جەلیق یەکێکە لە گوندەکانی دیمەشق لە ڕووی گرنگییەوە لە ریزی وڵاتی میسری داناوە [٣]، جگە لەمە باس لە ئەمیر و سەرکردە و قازی و کەسایەتییەکانی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی ئەیوبی سەردەمی سەلاحەدینی کردووە[٤]، تەنانەت باس لە زانا و ئەدیب و شاعیرەکان دەکات، کە لە خزمەتی ئەودا بوونە [٥]، هەروەها تیشك دەخاتەسەر مەنزڵگای ژیانی[٦] گۆڕەکەی لەشاری دیمەشق[٧]، دواتر درێژە بە ناوهێنان وحوکمڕانانی ئەم دەوڵەتە دەدات، [٨]هاوکاتی سەردەمی یاقوت، مەلیك عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدولمەلیکی زاهیری کوڕی ناسر یوسف کوڕی ئەیوب (٦١٣-٦٣٤ك/١٢١٦-١٢٣٦ز)[٩] کە مەلیکی شاری حەلەب بووە[١٠].

---

(١) - معجم البلدان، مج١، ص ٣٨٣، ص ٣٦٧

(٢) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٢٧٤؛ مج ٣، ص ٤٣٧؛ مج ٤، ص ٣٣، ص ١٢٢، ص ١٤٤، ص ١٧٧، ص ٣٨٩؛ مج ٥، ص ٤٢٦

(٣) — المصدر نفسه، مج ٢، ص ٤٢٤

(٤) — المصدر نفسه، مج١، ص ٥٢٧؛ مج٢، ص١٣٠؛ مج ٤، ص ص ٤٦-٤٧.

(٥) - المصدر نفسه، مج ٣، ص ٣٠٤

(٦) -المصدر نفسه، مج ٣، ص ٣٥٣

(٧) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٤٦٩.

(٨) - المصدر نفسه، مج ٢، ص ٤٢٦.

(٩) - زامباور، معجم االانساب و الاسرات الحاكمه، اخرجه: زكي محمود، حسن احمد، (بيروت: ١٩٨٠)، ص ١٥٦.

(١٠) -معجم البلدان مج ٤، ص ٣١٩

## ٣- خه‌وارزمیه‌كان (٤٧٠- ٦٢٨ك/١١٧٧-١٢٣١ز):

نه‌ژادی خه‌وارزمیه‌كان بۆ (نوشته‌كین) و نه‌وه‌كانی ده‌گه‌ڕێته‌وه، ڕه‌گه‌زێكی تورك ده‌بێت. ناوی ده‌وڵه‌ته‌كه‌شی بۆ ده‌سه‌ڵاتی شوێنه‌كه ده‌گه‌ڕێته‌وه، كه (خه‌وارزم) [١] بووه، له‌سه‌رده‌می ده‌وڵه‌تی سه‌لجوقی خه‌وارزمیه‌كان ده‌سه‌ڵاتداری بوون [٢]، پاشان ده‌سه‌ڵاتێكی سه‌ربه‌خۆیان دروستكردووه، كه ده‌وڵه‌تی لێكه‌وتووه و په‌لیان هاویشتووه بۆ ناوچه‌كانی تر. به‌تایبه‌تی له‌سه‌رده‌می خوارزم شاه (عه‌لائه‌دین كوڕی ئه‌كش) ساڵی (٥٩٦-٦١٧ك/١١٧٣-١٢٢٠ز) توانیویه‌تی ده‌ست به‌سه‌ر ناوچه‌یه‌كی فراوان دابگرێت[٣]، ئه‌مه هه‌ر به‌رده‌وام بووه، تاكو ناوچه كوردنشینه‌كانیشی گرتۆته‌وه، یاقوت ئه‌وه‌مان بۆ ڕوون ده‌كاته‌وه، ده‌سه‌ڵاتی جه‌لاله‌دین مه‌نكبه‌رتی ساڵی (٦١٧-٦٢٨ك/١٢٢٠-١٢٣٠ز) دوایین حوكمڕانی ئه‌م ده‌وڵه‌ته بووه، بۆته ده‌سه‌ڵاتداری ئازه‌ربایجان[٤].

ئه‌م هه‌رێمه‌ش له‌وكاته‌دا زۆرناوچه‌و شاری گرینگ له‌خۆ ده‌گرێت و پێكهاته‌ی دانیشتوانه‌كه‌ی جیاوازبوون، كوردیش یه‌كێكه له‌نیشته‌جێبووانی، له‌ ده‌رئه‌نجامێك بۆیاسه‌كه‌ی یاقوت كوردیش ده‌سه‌ڵاتی ئه‌م میره‌ی قه‌بولكردووه، ڕه‌نگه بۆ هۆكاری بارودۆخی سیاسی ئه‌و كات بگه‌ڕێته‌وه.

---

(١) - خوارزم ولایه‌تێكی فراوانه و ژماره‌یه‌ك شارو شارۆچكه و گوند له خۆ ده‌گرێت. معجم البلدان، مج ٢، ص ٣٩٦.سنوره‌كه‌ی لای ڕۆژئاوای وولاتی توركه‌له‌باشوری خۆراسان وله ڕۆژهه‌لاتی نه‌ودیوروبار(ماوراء النهر). ابو الفداء، المصدر السابق، ص٤٧٦.

(٢) - احمد حمدي، الدوله الخوارزمية و المغول، (د/ت: د/م)، ص ٢٥

(٣) - ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج ١٠، ص ٢٨٧، ص ٢٩٢، ص ٢٩٩

(٤) - معجم البلدان، مج ١ ص ١٢٩.

## ٤- تەتەرەکان[1] و هێرشەکانیان بۆ ناوچە کوردنشینەکان:

بزووتنەوەی مەغۆلەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بەدیار کەوت، دەستیان بەسەرچین و ئاسیای ناوەراست و سامانی خەوارزمیەکان و دەوڵەتی سەلجوقی لە ئاسیای بچوك دا گرت، لە کۆتاییدا هەندێ ئەورووپاشی گرتەوە[2]، لە نێو ئەو هێرش و پەلامارانەشدا کورد و کوردنشینەکان بێبەش نەبوون، جگە لەوەی بۆ فراوانکردنی سنووری دەسەڵاتیان، وەکو سەرە ڕێگایەك بۆ گەیشتن بە ناوچەکانی تر .

ئەگەر سەیری ئەو پەلامار و هێرشانە بکەین، کە چ کاریگەرییەکی زۆری هەبووە، بەسەر ناوچە کوردنشینەکان لە( معجم البلدان) دا، هەندێك ڕوون دەبێتەوە، تەنانەت یەکێك لە هۆکارەکانی لەناوچوونی شارستانییەتی هەندێ جێنشینی کورد بۆ هێرشی تەتەرەکان دەگەڕێنێتەوە، وێرانکارییەکی شارەکانی هەرێمی ئازەربایجان و ئاران لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) دا دەخاتەروو، بەتایبەتی لە ئوشنۆ(شنۆیە) و بەیلەقان و تەبرێز(تەورێز)[3]، کە (ابن الاثیر) لە گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا ڕاستی ئەم بارودۆخەی کە ناوبراو باسی لێوەکردووە، دەچەسپێت[4]، جگە لەمەش ئەم هێرشانە بەسەر کەسایەتی و خودی ژیانی یاقوت کاریگەر بووە[5].

---

[1] - تەتەرەکان: مەغۆلەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەیەمی زاییندا لە جیهانی ئیسلامی بە تەتەر دەناسران، کەچی نەتەوەیەکی جیاواز بوون لە مەغول، تورك نەبوون، پاشان مەغۆلەکان ئەم ناوەیان بۆخۆیان هەڵبژاردووە، سەرەڕای ئەمەش ئەم ناوەیان بەسەر هەموو ئەو نەتەوانەدا سەپاند و لە ژێر حوکمی چەنگیز خاندا بوون، چونکە ئاسیای بچووك لە چەند نەتەوەیەکی جیاجیا پێك هاتبوو. بازنەلعەرینی، مەغۆلەکان، وەرگێرانی شاخەوان محەمەد (هەولێر:٢٠٠١)، ل ل ٣٨-٤٤.

[2] - . بازنەلعەرینی، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤

[3] - معجم البلدان، مج ١، ص ٢٠٧، ص ٥٣٣؛ مج ٢، ص ١٣.

[4] - ابن الاثیر، الکامل في التاریخ، مج ١٠، ص ص ٣٤٥- ٣٥٢.

[5] - بڕوانە بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە.

# دەرئەنجام

دوای لێ وردبونەوە لە کتێبی (معجم البلدان)داو بەراوردکردن لەگەڵ سەرچـاوەکان و تاوتۆکردنی زانیاریەکان، هەروا شیکردنەوەی دەقەکانی تایبەت بە ناوچە کوردنشینەکان، لە سەرژمێری کردنی ئەم فەرهەنگەدا ئەم دەرئەنجامانەمان لا دروست بوو:-

یەکەم: ئەم کتێبە بـە سەرچـاوەیەکی زانسـتی دەوڵەمەنـد دادەنرێـت، لەبەرئـەوەی لایەنـەکانی جـوگرافی و زمانـەوانی و ئـەدەبی و کۆمەڵایـەتی و ڕامیـاری و مێـژوویی لـەخۆ دەگرێـت، وەدەتـوانین وەك کتێبێکـی زانسـتی وڵات ناسـی سـەیریبکەین، چـونکە هـەموو زاسـتەکانی بـەکارهێناوە بـۆ پتـەوکردن و دەوڵەمەندکردنی و هەروەها بەیەك بەستنەوەی زۆر لە زانیاریەکان بۆ زانستی وڵاتناسی.

دووەم: سەرەڕای بەکاهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە سەرچاوە، لەم کتێبە دەگەینـە ئـەو ڕاستیەی کە زۆر بە دروسـتی و پـاکی زانیاریـەکانی گواسـتۆتەوە، تەنانـەت دەقاودەق زانیاریەکان لەم بەرهەمانە بەرچـاو دەکـەون، وەبـۆ هـەر بابـەتێك کۆمەڵێك بۆچوونی جیاواز دەخاتە ڕوو، بەڵام بـە ڕێژەیـەکی کـەم ڕای خـۆی لەسەر دەقەکان بەدیار دەخات یاخود یەکێکیان ناچەسپێنێت.

سێیەم: وێڕای ئەم میتۆدەی بـۆ باسـکردنی ناوچـەکان و شـارو بەتایبـەتی جیهـانی ئیسلامیدا گرتویتە بەر بە کوردنشینەکانیشەوە لـە ڕیـز ئـەم چوارچێوەیەدا گرنگیان پێ دەدات، ئەگینا باسێکی تایبەتی نەکردووە بۆ کورد کـە هـەموو بارودۆخێك باس بکات .

